# قەیرانی شارستانیەتی خۆرئاوا: مۆدێرنە و پۆست مۆدێرنە

## (خوێندنەوەیەك لە فیکری هانز کۆنگ)دا

**هاشم سالح**

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

ڕۆشنبیرانی جیهانی سێهەم کاتێك بۆ یەکەم جار دێنە خۆرئاوا و تێکەڵ بەو کۆمەڵگە مۆدێرن و کلتورە تازەیە دەبن، ئەستەمە بتوانن هەڵوێستێکی ڕەخنەگرانە وەرگرن، لەبەرئەوەی ئەکەونە ژێر سیحر و کاریگەری ئەو شارستانیەتەی، خاوەنی تەکنۆلۆژیایەکی پێشکەوتووەو لەسەر هەموو ئاستەکانیش بۆڕی تەواوی کۆمەڵگاکانی دیکەی دنیای داوەتەوە.

کەواتە ئەو ڕۆشنبیرانە پێویستیان بە ماوەیەکی زۆر مانەوە و تێکەڵاوبوون هەیە لەگەڵ ئەو شارستانیەتەدا، بۆ ئەوەی لە نزیکەوە ئاشنابن پێی و هەڵوێستی ڕاست و دروستی لێوەربگرن. واتە هەر ڕۆشنبیرێکی جیهانی سێیەم پێویستی بە کاتی تەواو هەیە، بۆ ئەوەی کلتوری خۆرئاوا بناسێت و بەو مێژووەش ئاشنابێت کە مۆدێرنەی دروستکرد، بۆ ئەوەی بە تەواوەتی بتوانێت حوکمی بەسەردا بدات. تەنها لەو کاتەشدا هەڵوێستی لە بازنەی کارو کاردانەوە دەربازی دەبێت و پێدەنێتە قۆناغێکی بالاتر: کە قۆناغی ئەقڵ و دانایی و بەراوردکاریە. بەمەش دەتوانێت لە ناو پرۆژەی مۆدێرنەدا ڕاست لە هەڵە و پۆزەتیڤ لە نەگەتیڤ لە یەکتری جیابکاتەوە.

پێویستە پرۆسەیەکی تاوتوێکردنی گونجاو دەست پێبکەین، بۆ ئەوەی بزانین چۆن چۆنی لەگەڵ مۆدێرنەدا هەڵسوکەوت بکەین و چی لێوەردەگرین و چیش فەرامۆش دەکەین، چونکە هەموو شتێکی ڕاست و دروست نییە و هەموو شتێکی بۆ ئێمە و کلتوری ئێمەش گونجاو نییە.

ماوەیەکی زۆرە ڕەخنەگرتن لە مۆدێرنە دەستی پێکردووە و لەم ڕووەوە چەند هەوڵێك جێگای سەرنجم بووە، لەوانە هەوڵی: "میشێل فۆکۆ و یۆرگن هاپرماس و قوتابخانەی فرانکفۆرت و.. هتد".

بەم دواییانەش چاوم بە هەوڵی یەکێك لە تیۆلۆژیست و بیریارەکانی ئەڵەمانیا کەوت بە ناوی "هانز کۆنگ"ەوە، ئەم پیاوە مامۆستایە لە زانکۆی (تۆبنگن)، واتە لە هەمان ئەو زانکۆیەدا کە لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەمدا "هیگڵ و هۆڵدەرلین و شیلینگ" تیایاندا خوێندووە. ئەو سێ بیریارە لەو کۆلیژەدا – کۆلێژی خوداناسی پرۆتستانتی – هاوڕێی یەك بوون. "هانز کۆنگ" بە تەنها تیۆلۆژیست نییە، بەڵکو بیریاریشە، واتە ئاگاداری تەواوی ئەو ئاقارە فەلسەفی و زانستیانەیە کە لە سەدەی شازدەهەمەوە مۆدێرنەیان هێناوەتە ئارا. بێگومان "کۆنگ" زیاد لە هەر مەسەلەیەکی تر گرنگی بە ئایین دەدات و دەیەوێت ئەو ئیعتیبارەی بۆ بگێڕێتەوە کە مۆدێرنە فەرامۆشی کردبوو، بەڵام سەرەڕای ئەوەش هەر بیریارێکە بە ستایلە ئەڵەمانیەکە: واتە بیرکردنەوەی بەشێوەیەکی یۆنیڤێرسالی و هەمەلایەنانەیە.. بە کورتیەکەی ئەو بیریارێکە لە شێوەی "هیگڵ" و بە چارەنوسی تەواوی جیهانەوە سەرقاڵە، نەك تەنها بە چارەنوسی ئەوروپا و خۆرئاواوە.

گرنگی "هانز کۆنگ" و زمان شیرینی ئەو لێرەوە سەرچاوە دەگرێت و کاتێك نوسینەکانی دەخوێنیتەوە هەست دەکەیت خاوەنەکەی ڕێزی سەرجەم کلتور و گەلان و ئایینەکانی دنیا دەگرێت و بەیەك چاو سەیریان دەکات. ئەم هەڵوێستەشی جیاوازە لە هەڵوێستی ئەو لوتبەرزانەی ئیرۆسەنتەریزمانە بیردەکەنەوە و لەوێشەوە بە شێوەیەکی دۆنیانە لە کلتورەکانی تر دەڕوانن.

لەبەرئەوە پێم باش بوو لێرەدا بۆچونەکانی "هانز کۆنگ" بخەمە ڕوو، تا خوێنەرانی ئێمە ئاشنابن پێی و لە ڕێی ئەویشەوە شارەزای کەموکوڕییەکانی مۆدێرنە بن و بزانن چۆن چۆنی ئەو پرۆسەیە بە قۆناغی پۆست مۆدێرنە گەیشتووە.

ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێ کە من سەرلەبەر تەبەنی بیر و بۆچوونەکانی "هانز کۆنگ" دەکەم، چونکە ڕەنگە تا ئێستا و سەرەڕای هەوڵی زۆریشی بۆ نوێکردنەوە، بەڵام هەر تێڕوانینێکی تەقلیدیانەی بۆ ئایین هەبێت. سەرباری ئەمانەش، بەڵام تیۆریاکەی ئەو دەهێنێت گرنگی پێ بدرێت، لەبەرئەوەی لە پیاوێکی ئایینیەوە دێت کە دەیەوێت پەیوەندی لەگەڵ زانستی نوێدا بەردەوام بێت و هەماهەنگییەك لەگەڵ مۆدێرنەدا دروست بکات، تا ئەو ئاستەی بیروباوەڕی ئایینەکەی ڕێگای پێدەدات. هەروەها گرنگیەکی دیکەشی لەوەدایە کە پێویستە لەسەر ئەم مەسەلانە گوێبیستی تیۆلۆژیستەکانیش بین و تەنها مافی قسەکردن، بە فەیلەسوفە ماتریالیستەکانی وەك: "هاپرماس و ئالان تۆرین و فۆکۆ و.. هتد" ڕەوا نەبینین.

پێناسەکردنی مۆدێرنە.. "هانز کۆنگ" پێی وایە تێرمی *Moderne* کۆنە، بەڵام بە مانا ئیجابیەکەی تەنها لە سەرەتاکانی سەردەمی ڕۆشنگەریدا نەبێت بەکارنەهێنراوە. لەو قۆناغەدا وەکو ناڕەزاییەك دژ بە تێڕوانینی بازنەیی بۆ مێژوو بەکارهێنرا، ئەم تێڕوانینە بەشێوەیەکی بازنەیی سەیری سەردەمانی یۆنانی و ڕۆمانی کۆنی دەکرد و پێی وابوو کە ئەوانە ترۆپکی شارستانیەتن، وەکو ئاشکراشە ئەمە تێڕوانینی سەردەمی ڕێنیسانسیش بوو.

*Re-naissance* کە لە زمانە بیانیەکاندا بە مانای سە لەنویێ ژیانەوە دیێت، بۆ دواوەی دەڕوانێ نەك بۆ پێشەوە.

نمونەی بەرز و باڵای ڕێنیسانس شارستانیەتی گریك و ڕۆمانی بوو، بۆیە دەیویست سەرلەنوێ میراتی و کەلەپووری ئەوان زیندوو بکاتەوە. کەواتە ڕێنیسانس تێرمی مۆدێرنەی دانەهێناوە و بەکاری نەبردووە. ئەوەی تێرمی مۆدێرنەی بەکارهێناو ڕەواجی بۆ پەیدا کرد سەدەی حەڤدەهەمی فەرەنسا بوو، چونکە تەنها ئەم سەدەیە هەستی بە سەرکەوتن و باڵادەستی بەسەر یۆنان و ڕۆمانەکاندا کرد، ئەمەش دوای ئەو سەرکەوتنانەی زانست و فەلسەفەی نوێ لە ڕێی "کۆپەرنیکۆس و گالیلۆ و دیکارت"ەوە بەدەستیان هێنا. بەمجۆرە ململانێی نێوان کۆن و نوێ لەو کۆبوونەوە بەناوبانگەدا دەستی پێکرد کە ئەکادیمیای فەرەنسی لە ساڵی 1687 سازیدابوو.

ئەم ململانێیەش بیست ساڵێکی خایاند! بەڵام ئەمڕۆ تێرمی مۆدێرن و مۆدێرنەش خەریکن کۆن دەبن، لەبەرئەوەی بەرەبەرە خەریکە تێرمی پۆست مۆدێرنە جێگای دەگرێتەوە، هەرچەندە ئەم تێرمە تا ئێستاش بە وردی دەستنیشان نەکراوە، وەکو لە دواتردا باسی لێدەکەین.

چەمکی *Modernite* تەنها لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە و بەتایبەتیش لە ساڵی 1849دا فۆرمەلە بوو، مەزەندەی ئەوەش دەکرێت کە "بۆدلێر"ی شاعیر یەکەمین کەس بوو بێت بەکاری هێنابێت، بەڵام لەو کاتەدا خەڵکی بە شتێکی دزێو و ناشیرینیان دەزانی.

هەرچی ئایدیای پێشکەوتنیشە، ئەوا بە یەکێك لە ئایدیا عەلمانییە تایبەتەکانی سەردەمی نوێ دادەنرێت و لەگەڵ دەرکەوتنی مۆدێرنەدا دەستی بە بڵاوبوونەوە کرد و بوو بە نموونەی باڵای سەرجەم مێژوو لە سەدەی هەژدەهەمدا کە سەدەی ڕۆشنگەریە. بڕواهێنان بە پێشکەوتن لە سەدەی نۆزدەهەمدا کە سەدەی گەشەکردنی زانست و پیشەسازی و تەکنۆلۆژیایە، گەیشتە ئەوپەڕی. بڕوابوون بە پێشکەوتن جێگای ئایینی مەسییحی گرتەوە و بەلای بیریارانی لیبرالی و سوسیالیستیەوە بوو بە ئایینێکی نوێ. تا وای لێهات تەواوی خەڵکانی ئەوروپا پشتیان بە زانست و پێشکەوتنی زانستی دەبەست بۆ چارەسەرکردنی کێشە مرۆڤایەتیەکان، بەڵام ئەم ئیمانە شێوە ئایینیە بە پێشکەوتنی زانستی لە دوو سەدە زیاتری نەخایاند و لەگەڵ هەڵایسانی یەکەم جەنگی جیهانیدا گورزێکی کوشندەی بەرکەوت و دووەم گورزیشی لەگەڵ جەنگی دووەمی جیهانیدا خوارد. لەبەرئەوە "هانز کۆنگ" مێژووی پاش مۆدێرنە لە ساڵی 1918 (واتە مێژووی کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانی) دەنوسێتەوە. ئەو پێی وایە مۆدێرنە لەو کاتەوە کۆتایی هاتووە و بێئەوەی بە خۆمان بزانین پێمان ناوەتە سەردەمی پۆست مۆدێرنەوە (لێرەدا مەبەستی لە شارستانیەتی خۆرئاوایە).

زۆرر کەس پێیان سەیربوو کە چۆن نەتەوەگەلێکی شارستانی وەك ئەوروپاییەکان، بەو دڕندەییە چون بەگژ یەکتریدا و کەوتنە وێرانکردنی یەکتری. لێرەوە و بۆ یەکەمجار خەڵکی کەوتنە سەرکۆنەکردنی چەمکی مۆدێرنە و پێشکەوتن و گومان دەربڕین بەرامبەری، چونکە پێشبینی ئەوە دەکرا لەگەڵ تەشەنەسەندنی ڕۆشنگەری فیکری و کۆتایهاتنی ڕۆژگاری بەربەریەت و دڕندایەتی سەدەکانی ناوەڕاست، شەڕ و کوشتار نەمێنێت، بەڵام وا دەرنەچوو. خەسڵەتی دیاری سەردەمی مۆدێرنە، بریتی بوو لە: (باڵادەستی ئەقڵ بەسەر

ئیمان و فەلسەفە بەسەر تیۆلۆژیا و عەلمانییەت بەسەر كڵێسادا)، بەمجۆرە ئایین لە ژیانی گشتیدا كاڵ بووە و تەنها بوو بە مەسەلەیەكی شەخسی و تایبەت. لەبەرئەوەی كڵێسای مەسیحی هەڵوێستێكی كۆنەپارێزو دواكەوتوانەی لە بیروباوەڕی مۆدێرنە و پێشكەوتن وەرگرتبوو، بۆیە كەوتە بەر شاڵاوێكی توند و زەبری كوشندەی بەركەوت.

"هانز كۆنگ" دان بەوەدا دەنێت كە كاردانەوەی سەردەمی ڕۆشنگەری لە بەرامبەر دەمارگیری مەسیحی، كارێكی پێویست و ڕەوا بوو. هەر ئەمەش تیۆلۆژیستە مەسیحیەكانی ناچار كرد دەست بە نوێكردنەوەی كەلەپور و ئایینەكەیان بكەن و تیۆلۆژیایەكی لیبراڵی بهێننە ئارا كە لەگەڵ سەردەمی زانست و پێشكەوتندا بگونجێت، گەر ئەمە نەبوایە ئەوروپا تا ئێستاش گیرۆدەی دەستی تیۆلۆژیایەكی تەقلیدی سەدەكانی ناوەڕاست دەبوو. بەڵام كێشە و گرفتی مۆدێرنە لەوەدایە كە بەجۆرێك كەوتە دژایەتیكردنی فێندەمێنتالیزمی مەسیحی و دەمارگیری ئایینی، هێندەی نەمابوو خودی ئایین خۆیشی پاكتاوبكات!

كەموكوڕی گەورەی مۆدێرنەش سەرەڕای دەسكەوتە زۆر و زەوەندەكانی، لێرەدایە. هەر بۆیە زۆر لە كۆمەڵگە ئەوروپییە پێشكەوتووەكان كەوتنەخۆ، بۆ دەسكاریكردنی ئەو مەسەلەیە و گۆڕینی هەڵوێستی خۆیان بەرامبەر بە ئایینی مەسیحی.

شایەنی باسە زۆربەی ڕۆشنبیران پێیان وابوو، كێشەی ئایین لە سەردەمی مۆدێرنە و ڕۆشنگەریدا یەكلایكراوەتەوە. كورتبینی مۆدێرنەش لێرەدایە. لەگەڵ پایانی قۆناغی مۆدێرنەدا سەرەتای قۆناغێكی تازەتر دەست پێدەكات: ئەویش قۆناغی پۆست مۆدێرنەیە.

چۆن بتوانین لە تێرمی پۆست مۆدێرنە بگەین و چۆنچۆنیش دەكرێت بە وردی دەستنیشانی بكەین، لە كاتێكدا كە تائێستاش چەمكێكی ئاڵۆز و نادیارە؟

دەتوانین بڵێین چەمكی پۆست مۆدێرن لەسەردەستی فەیلەسوفی فەرەنسی "ژان فرانسوا لیوتارد" هاتە ئارا، كاتێك لە ساڵی 1979 كتێبی (هەلومەرجی پۆست مۆدێرن)ی نوسی. بەڵام "هانز كۆنگ" پێی وایە قۆناغی پۆست مۆدێرن زۆر پێش ئەو ماوەیە دەكەوێت و لە ساڵی 1918 دەست پێدەكات، واتە ڕاستەوخۆ پاش كۆتایی هاتنی جەنگی جیهانی یەكەم.

"كۆنگ" چەمكی پۆست مۆدێرن بە مەبەستی وێرانكردنی مۆدێرنە بەكارناهێنێت، تاوەكو موحافیزكارە نوێیەكان و نیهلیستیەكان بڵێت: (مۆدێرنە سەرلەبەری نەهامەتی و وێرانەبوو).

موحافیزكارەكانی وەك كاردینالڵ "ڕاتزنجیر" كە بەرپرسی كاروباری ئیمانداریە لە ڤاتیكان، ستایشی پۆست مۆدێرنە دەكەن، بەڵام بۆچی؟ لەبەرئەوەی وەكو ئەوان مەزەندەی دەكەن، پۆست مۆدێرنە لە دەست مۆدێرنە قوتاریان دەكات و بەمجۆرەش دەتوانن بگەڕێنەوە سەر بیروباوەڕی سەدەكانی ناوەڕاست.

هەرچی نیهلیست و ئانارشیزمەكانی وەك "فۆكۆ و دێریدا و لیوتارد"یشە، پێشوازی لە پۆست مۆدێرنە دەكەن، بەڵام لەبەر هۆیەكی دیكە، ئەویش ئەوەیە كە لە كۆت و بەندەكانی مۆدێرنە جاڕس بوون و دەیانەوێت ئەوروپا مەركەزی لێك — شیتاڵ بكەن. لەم سەروبەندەشدا "هانز كۆنگ" دەیەوێت "یۆرگن هاپرماس"ی هاوڵاتی خۆی دڵنیا

بكاتەوە، كە ئێستا بە مەزنترین فەیلەسوفی ئەڵمانیا و تەواوی خۆرئاوا دادەنرێت.

وەك ئاشكرایە ساڵی 1980 "هاپرماس" وتارێكی بەناوبانگی لەژێر سەردێڕی (مۆدێرنە پرۆژەیەكی ناتەواوە) بڵاوكردەوە و تیایدا شاڵاوی كردە سەر لایەنگرانی پۆست مۆدێرنە، بەو پێیەی ئەوانە دەیانەوێت تەواوی دەسكەوتە ئیجابییەكانی مۆدێرنە كە لەو ماوەی دوو سەد ساڵی ڕابردوودا بەدەست هاتووە، لەناوبەرن.

"هاپرماس" پێی وابوو ڕاستی توندڕەو لەگەڵ چەپی توندڕەودا، هاوهەڵوێستن لە دژایەتیكردنی مۆدێرنە و نابوتكردنی دەسكەوتەكانیدا.

وتاری (مۆدێرنە پرۆژەیەكی ناتەواوە)، هەڵلایەكی گەورەی لە ناوەندەكانی پاریسدا نایەوەو "فۆكۆ و دێریدا" و هاوڕێكانیانی زۆر توڕەكرد.

"هاپرماس" دان بەوەدا دەنێت كە مۆدێرنە گەیشتۆتە بنبەست، ئەم بنبەستەشی بە تاریكستانی نوێ ناوزەدكرد.. هەروەها پێی وایە ئەمە قۆناغێكە پێشبینی كردنی زەحمەتە، چونكە زیاد لە پێویست تاریك و ئەنگوستە چاوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زیاد لە ئەگەرێكی لەبەردەمدایە.

"هانز كۆنگ" بۆ ئەوەی "هاپرماس"ی هاوڕێی دڵنیا بكاتەوە، پێی دەڵێت: (من نامەوێت وەك هەندێك داخ لە دڵ و دەمارگیری كۆنەپەرست، دەسكەوتە گرنگەكانی مۆدێرنە فەرامۆش بكەم، بەڵام ناشتوانم لەمڕۆ بەدواوە مەسەلەی ئایین وەكو بیریارانی مۆدێرنە — هایدگەر، پۆپەر، دێریدا، فۆكۆ، هاپرماس — وەلاوە بنێم).

ڕاستە مۆدێرنە لە ڕێی وەدەرنانی لە گۆڕەپانەكە چارەسەری كێشەی ئایینی كرد، بەڵام ئەمە چارەسەرێكی نێگەتیڤانەیە و ناكرێت بۆ ئەبەد بەردەوام بێت. زوو بێت یان درەنگ پێویستە سەرلەنوێ ئایین بگەڕێنینەوە بۆ ناو كۆمەڵگە ئەوروپاییەكان، بەڵام بێگومان بە مۆدێلە دەمارگیریەكەی سەدەكانی ناوەڕاست نا، بەڵكو بەشێوازی پۆست مۆدێرنانە.

ئایین شایستەی ئەوەیە وەكو سیاسەت و هونەر و كۆمەڵگە، بەشێوەیەكی جدی تاوتوێ بكرێت. ئەم هەموو سوكایەتیكردنە بە ئایین لە سەردەمی مۆدێرنەدا بۆچی؟ بۆچی بیریارانی خۆرئاوا ڕێزی ئایین ناگرن و بە شانازییەوە باس لە بێ باوەڕی خۆیان دەكەن؟

"هانز كۆنگ" پێی وایە ئیعتبار گێڕانەوە بۆ ئایین پاش ئەوەی بۆ ماوەی دوو سەدە فەرامۆشكرا، لە توانایدایە شارستانیەتی خۆرئاوا لەو تەڵەزگەیە دەربهێنێت كە تێی كەوتووە، لێرەشەوە سەرەتاكانی سەردەمی پۆست مۆدێرن دەست پێدەكات. قەیرانی ئایینی، سەرچاوەی ئەو قەیرانە ڕۆحی و فیكریە گشتییەیە كە خۆرئاوا لە جەنگی جیهانی یەكەمەوە بە دەستیەوە گیرۆدەیە.

ئێمە گەر دەستنیشانی قەیرانی ئایینی نەكەین و نەتوانین زاڵبین بەسەریدا، ئەوا لە تواناماندا نابێت دەستنیشانی ئەو قەیرانە گشتیە بكەین كە ساڵەهایە خۆرئاوا تێی كەوتووە. ئەو قەیرانەی ئێستا بەر لە هەر شتێكی تر قەیرانێكی ڕۆحی و ئەخلاقیە.

لە پای هەموو ئەم داكۆكیكردنانە لە ئایین، تۆ بڵێی "هانز كۆنگ" ترسی لەوە نەبێت كە بە كۆنەپەرست و كۆنسێرڤاتیڤ تاوانبار بكرێت، بەڵام ئەو لە وەڵامدا دەستبەجێ دەڵێت: (من هەرگیز نامەوێت بكەومە بەرەی دژ بە مۆدێرنە و ڕۆشنگەری، بەرەیەك كە لە ساتەوەختی ئێستادا لەلایەن كلێساو هەندێ شوێنی ترەوە پاڵپشتی

لێدەکرێت). ئەگەر فەیلەسوفانی مۆدێرنەی وەك: "فیورباخ و مارکس و نیچە و فرۆید" لە ڕێی ڕاگەیاندنی (مەرگی یەزدان)ەوە تۆڵەیان لە ئایین کردبێتەوە، ئەوا "کۆنگ" نایەوێت بە ئیعلانکردنی (مەرگی مۆدێرنە) تۆڵەیان لێ بکاتەوە. ئەو پێی وایە لە مۆدێرنەدا خێروچاکەی زۆر هەیەو پێویستە ڕێزی لێبگرین...سەرجەم پێشکەوتنە زانستیی‌و پزیشکیەکان‌و کەمکردنەوەی ئازارەکانی مرۆڤ، لەسەردەمی مۆدێرنەدا ڕویانداو پێویستە ئەوەمان لەیاد نەچێت، بەڵام لە پاڵ ئەوەشدا دەبێت دان بەوەدا بنێین کە مۆدێرنە گەیشتۆتە بنبەست. ئەمەش مانای ئەوە نییە کە ئێمە شاڵاو دەکەینە سەر مۆدێرنەو لە بەهای ئەو کەم دەکەینەوە.

"هانز کۆنگ"بانگەوازێك ئاراستەی چەپی ڕەخنەگرو ڕاستی پۆزەتیڤیستی دەکات‌و پێیان دەڵێت: (بزانن جاڕدانی مەرگی ئایین لە سەردەمی مۆدێرنەو لەسەر دەستی کەسانی وەك فیورباخ‌و مارکس‌و نیچە ڕووی نەداو، ئەوەتا ئایین تا ئەمڕۆش لەناوجەرگەی کۆمەڵگە پێشکەوتووەکانی ئەوروپادا ئامادەگی هەیە).

ئەو پێی وایە پاش ئەوەی ئاقارە بێ باوەڕییەکانی پەنجاکان‌و شەستەکان‌و حەفتاکان هاتن‌و چوون، لە ئێستادا بیریارانی خۆرئاوا هەست بە پێداویستی شتێکی دیکە دەکەن. لەم قۆناغە ناهەموارەی تەڵەزگەی مۆدێرنەی خۆرئاواشدا، کێشەکە تەنها لە (لەیادکردنی کەینونە)دا نییە وەکی "هایدگەر" باسی دەکات، بەڵکو لە (لەیادکردنی یەزدان)یشدایە.. مرۆڤی تاك ڕەهەندیش بە وتەی "هربرت مارکۆزە"، توانای ئەوەی نییە بەخۆی باڵاڕۆیی دروست بکات. ئومێد لە حاڵەتی نەمانی مانای ڕەهادا دروست نابێت‌و مۆدێرنەش نەیتوانی مانای ڕەها دەستەبەر بکات. تەنها ئایین (ئەگەر بە شێوەیەکی ڕاست‌و دروست تێی بگەین) توانای ئەوەی هەیە.

مرۆڤی هاوچەرخی ئەوروپی کە لەسەر لێواری عەدەمیەت‌و پوچگەریدا دەژی، تەنها دووڕێگای لەبەردەمدایە، یان وەکی فریاد ڕەسێك چاوەڕوانی یەزدان بکات یاخود دەبێت لە (چاوەڕوانی گۆدۆ)دا بێت وەك "سامۆئیل بیکێت" باسی دەکات. بۆچی ئاقاری نیهلستی لە بوارەکانی فیکر و شانۆ و ئەدەبی مۆدێرندا، تەشەنەیان سەند؟ لەبەرئەوەی مرۆڤی ئەوروپی باوەڕی لەدەستداو ناشزانێت چۆن چۆنی بگەڕێتەوە سەری، قەیرانی ڕاستەقینەی مۆدێرنەش لێرەدایە. کەسە ژیر و داناکانی خۆرئاواش، هەنوکە دان بەو ڕاستیەدا دەنێن و پێت دەڵێن: ڕاستە شارستانیەتی خۆرئاوا لەسەر ئاستی تەکنۆلۆژی و زانستی و پیشەسازی پێشکەوتنی زۆری بەدەست هێنا، بەڵام هەمان پێشکەوتنی لەسەر ئاستی ئەخلاقی و ڕوحی بەخۆیەوە نەبینی. تێکچونی هاوسەنگی ئەم شارستانیەتەش لێرەدایە. نمونەش ئەو هەڵپە چاوچنۆکانەیەتی، بۆ دەست بەسەراگرتنی تەواوی بازاڕەکانی دنیا و بازاڕی ئەو وڵاتە هەژارانەشی بە دەست برسیەتیەوە دەناڵێنن. لێرە بەدواوە ئەم پرسیارە دەخەینە ڕوو: سیما و خەسڵەتەکانی جیهانی (پۆست مۆدێرن) کامانەن کە "هانز کۆنگ" بانگەشەی بۆ دەکات؟ "کۆنگ" پێی وایە قۆناغی پۆست مۆدێرن نابێت تەنها بریتی بێت لە کۆدێتاکردن بەسەر مۆدێرنە و ڕۆشنگەریداو، گەڕانەوە بێت بۆ دواوە وەکو کۆنسێرڤاتیڤ و کۆنەپەرستەکان خەونی پێوە دەبینن.. ئەو نەدەیەوێت ستایشی مۆدێرنە بکات و نەدەشیەوێت سەرکۆنەی بکات، بەڵکو داوا دەکات مۆدێرنە بژاربکرێت بۆ ئەوەی چاك لە خراپ و لایەنی سلبی لە لایەنە ئیجابیەکانی جیابکاتەوە. تەنانەت ئەو

لەگەڵ "هاپرماس"دا ناكۆكە لەسەر ئەوەی بە هەمان شێوەی جاران درێژە بە مۆدێرنە بدرێت، لەبەرئەوەی (پرۆژەیەكی ناتەواوە) وەكو ئەو پێی وایە، بەڵكو "هانز كۆنگ" پێی وایە مۆدێرنە پرۆژەیەكە پیر بووە و گەیشتۆتە بنبەست، ئێستاش كاتی ئەوە هاتووە لە ڕێی ئەم سێ قۆناغەی لای خوارەوە تێی بپەڕێنین:

1–پێویستە خۆمان بەو ڕۆحە ڕەخنەییەی سەردەمی ڕۆشنگەری چەكدار بكەین، بۆ ئەوەی لە هەموو دەمارگیریەكی ئایدیۆلۆژی و ئسوڵی (كە سەرچاوەكەیان هەرچیەك بێت)، خۆمان بپارێزین.

2–پێویستە دژایەتی ئەو ئاڕاستە تاك ڕەهەندییە مادییەی مۆدێرنە بكەین كە لایەنی ڕوحی و ئایینی فەرامۆشكردبوو. ئەمەش خەسڵەتی مۆدێرنەی پۆزەتفستی بوو كە لە سەدەی نۆزدەو بیستدا باڵادەست بوو. سەردەمی پۆست مۆدێرن خوازیاری ئەوەیە سەرلەنوێ بگەڕێتەوە لای ئیمانداری. ڕاستە ئەقڵ و زانست و پێشكەوتن، مەسەلەگەلێكی گرنگ و پێویستن، بەڵام بە تەنها بەس نین و پێویستە ڕەهەندی ڕۆحی و ئیمانیشیان سەربار بخەین.

3–پاش ئەوەی مۆدێرنە جێدێڵین و پێ دەنێینە قۆناغی پۆست مۆدێرن، دەتوانین بەشێوەیەكی گشتگیر سەیری واقیع بكەین و لایەنە ڕۆحی و مادییەكانی پێكەوە ببینین.

"هانز كۆنگ" لەوە زویرە كە "هاپرماس" وەك دواین گەورە نوێنەری قوتابخانەی فرانكفۆرت، شوێن پێی "هۆركهایمەر"ی مامۆستای هەڵنەگرتووە كە یەكێكە لە دامەزرێنەرانی ئەو قوتابخانەیە و ڕەهەندی ڕوحی بە گرنگیەكی زۆرەوە تەماشا دەكرد.

ئیمانداری لە سەردەمی پۆست مۆدێرندا، ئیمانداریەكی نوێیە و دوورە لە هەموو دەمارگیری و داخرانێك. بۆیە گەڕانەوەی ئەمجارە بۆ لای بیروباوەڕی ئایینی مایەی ترس و نیگەرانی نییە و "هانز كونگ"یش داوای گەڕانەوە بۆ سەدەكانی ناوەڕاست ناكات و ناشیەوێت دەستبەرداری دەسكەوتە سەرەكیەكانی مۆدێرنە و ڕۆشنگەری ببین.

كارێك كە "كۆنگ" پێیەوە سەرقاڵە، لێك نزیككردنەوەی نێوان هەموو ئاینە مەزنەكانی مرۆڤایەتیە، چونكە هەموو ئەو ئایینانە خاوەن پەیامێكی ڕۆحی بەرزن و پێویستە هەركەسە و لای خۆیەوە دان بەوەدا بنێت كە بەهای بەرز و بەنرخ تەنها لەو بیروباوەڕەدا نییە كە خۆمان باوەڕمان پێیەتی، بەڵكو لە ئایینەكانی دیكەشدا هەیە. بەمجۆرە لە ڕەوتی داخران و دەمارگیری قوتارمان دەبێت و ئاشتی ئایینی لە نێوان بیروباوەڕە جیاجیاكاندا بەرقەرار دەبێت. ئاخۆ دەشێت ئاشتی ئایینی لە نێوان ئینسانەكاندا بەرقەرار بێت و ئەوەش بكرێتە سەرەتایەك بۆ هێنانە ئارای ئاشتی سەربازی و سیاسی لە سەرتاسەری جیهاندا؟

ئەمە ئەو شتەیە كە "هانز كۆنگ" خەونی پێوە دەبینێت و تەواوی توانای خۆی بۆ خستۆتە كار. ڕەنگە گەر لە پای هەلومەرجی ئەمڕۆی دنیادا سەیری ئەو خەون و خواستەی "كۆنگ" بكەین، زۆر یۆتۆبیانە بێتە بەرچاو، بەڵام كێ چوزانێ؟ خۆ هەموو پرۆژەكان بە خەونی یۆتۆبیانە دەستیان پێكردووە.

## سەرچاوە

الشرق الاوسط، 2002/8/12.

# یۆرگن هابرماس: دیالیکتیکی ئەقڵی نوێ

فرانسوا ئیڤاڵد

لە عەرەبییەوە: ڕۆشنا ئەحمەد

ئەڵمانیا لە پاش جەنگ فەیلەسوفی خۆی بینییەوە؛ ئەویش یۆرگن هابرماس (*habermas jurgen*) بوو، کە لە ژێر کاریگەریی میتۆدی "قوتابخانەی فرانکفۆرت"دا بوو، ئەم فەیلەسوفە دە ساڵ زیاترە لە توێژینەوەیەکی گشتیو وورد لە بارەی نهێنییەکانی نوێگەریو هاودژیەکانی بەردەوامە.

فەیلەسوفەکان بەلانی کەمەوە دوو جۆریان هەیە" فەیلەسوفە زانکۆییەکان کە وانە دەڵێنەوەو بایەخ بە شیکردنەوەو رەخنەی دەقە فەلسەفیەکان دەدەن، ئەم کارەش پێویستی بە ژیانێکی تایبەت و دەگمەنی فەیلەسوف نییە، ئەم ژیانە گەورە بێت یان بچوك، ئەمەش شتێکی گرنگ نییە، گەرچی فەلسەفەی ڕەسەن ئەوەیە کە ژیانی خاوەنەکەی دەگرێتەوە، ئەو فەلسەفەیە پێی وایە لەم ژیانەدا عەشقێکی پڕ لە شەیدایی بۆ ئێستا بەرجەستە دەبێت، واتە ئەو ڕێگەیەی بوار بە بوونەوەر دەدات بچێتەوە ناوخۆی و وەك بەرهەمی ڕووەك سەرلەنوێ پێبگاتەوە، وەك ئەوەی فەیلەسوف دەریدەبڕێت و جەماوەر تیایدا عەشقی تایبەت بە خۆی دەناسنەوە.

یۆرگن هابرماس کە مامۆستای زانکۆ و خوێنەرێکی بێوێنەیە، بێگومان سەربەجۆری دووەمی فەیلەسوفەکانە. بایەخە فەلسەفییەکانی هەروەکو پابەندبوونەکانی پەیوەستە بە چارەنووسی ئەڵمانیاوە لەم سەردەمەدا، کە ناکرێت دەستبەرداری بێت یان بخرێتە لاوە، کە ئەویش لە پێویستی بیرکردنەوەدا و لە نێو نەریتی فەلسەفیدا خۆی دەنوێنێت و بە باشی پەی بە خراپی نازییەکان دەبات.

هابرماس لە پێشکەشکردنی خۆیدا دەڵێت: "من سەر بە نەوەی ڕۆشنبیرەکانی ئەڵمانیام، ئەوانەی لە ماوەی قۆناغی نازییەکاندا گەورە بوون و لە کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانیدا لە ڕووی ڕۆشنبیرییەوە پێگەیشتن و لە چوارچێوەی کۆماری ئەڵمانیای فیدراڵیدا ژیانیان بردە سەر و بوونە

مامۆستا، کاتێك قوتابییەکانی ساڵانی شەستەکان یاخی دەبوون و شۆڕشیان بەرپا دەکرد". ئامانجی فەلسەفەی هابرماس بریتییە لە ئارەزوویەکی زۆری تێفکرین دەربارەی نوێگەری و نهێنی و هێماکانی. هابرماس لە لایەکەوە جەخت لە پەیوەست بوونی خۆی بە ڕۆشنگەری و بە پەیمانە ئازادیخوازەکەیەوە دەکات، لەلایەکی دیکەشەوە بایەخ بە ڕەخنەی دەرەنجامە وێرانکارییەکانی پرۆسەی ئەقڵانی بوونی بەردەوام لە هەموو شێوەکانی ژیان لە جیهانی هاوچەرخدا دەدات.

سەربەخۆیی کاری فەلسەفی لای هابرماس شتێکی بنەڕەتییە، لەو بڕوایەشدایە فەلسەفە کردەیەکی سیاسی یان ئاکاریی نییە، بەڵکو کارێکە پشت بە شیکردنەوەی ڕەخنەیی دەبەستێت و پێویستە لە هەمان کاتدا وورد و ڕوون و بابەتیی بێت، هەروەها ڕۆڵی بنەڕەتی ڕۆشنبیر بریتییە لە بەرگری کردن لەو بنەمایانەی کە لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر دەخوێنرێن، یاخود بریتییە لەوەی کە لەبیردەچێتەوە یان لەبیر دەبرێتەوە. هابرماس خواستی خۆی لە نواندنی چەندین ڕۆڵدا ڕووندەکاتەوە و دەڵێت: "وەك فەیلەسوف، من لە گۆڕەپانی زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا کاردەکەم، وەك مامۆستاش، من وانە دەڵێمەوە، بە چاوپۆشین لە هەموو ئەمانەش، من ڕۆشنبیرم، بە چاوپۆشین لەمەش، پێویستە لەسەرم بە کردەوە بچمە نێو مەسەلەکانەوە". ئەگەرچی هابرماس وانیشان دەدات کە کەسێك نییە لە ئەڵمانیادا بە پڕەنسیپی جیاکردنەوە یان جیاکاری لە نێوان چالاکییە جیاوازەکان و سنوورەکانی کارکردنیان ڕازی بێت، بەو مانایەی دەبێت فەلسەفە هیچ نەبێت جگە لە پاساوهێنانەوە بۆ سیاسەتێك، بە جۆرێك پابەندبوون تەنها جوانکردن و ڕازاندنەوەیەکی فەلسەفەیە و هیچی تر.

یۆرگن هابرماس ساڵی (1929) لە (گومارشباخ) کە لادێیەکی بچووکە و لە نزیك (کولونیا) لەدایك بووە. ئایا ڕووداوەکانی کاتی منداڵی تیایدا ژیاوە و لە دەمی نازییەکاندا کاری تێکردوە؟ هابرماس خۆی وەڵام دەداتەوە: "بەشێوەیەکی شاراوە کاری تێکردوم". ئەو سەر بە خێزانێکی بۆرژوا بوو کە بایەخیان بە سیاسەت نەداوە، لەبەرئەوەشە ئەو قۆناغە سەختەی چەشتووە، واتە بە بێدەنگی وەك بێدەنگی ئەو کەسانەی لە دەوری بوون قۆناغی نازییەکانی بەسەر بردوە، بۆ خۆی بە باشی یەکەمین ڕۆژانی ترسی دێتەوە یاد، کاتێك ئەندامانی خێزانەکەی دەستیان بە چرپە چرپ دەکرد و بێدەنگانە باسیان لەو ڕووداوە ترسناکانە دەکرد کە لە دەرەوەی ماڵەکەیاندا ڕووی دەدا. هەرچەندە هەموو شتێك بەلای هابرماسەوە لە ساڵی (1945)ەوە دەست پێدەکات، واتە ئەو کاتەی تەمەنی (15) ساڵان بوو، لەو دەمەدا خۆی لەبەردەم تاوانەکانی نازیزمدا بینییەوە کە لەتەك هێوربوونەوەی جەنگدا وردە وردە بەدەردەکەوتن. لە هەمان کاتدا دەستیکرد بە خوێندنەوەی بنەما و پێکهاتەکانی نوێگەری خۆرئاوا، لە پێشانگای هونەری نوێگەریش ئامادە بوو کە ساڵی (1947) لە کۆلۆنیا سازدرا. ئەوجا بە خوێندنەوەی کامۆ و تۆماس مان و هێرمان هیسە سەرگەرم بوو. ژان پۆل سارتەر بەلایەوە کەسێکی گرنگ بوو، چ لە ڕووی پەیوەندی بەهێزییەوە بە ئازادییەوە، یان لە داکۆکی کردنی کۆڵنەدەرانەی لە ئازادی. ئەو کاتە سارتەر وەك ڕۆماننووس و شانۆ نووسێك لە ئەڵمانیادا

ناسراو بوو، شانۆگەرییەكانیشی لە هۆڵەكانی (دیسوڵدورف و كۆلونیا)دا نمایش دەكران.

خوێندنەوەكانی هابرماس لە قۆناغی ئامادەییدا تەنها بە فەلسەفەوە نەگیرسایەوە، بەڵكو بایەخی بە بایۆلۆژیا و دەروونزانی و ئەدەب و ئابووریش دەدا، هەر شتێكی بەردەست دەكەوت بە واتا ڕاڤەكردن و بە وردییەوە دەیخوێندەوە، هەر لەو ماوەیەشدا كەوتە سەر بەرهەمەكانی ماركس و لینین و بیلخانۆڤ. لە قۆناغی خوێندنی زانكۆیشدا كە لە ساڵی (1949)ەوە بۆ (1954)ی خایاند لە هەردوو زانكۆی (گۆنتگن و بۆن) هابرماس دوچاری ژمارەیەك ڕاچڵەكینی سیاسی و فەلسەفی بۆوە، كە بەپێی بیرو بۆچوونەكانی دواتری یەكلایی كەرەوە بوون. ساڵی (1949) دوچاری یەكەم ڕاچەنین بۆوە، لەو كاتەشدا خەباتگێڕێكی چەپڕەوی ئاشتیخواز بوو. دەبووایە پشتگیری لە (هاینمان) بكات (كە دواتر بووە سەرۆك كۆمار)، كاتێك هاینمان لە پۆستەكەی پاشەكشێی كرد لە ئەنجامی ناڕەزایی لەسەر بڕیاری (ئەدینهاوەر)ی دادوەر دەربارەی پێكهێنانی سوپای ئەڵمانیا بە تێكەڵ بوونی بە سوپای هاوپەیمانان و لایەنگرانیان. گەورەترین ناخۆشی كە هابرماس بینی ئەوە بوو: دەبووایە بڕیارێك لەسەر ئەو میتۆدانە بدات كە لە زانكۆكانی ئەڵمانیادا و هەر لە ساڵانی بیستەكانەوە لە گۆڕێدا بوون.

ئەدینهاوەر بڕیاری ڕێگە پێدانی بۆ مامۆستا نازییە كۆنەكان دەركرد، كە سەرلەنوێ وانە بڵێنەوە، لەو ماوەیەشدا هابرماس لە ژێر دەستی ئەو مامۆستایانە خوێندی كە پێش قۆناغی نازی و لە كاتی نازییەكاندا وانەیان دەووتەوە، ئەوانیش بە دوای یەكتردا بریتیبوون لە: نیكۆلای هارتمان – *Nicolai Hartmann* كە بەلای هابرماسەوە هیچ بایەخێكی نەبوو، تیۆدۆر لیت – *Theodor Litt* كە دژی نازییەكان بوو بەڵام بەڕادەیەكی زۆریش جاڕسكار بوو. وە ئیریك ڕۆتكار – *Erik Rothacker* كە سەر بە ڕێچكەی زانستەكانی مێژوو بوو كە لە سەدەی نۆزدەدا باو بوو، هەروەها ئۆسكار بیكەر – *Oskar Becker* كە لە پێكهاتنی بیری هابرماسدا كاریگەرییەكی گەورەی هەبوو. بیكەر قوتابی هۆسرڵ و هاوچەرخی هایدگەر بوو، لەگەڵیدا لە زانكۆی (فرایبۆرگ) دەیخوێند، ئەو لە لۆژیكی سنووردار (مقید)دا پسپۆر بوو. پڕۆژەیەكی دژ بە (بوون و كات – *Sein und Zeit*) ئامادەكرد كە نووسینێكی بەناوبانگی هایدگەرە، هەروەها لە خودی هایدگەر زیاتر دركی بە نهێنییەكانی پێشڕەوانی هونەری نوێ دەكرد.

هابرماس لە دواییدا زانی رۆتكار و بیكەر نازیین، ئەویش پاش خوێندنەوەی بابەتەكانیان كە لە سییەكاندا نووسیبوویان. لە ساڵی (1953)دا وانە بەناوبانگەكەی هایدگەر (سەرەتایەك بۆ میتافیزیكا)ی خوێندەوە كە ساڵی (1935) پێشكەشی كردبوو، تیایدا شیكردنەوەیەكی گوماناوی بەشێوازێكی گومان هەڵگری پێشنیاز كرد، كە بە لایەن خەڵكییەوە لە كەشی فیكری ئەو قۆناغەدا وەك فاشییەك یان لە ڕیزی فاشییەكاندا بوو، هایدگەر لەو وانەیەداو لە ڕستەیەكدا باس لە "ڕاستەقینەیی گەرمی ئەم بزوتنەوەیە و گەورەیی" دەكات، ئەم ڕستەیەش ڕاچەنینێكی گەورە بوو لای هابرماس، لەبەرئەوە بڕیاریدا ڕێڕەوێكی فەلسەفی ئەوتۆ بگرێتەبەر كە لە بنەڕەتدا پشت بە دیدی سیاسی تووند ببەستێت و ئەوە بدۆزێتەوە كە لە كاری فەلسەفیدا و دیدی سیاسی و ئایدیۆلۆژیدا حەشار دراوە. هابرماس تا ئەو كاتەش هایدگەریی بوو، بەڵام وردە وردە زانی هایدگەر تەواو بێگوناه

نییە، بەرەو هیگڵییەت و ماركسییەت گۆڕا، بە مەبەستی هەوڵی دروست كردنی گونجاندنێك لە نێوانیاندا، لەم بوارەشدا كارەكانی (لۆفیچ – *Lowitch* – و پلیسینەر – *Plessner* و لوكاش – *Lukacs* و دواتر ئەدۆرنۆ – *Adorno* و بنیامین – *Benjamin* و بلۆخ – *Block*)ی خوێندەوە، واتە كاری ئەوانەی نازیزم پیسی نەكردبوون و بە تەنها دەیانتوانی پرۆسەی پاكژكردنەوەی پێویست بە ئەنجام بدەن. گلەیی و گازندەكان لەو ماوەیەدا كەوتە سەر نەوەی هابرماس، بە هۆی دابڕانیان لە نەریتی فەلسەفی ئەڵمانیای كۆن و جۆش و خرۆشیان بۆ ئەو فەیلەسوف و بیرمەندانەی خەباتیان بۆ ئەم تەقلیدە كردوەو بە توندی بەگژیدا چوونەتەوە، ئەگەرچی هابرماس ڕوونی كردەوە كە ئەم ڕێڕەوە ڕێڕەوی نەوەیەك نەبووە، بەڵكو ڕێڕەوی تاكەكانە، هەر تاكێكیش میتۆد و دید و بۆچوونی خۆی هەیە.

هابرماس تێزەكەی خۆی دەربارەی شیلینگ – *Schelling* ئەنجامدا، بەڵام پاش تەواوكردنی خوێندنی باڵای، هیچ كورسییەكی لە زانكۆدا چنگ نەكەوت. بۆ ماوەی ساڵێك وەك ڕۆژنامەنووسێك كاری كرد، لەو ماوەیەدا یەكێك لە هاوكارانی لە ڕۆژنامەكەدا پێشنیازی بۆ هابرماس كرد كە لە فرانكفۆرت چاوی بە (تیۆدۆر ئەدۆرنۆ) بكەوێت، ئەوەش ساڵی (1956) بوو. ئەدۆرنۆ دەقێكی هابرماسی دەربارەی (دیالیكتیكی بە ئەقڵانی بوون) خوێندبۆوە، كە تۆژینەوەیەكە لە كۆمەڵناسی دەستكرد. ڕەنگە ئەدۆرنۆ لە كۆتایی خوێندنەوەی دەقەكەدا بیری لەوە كردبێتەوە كە دەقەكەی هابرماس لە ژێر كارگەری ئەو كتێبەدا نووسراوە كە ئەدۆرنۆ خۆی بە هاوكاری هۆركهایمەر "دیالیكتیكی ئەقڵ" نووسیوویەتی. لەبەرئەوە زوو ڕازی بوو هابرماس وەك مامۆستای یاریدەدەر لە زانكۆدا دابمەزرێنێت. هابرماس دەربارەی ئەو چاوپێكەوتنەی خۆی لەگەڵ ئەدۆرنۆ دەڵێت: "ئەدۆرنۆ ئەو بلیمەتەیە یان ئەو بلیمەتییەیە كە پێشتر لە وێنەیم نەدیوە" بۆیە دواتر پەیوەندییەكی نموونەیی لە نێوان ئەو دوو فەیلەسوفەدا دروست بوو، ناوبەناویش كێشمەكێشی فیكری و فەلسەفی لەخۆدەگرت. هابرماس لە هاوڕێیایەتی ئەدۆرنۆوە فێربوو ماركس وەك فەیلەسوفێكی هاوچەرخ بناسێت و گووتەكانی بۆ شیكردنەوەی بارودۆخی ئێستا بەكاربهێنێت، هەروەها شارەزای سیگموند فرۆید بوو كە تا ئەو دەمەش بە تەواوی نەیدەناسی.

هابرماس لە فرانكفۆرت و پاشان لە هایلبارگ و دیسان لە فرانكفۆرت و ئەوجا لە شتانبارگ وانەی دەوتەوە، بۆ ماوەی دەساڵیش (1970–1980) پەیمانگای (ماكس پلانك – *Max plank*)ی بەڕێوەبرد كە پەیمانگای زانستە كۆمەڵایەتییەكان بوو، ئێستاش سەرلەنوێ لە فرانكفۆرت وانە دەڵێتەوە.

لە نێوان ساڵانی (1956 و 1959)دا هابرماس ئەو كارو توێژینەوانەی بەئەنجامدا كە پەیوەست بوون بە كۆمەڵناسی ئەزموونگەرییەوە دەربارەی هوشیاری سیاسی و سیاسەتی زانكۆیی. لە ساڵی (1962)دا تێزەكەی "فەزای گشتی" بەدەركەوت كە ئێستا لەبارەیەوە دەڵێت: ئەو تێزە بە مۆركی بەرائەتی فەلسەفی، چاپكراوە. لەم تێزەدا ئەو بیرۆكەیە سەرهەڵدەدا كە هەردەم لە بیری هابرماسدا مابۆوە و لە بنەڕەتدا دەربارەی دوولایەنی نوێگەری تەوەرە دەبەستێت. كریستیان بۆشیندۆم دەڵێت: "بێگومان ئەڵمانیا لە هەموو وولاتەكانی دی زیاتر لە كۆتایی جەنگی دووەمی جیهانیدا بەرامبەر

هەردوو واقیعی نوێگەری کۆمەڵایەتی و سیاسی هەستیار بوو، یەکەم واقیعی کانتی (ئەمانوێل کانت) بوو، واقیعی دووەمیش فیبەری (ماکس فیبەر) و مارکس بوو، یەکەمیان دامەزراندنی دەوڵەتی یاسای دیموکراتی بە هەستێکی گەرم و پڕ لە خرۆشەوە دەبەستێتەوە، کە هیچ مشتومڕێك لەسەر چارەنووسی گەورە هەڵناگرێت، دووەمیش لەو بڕوایەدایە کە دەوڵەتی یاسا لە ژێر پەستانی هۆکارە ئابووری و مێژووییەکاندا تەنها گەمەیەکە و وەزیفەی ئامێریی هەیە. خواستی هابرماس لە "فەزای گشتی"دا بیرکردنەوە بوو لەم واقیعە دوولایەنە بەبێ شەڕ وەستا یان ڕێگەیەك بۆ ئاشتبوونەوە یان ڕێککەوتن.

لە سەرەتای شەستەکاندا، هابرماس لەسەر داوای فەیلەسوفی ناسراو (گادامیر – *Gadamer*) لە زانکۆی هایلبارگ وانەی ووتەوە، ئەو کاتەش دەبوو لە کۆمەڵناسییەوە وەرچەرخێتە سەر فەلسەفە، هەروەك خۆی لە کاتی بڵاوکردنەوەی کتێبەکەیدا "مەعریفە و سوود" ساڵی 1968 جەختی لەسەر کردەوە، ئەمیان وەك هەوڵێك بوو بۆ دامەزراندنی تیۆرییەکی ڕەخنەیی بۆ مەعریفە، کە بووە ڕوویەك لە ڕووە فەلسەفییەکان و شێواز و میتۆدە تایبەتەکەی دەرخست. ئامانجی هابرماس لەم کتێبەدا ڕەخنەگرتن بوو لە کاریگەری کۆمەڵناسی ئەمریکی لە ئەڵمانیادا و لە سەرەتای شەستەکاندا، تیایدا جەخت لەوە دەکات کە زانستە ئەزموونگەرییەکان تەنها بەهایەکی شیکاری دیاریکراون تا ئەو دەمەی دەچێتە سەر نموونە کۆمەڵایەتییەکان، لەبەرئەوە مەعریفەی زانستی دیکە هەن، بەتایبەتی ئەو مەعریفە کۆمەڵایەتییانەی کە پشت بە تیۆرییەکی ڕەخنەیی خاوەن ڕەوتێکی ڕزگاریخوازی دەبەستێت و شیکردنەوەی دەروونییش دەبێتە نموونەیەك بۆی. لێرەدا لەوە دڵنیا دەبین کە هابرماس بەڕێژەیەکی زۆر کەوتۆتە ژێر کاریگەری شیکردنەوەی دەروونییەوە. بارودۆخیش بواری دەدا، کاتێك لە هایدلبارگ بوو، ئامادەی وانەکانی ئەسکەندەر میچارلیك – *Alexander Mitscherlich* ببینێت و لە ڕێگەیەوە توانی بە چاوی خۆی شیکار کارەکان ببینێ چۆن مێژووی نەخۆشەکانیان توێ توێ دەکەن. لە کتێبی "مەعریفە و سوود"دا دەیویست ئەوە دەرخات مارکسییەت و شیکردنەوەی دەروونی چۆن بەهای زانستییان هەیە و چۆن هەردووکیان تەنها دوو ئایدیۆلۆژیا نین، لەو کتێبەدا هەوڵی خوێندنەوەی فرۆید دەدات لە خاڵی دەرچوونی ئەو چەمکانەوە کە لە تیۆری هاوپەیوەندییەوە دەردەهێنرێت و بە فەلسەفەی زمانەوە بەندە.

کتێبێکی دیکەی هابرماس کە "تیۆری کردەی هاوپەیوەندی"یە، لە ئیشکالیەتی نوێگەریدا گیرساوەتەوە، بۆ ئەم گۆڕانە مێژووییە، هابرماس لەو بڕوایەدایە ڕووخاندنی دید و ڕوانگەی کۆن بۆ جیهان خەونی ڕزگاری هەڵگرتووە، لە ڕێی بە ئازادی پراکتیزەکردنی ئەقڵەوە.

ئەم تیۆرییەی هابرماس دەگەڕێتەوە بۆ نەریتی ئەڵمانی پەتی و جەخت دەکاتەوە لەسەر دەرەنجامە نیگەتیڤەکانی نوێگەری: ڕوخانی شێوە تەقلیدییەکانی ژیان، بزربوونی جەوهەری ڕۆشنبیری بە هۆی پیشەسازییەوە، ئەم ڕوانگەیە لە جەوهەردا پشت بە مارکس و ماکس فیبەر و سیگمۆند فرۆید دەبەستێت.

خواستی هابرماس لەوەدا خۆی نوواند کە سەرلەنوێ چەمکێك بۆ ئەقڵ بنیاد بنێت کە شکستخواردو نەبێت، بەڵکو هێندە نەرم ببێ و ئەو ڕەخنەیە لەبەرچاو بگرێت کە ڕووبەڕووی ئەقڵ

كراوەتەوە، بەهێزیش بێت و وەك تیۆری كۆمەڵگە توانای ڕزگاركردنی ئەو نموونانەی هەبێت كە نیشانەی نوێگەرییان هەڵگرتووە و ناكرێت دەستبەرداری بین، گەر لە خۆمان نەبوورین، بەو پێیەی بەرهەمی ئەو نموونانەین. یۆرگن هابرماس بیرمەندێكی نوستالۆژی نییە، ئێمە ناخوازین بەرەو دواوە بگەڕێینەوە و ڕەشبین بین، بێگەردیی فەلسەفی لە ڕێی دەستنیشانكردنی فرەییەوە دەبێت، كە بزانێت چۆن ساغ و ناساغ لە نوێگەریدا جیادەكاتەوە.

لە ناوەڕاستی حەفتاكاندا ژیانی سیاسی ناوخۆی ئەڵمانیای فیدراڵی پڕ بوو لە كێشەو تەنگژە، كاتێكیش (شلایار – *Schleyer*)ی سەرۆك كاری ئەڵمانیا ڕوخێنرا، تەنگژەكە مەترسیدارتر بوو. لە یەكێك لەو گفتوگۆیانەی ساڵی (1981) لەگەڵیدا سازدرا، هابرماس ووتی: "بۆ یەكەمین جار تیۆرییەكانی پارێزگاری نوێ لەبەرچاو گیرا كە ساڵی 1973 بەربڵاو بوو، ئەو كاتە نەك تەنها بێباك مابوەوە بە هەستێك كە من پێشتر ئەوەم بینیوە، بەڵكو بە پێچەوانەوە، هاتنە ئارای ئەو ڕزگاریخوازانەی كە بیروڕاو پرەنسیپەكانیان لە گلین – *Gelen* و كارل شمیدت – *Karl Schmitt* وەرگرتبوو، تیایاندا دیاردەیەكم بۆ بارودۆخی گشتی و سەرتاپاگیر بینی، خۆم ماندوو كرد بۆ ڕونكردنەوەی ئەو چەمكەی لەم تێبینیانەدا خۆی حەشاردابوو، چەمكی نوێگەری و وازهێنان لە نوێگەری و وازهێنان لە دیموكراسی ڕیشەیی و لە ڕۆشنگەری و وازهێنانی بەگوڕ لەو بیرۆكانەی بە گشتی كۆماری فیدراڵی لەسەر دامەزرا بوو. دیمەنی دووەمیش ئەوە بوو من بۆ یەكەمجار لەو بڕوایەدا بووم كە تێدەگەم و درك بە ڕەهەندی ووزە ڕەتكەرەوەكان و ئەو بزوتنەوانە دەكەم كە لە نێوان من و ئەودا نەبوون".

لەم گۆشەیەوە دەتوانین بڵێین پرۆسەی نوێگەری دوو لایەنییەكی جەوهەری هەیە، چونكە حەتمییەتی سستمە ئابووری و كارگێڕییەكان هەن كە لە "ڕوخاندنی" جیهاندا بەردەوامن، ماكس فیبەر بەم دیاردەیە دەڵێت "بیرۆكراتی" بەڵام ماركس پێی دەڵێت تاڵان كردن.

هابرماس لە "تیۆری كردەی هاوپەیوەندی" و لە تۆژینەوەكانیدا هەوڵ دەدات مرۆڤایەتی بۆ مرۆڤ بگەڕێنێتەوە و جەوهەر و ڕۆحی ڕاستەقینەی جیهانیش بۆ جیهان و ڕازاوەیی و جوانی سروشتیش بۆ سروشت. یۆرگن هابرماس هەر بە تەنها فەیلەسوفێك نییە، بەڵكو هەروەها ڕۆشنبیرێكە كە بەرامبەر مەسەلە سیاسییەكانی وولاتەكەی و دەرەوەی وولاتەكەی زۆر هوشیارە. لەو بڕوایەدایە پێویستە نازییەت وەك دیاردەیەك لە ڕابردوودا و هەروەها لە ئێستاشدا چارەسەر بكرێت، لەبەرئەوەی مەترسییەكانی لە نوێگەریدا بەردەوامن.

هابرماس شیكردنەوەیەك بۆ دیاردەی "سەوز" پێشنیاز دەكات و دەڵێت: "سەوزەكان ناوكی ڕێكخراوێكن كە ئێستا بە "بزوتنەوە كۆمەڵایەتییە نوێیەكان" ناوزەد دەكرێن، لە پێكهاتە و ئامانجەكانیدا نوێیە، چونكە لەم بزوتنەوانەدا چاوگەكانی چینە مام ناوەندەكان بەرچاو دەكەوێت كەوا دەبینن پرۆژە تەكنەلۆژییەكان هەڕەشەیان لێدەكات، هەروەها ئەو گەنجانەی هەست بە مەترسی پەرەسەندنی پیشەسازی و زانستی دەكەن، سەرباری نێوەندە كۆمەڵایەتییەكانیان، هەروەها ژنان و بێكاران و ئامانجە ئاشتیخوازەكانی ئەم بزوتنەوەیە دەبینین كە دژی تیۆرە و

شیکردنەوە ڕۆشنبیرییەکانن (......) بە ووشەیەك: ئەگەر سەوز نەدەبوو، هەردەبوو بیاندۆزینەوە".

یۆرگن هابرماس لەو بڕوایەدایە پاشەڕۆژی ئەڵمانیا بە پاشەڕۆژی ئەوروپاوە بەندە.

ئەڵمانییەکان بە دابەشکردنی ووڵاتەکەیان ڕازی بوون و تەواو بیر لە یەکگرتنەوەی دوو کەرتەکەی ناکەنەوە، هەروەك چۆن بیر لە لەخۆگرتنەوەی ناوچە ئەڵمانییە سویسرییەکەی ناکەنەوە. هابرماس لە بارەی بارودۆخی سیاسی هەنووکەوە دەڵێت: "ئایا پێویستە لەسەرمان ئەو دیمەنە یەکگرتووە بخەینە لاوە کە لە نێوەندەکانی گەلدا گەشە دەکات، ئەو دیمەنەی لە بنەڕەتدا ڕووە و بەردەوامی – هاوپەیوەندی – ئاراستەکراوە، واتە بەرەو نەریتی ئەڵمانی (یان بە پێچەوانەوە، پێویستە لەسەرمان هەرکارێك بە ئەنجام بگەیەنین، بە ڕێگەیەك کە بوار بە پەرەسەندنی هوشیاریی جۆراو جۆر بدات، نەك تەنها وا بکات بڕوانینە ڕابردوو و ئەو نەریتەی کە دەبێت پێڕەوی بکەین، بەڵکو دەیکاتە شتێکی هەر بوونایەتی – حەتمی لەسەرمان کە لە بارەیەوە ڕێگەیەکی فیکری نوێ بگرین!".

### سەرچاوە

"متاهات" نصوص و حوارات في الفلسفة و الادب، ترجمة/ حسونة المصباحي، مراجعة/ د. قدامة الملاح، ط 1 – بغداد – 1990، ص 53-61.

# وەرچەرخانەكانی "پیرۆز"

**محەمەد ئەركۆن**

**لە عەرەبییەوە: كامیل قەرەداغی**

مەبەست لەم ناونیشانەی لێرەدا هەڵمانبژاردووە، هێنانەبەرباسی بیرۆكەی ئەو بەكارهێنان و مانایانەی مزگەوتە كە لە كۆمەڵگە ئیسلامییە هاوچەرخەكاندا ڕویان لە گۆڕان كردووە.ئەگەرچی كەسی بڕوادار كاتێك لە مزگەوتدا دەبێت، لەوانەیە ڕوانینی ئەوەی هەبێ كە لەوكاتەدا لەگەڵ (پیرۆز)دا لە پەیوەندییەكی ڕاستەوخۆدایە. ئەو خۆی وادەبینێت كە بە كردەوە لەگەڵ بەرجەستەبوونەكانی بەكارهێنانە جیاوازەكانی خانەی پەرستاریدا ڕووبەڕووە ، كە ئەوانە كۆمەڵە گۆڕانێكن لە سروشتی نائاینیدا ئامادەییان هەیەو لەوانەیە ئەو وا بیانبینێت كە توانای تێگەیشتن و پێوەپەیوەستبوونی لەگەڵیاندا نەبێت. ئەم شیكردنەوەیەی لێرەدا خراوەتەپێشچاو هەوڵێكە بۆ دۆزینەوەی تێگەیشتنێكی باشتری كۆمەڵگە ئیسلامییە هاوچەرخەكان و پەیوەندییان بە مزگەوتەوە. ئەو ڕایەی مشتومڕی لەسەر دەكەم و بڕوام پێیەتی ئەوەیە كە پێویستە تەواوی مێژووی مزگەوت چاوی پێدابخشێنرێتەوەو سەرلەنوێ ڕاڤە بكرێتەوە.لەگەڵ ئامارەدانێكی تایبەت بە فۆڕم و دیزاینەكان و تێزە سیمۆلۆژییەكانیش (تێزە سیمۆلۆژییەكان ئەو هێما و سیمبولانەن كە ئەندامانی هەر گروپێكی كۆمەڵایەتی بۆ گەیاندنی بەها هاوبەشەكانیان بەكاریدەهێنن)، سنوری هەست پێكردنی چەمكە ئەبستراكتەكانی وەك "پیرۆز" و ئەو ڕێگایانەش دیاری دەكات كە "پیرۆز"ی پێدەخرێتەگەڕ. هەروەها حەزدەكەم جەخت لەسەر ئەو بیرۆكەیە بكەمەوە كە دەڵێت خودی سروشتی هەرشتێك لە هەر كۆمەڵگەیەكدا بە پیرۆز دابنرێت، بابەتی لە گۆڕان هاتووە.

مزگەوتیش بەتەواوی وەكو دێر و پەرستگە و كڵێسا، شوێنێكە بۆ پەرستاری. شوێنێكە بە ئاسۆدا بەرزدەبێتەوە و بڕواداران وا سەیری دەكەن كە پیرۆزە و لە ڕەگەزە دنیاییەكانی دەوروبەری جیاوازو لەپێشترە. ئەو لەبەر ڕەوشە خاوێنەكەی دەكرێ لە پشتێنەی وشە و كردەوەكانی بڕوادار

فراوان بكاتەوە، لەو كاتەدا كە لەوێ ئەنجامیان دەدات.بۆیە ئەگەر هەر گۆڕانێك خرایە سەر چەمكی تەقلیدییانەی مزگەوت و مۆركە پیرۆزەكەی، ئەوا پیشە بنچینەییەكەی مزگەوت دەشێوێت. لەبەر ئەم هۆیە دیزاینی بیناكەی و فۆرم و خەسڵەتە تایبەتییەكانی بە گومەز و منارە و میحراب و مینبەرەكەشیەوە، هەمیشە بەپێی ئەو وێناتەلارسازییە ناسراوە بوونیاد دەنرێتەوە كە چەندان سەدەیە لە ئەنجامی چەندبارەبوونەوەی بەردەوامی خۆیەوە لە زەینی تاكەكاندا چەسپیوە.

مزگەوتیش وەك كارە ڕەوانەكانی تری گرێدراو بە هەر ئاینێكەوە، بەشێوەیەكی نەریتی سەنتەرگیرییەكی لەناو ئەو گروپانەدا وەرگرتووە كە لە شارولادێكاندا نیشتەجێن. ئەم شێوە بینایانە بەلای بڕوادارەكانەوە بەردەوامبوونی ئەو بەهایانەی نواندووە كە ئامادەگییەكی پیرۆزی لە شوێنی پەرستاریدا مسۆگەری دەكات. زۆرجار لایەنی دەروونیی شوێنی پەرستاری، كە یادەوەری و هزرە وەرگیراوەكان و هەستە تاكەكەسی و كۆمەڵییەكان بەیەكەوە دەگرێتەوە، بەلای مێژوونوسانەوە بە هەند وەرناگیرێت، ئەگەرچی ئەوەش ڕەگەزێكی دەوڵەمەند و ئاوێتەو گرنگی ناو ڕەگەزەكانی مێژووە. لەباری مزگەوتدا و لەپاڵی هەڵوێستە نەریتی و چەسپیوەكانی بڕواداران بەرامبەر بە هەر شتێك كە بە پیرۆزی دەزانن، ڕێبازێكی نوێ هەیە بۆ نزیكبوونەوە لە مانای "پیرۆز" كە بەپێی لۆژیك كاردەكات و ئەو لایەن و گۆڕانكارییانە ئاشكرادەكات كە تێگەیشتنیان ئەستەمە بەلای ئەو كەسانەوەی بڕواكەیان لەسەر بنەمای ئەو دڵنیاییەیە كە بەرامبەر بە هەر هەڵسوكەوتێكی تر گومانی لەلا دروستدەبێ.كەواتە هەلی تاوتوێكردنی شوێنی مزگەوت لە كۆمەڵگەی ئیسلامیدا، هەلێكی گەمارۆدراوە لەنێوان ئەوەدا كە یان ئەو گۆشەنیگایەی بڕواداران پەسەند بكەیت كە بە نەریتەكانەوە گرێدراوە و ئەمەش گۆشەنیگایەكە هەر ئەوشتە دووبارە دەكاتەوە كە وەك "پیرۆز"تێیدەڕوانن، یان هەوڵی شیكردنەوەی هەست و بیروباوەڕەكان بدەیت لەو ڕێگەیەوەی كە بیانخەیتە بەر ڕوانینی مێژوویی، سۆسیۆلۆژی، ئەنترۆپۆلۆژی و دەروونی.

لەچێوەی هەر گروپێكی كۆمەڵایەتی-كەلتوریی دیاریكراودا، چەمكی "پیرۆز"بەپێی وەڵامدانەوەی ئەو گروپە بە بارودۆخە مێژووییە گۆڕاوەكان پێناسە و سنور و ڕۆڵەكەی دەگۆڕێ. بەمشێوەیە خەڵك (ئەكتەرگەلێكی كۆمەڵایەتین) واتە لە یەك كاتدا ڕۆڵگەلێكی جیاواز دەبینن. بۆ نمونە كاتێك كە بڕواداران بۆ نوێژكردن دەچن بۆ مزگەوت ئەوا ئەمان بە یەكسانی لەگەڵ كۆمەڵە ئەندامێكی تری كۆمەڵگەدا لە بینای مزگەوتەكەدا هاوبەش دەبن كە لەوانەیە بوونیان لەوێ بۆ چەند بەهانەیەكی سیاسی یان كۆمەڵایەتی بگەڕێتەوە. لەسەر ئاستی كەسێتییش نوێژكەرەكان بەڕێگاگەلی جیاواز كارلێكیان لەگەڵدا دەكەن و ڕۆڵی جیاواز دەبینن. بۆیە لە گەرمەی هەوڵی ئەنجامدانی لێكۆڵینەوەیەكدا لەسەر مزگەوت وەك فەزایەكی پیرۆز لە كۆمەڵگەی نوێدا، پێویستە لەسەرمان ئەم لایەنە بەیەكداچووانەی خوارەوە لەبەرچاو بگرین:

1-ڕۆژژمێری مێژوویی.

2-میتۆدی ئەنترۆپۆلۆژی.

3-شیكردنەوەی سیمیۆلۆژییانە.

4-خەملاندنی چۆنیەتیی بەدەستهێنانی شەرعیەت لەلایەن دەسەڵاتەوە.

هەموو ئەم لایەنانە كە دواتر بەدرێژی باسدەكرێن، یارمەتیمان دەدەن لە ڕوونكردنەوە و

گوزارەکردنی سەر وەرچەرخانەکانی پیرۆز. هەروەها چێوەیەکمان پێشکەش دەکەن بۆ رۆژبەندیکردنی تەواوی مەسەلەی ئاین، وەك دیاردەیەك و ڕۆڵە گۆڕاوەکەشی لەناو کۆمەڵگەگەلێکدا کە زیاتر وا دێنەپێشچاو دەبنە عەلمانی و لەڕووی کۆمەڵایەتیشەوە پەراش پەراشن.

هەر لەسەر تێزی مزگەوت و کۆمەڵگە ئیسلامییە هاوچەرخەکان، ئەم ئەرکە ئەنجامدانەکەی بەشێوەیەکی تایبەت ئەستەم دێتەپێشچاو.لەبەرئەوەی فیقهی ئێستا لە لێکۆڵینەوە ئیسلامییەکاندا پتر مەیلی بەلای ئەوەدا شکاوەیە کە سەرچاوەدەقییەکان شی بکاتەوە و راڤەبکات، لەوەی بێت گرنگی بداتە ئەو مانا و بەهایانەی بە مزگەوتەوە گرێدراون. ئەم شتەی دواییش پێویستی بە هەڵسەنگاندنێکی رەخنەگرانە هەیە، لەبەرئەوەی هەرچی کۆمەڵگەی ئیسلامی هەیە لە شیکردنەوەی مانای بۆماوەیی نەریتە ئیسلامییەکان و مێژووی کۆندا لەگەڵ قەیرانێکی گشتیدا ڕووبەڕوودەبنەوە، لە ئەنجامی ئەمەوە ئەرك و بەکارهێنانەکانی ئەمڕۆی مزگەوت بۆ کۆمەڵە مەبەستێکی تری بەدەر لە پەرستیاری، سەلماندنێکی بۆئەوە تێدایە کە شکانێك لەو پەیوەندییە پەسەندەدا هەیە کە بەشێوەیەکی نەریتی تاکەکەسی بڕوادار و شوێنی نوێژکردنەکەی پێکەوە دەبەستێتەوە.

## رۆژبەندییەکی مێژوویی

لە هەر هەوڵێکدا بۆ دەستنیشان کردن و تێگەشتنی رۆڵی مزگەوت، پێویستە ئەو ڕەوشە لەبەرچاو بگیرێت کە لە ژیانی پەیامبەردا(درودی خوای لەسەر بێت) لە مەدینەدا باووبوە. لە ئاینی ئیسلامیشدا وەك هەر ئاینێك کە نوێ بێت مەسەلەی "پیرۆز" و رەوشە ئەپستمۆلۆژی وسروتییەکەی لە ساڵانی یەکەمی ئاینەکەدا مەسەلەیەك بووە گرنگیی خۆیی هەبووە. دەستدانە دروستکردنی مزگەوت بەلای ئەو گروپە ئیسلامییە تازە سەرهەڵداوەوە لە مەدینە، ئیمایەکی سیاسی و ئاینیانە بووە بەیەکەوە. قورئانی پیرۆز راست و ڕەوان ئاماژە بە گروپێکی کێبەرکێکار دەدات کە شوێنێکی پەرستاریکردنیان بۆخۆیان دروستکردووە، بۆئەوەی کێبەرکێی مزگەوتی "ئەلحەق"ی پێبکەن کە پەیامبەر "درودی خوای لەسەربێت" دروستی کردووە.هەر بزوتنەوەیەکی ئاینیی نوێ لە قۆناغی سەرهەڵدانی خۆیدا پێویستی بەوە هەیە شوێنەکان و بیناکان و سروتەکان و عورفەکان و شێوەی جلوبەرگەکانی بەشێوەیەك دابڕێژێت کە ناسنامەیەکی جیاکەرەوە بۆ گروپەنوێیەکەی دروست بکات و جیاوازبێت لە هەموو دەوروبەرەکەی، بەتایبەتیش لەوانەی لە هەمان جێگەدا دادەنیشن و هەر هەمان هێماکان بەکاردەهێنن و هەر هەمان سەرچاوەی دەق و چەمکیان هەیە. ئەم شتە بەسەر ئەو جولەکە و مەسیحییانەشدا پیادەبووە کە لەپێش ساڵی(622)ی زایینییەوە لە مەدینە نیشتەجێ بوون. گۆڕانی قیبلە لە (بەیتولمەقدس)ەوە بۆ (مەکە)و هەڵبژاردنی رۆژی (هەینی) وەك رۆژی موسڵمانان پاش ئەوەی کە (جولەکە–شەممە) و(مەسیحی– یەکشەممە) یان هەڵبژارد، نمونەی ئەو گۆڕانکارییانەن لەساڵە بەراییەکانی تەمەنی ئیسلامدا کراون.

هێنانەدیی ئامانجێك کە بریتییە لە بەدەستهێنانی پەسەندیدەییەکی بەرفراوان بۆ چەمکێکی دیاریکراوی پیرۆز ، کە ئەو چەمکە

بتوانێت دەستەڵاتی دنیایی و هێزی سیاسی بەدەست بهێنێت ، پتر لەوەی پشت بە ناوەڕۆك و بیرۆکە جەوهەرییەکانی چەمکەکە ببەستێت، پشت بە تێگەیشتنی باو و سەرنجڕاکێشیەکەی دەبەستێت.بە دەربڕینێکی تر شێوە سەرەتاییەکەی مزگەوت کە بریتییە لەماڵێکی نوێژکردن پانتاییەکی هەیە، سروشتێکی "پیرۆز"ی وەرگرتووە، ئەمە لەبەرئەوە نییە کە لەسەر مۆرکێکی دیاریکراو بونیادنراوە یان دروستکراوە، بەڵکو لەبەرئەوەیە بەپێی تێپەڕینی کات و بەپێی ئەو ئەرکانەی بۆ بڕوادارانی ئەنجامدەدات ئەو پیرۆزییەی وەرگرتووە. چونکە چەمکی "پیرۆز" بەرهەمێکی ئەو چەمکە هاوبەشە باوانەی نێوان موسڵمانان و هاریکاریی نێوانی ئەندامانی گروپەکە بووە.

پێناسە (نەریتی، سیۆلۆژی، یان میتافیزیاییەکەی) پیرۆز، واتە ئەوەی کە پیرۆز شتێکی لەخواوە هەڵقوڵاو یان لەپێناوی خوادا بێت، ڕۆڵی ئەو ئەندامانە لە کۆمەڵگەدا بەهەند وەردەگرێت کە هەوڵ دەدەن چێوە ئاینییە هەمیشەییەکەی خۆیان بەقەرار بکەن، دیارە ئەمەش چەند بەهایەك دەگرێتەوە کە وەك بنەماکانی سیستمی سیاسی و یاساییش بەکارهێنراون. چەمکی "پیرۆز" بەلای موسڵمانانەوە راستەوخۆ بە وشەی "خوا"وە و بە سروشی نێردراو و نەرێکان و ڕێنماییەکانی و بە فەرمودەکانی پەیامبەر "درودی خوای لەسەربێ" و مانا و راڤەی فەرمودەکانی ئەوەوە گرێدراوە. بێگومان چەمکێکی لەمشێوەیەش لە دیزاینی بینادا داهێنانی ستاتیکی و تەلارسازی بەدوور نازانێت. لەبەرئەوەی داهێنانی لەمشێوەیە دەکەوێتە بواری تەلارسازییەوە و جیاوازە لەبیرۆکەی وەرچەرخانەکانی "پیرۆز" و هەر بە جیاییش دەمێنێتەوە.

بەپێی‌پێوەرە مێژووییەکانیش تەلاری مزگەوت لە شێوازەکانیدا فرچەشنییەکی زۆرمان پێشکەشدەکات، ئەو فرەچەشنییە هەڵقوڵاوی ناو کاریگەریی فاکتەرگەلێکی وەك کەشی کەلتوری و جیۆگرافی و ئامانجەکانی کەسی سەرپەرشتیار و کارامەیی کەسی تەلارساز و ئەو پیشەوەرانەیە کە بەکاری بیناکردنەکە هەڵدەستن. بەمشێوەیە هەر مزگەوتەو ڕەنگدانەوەی نەسەکێکی ئەپستمۆلۆژیی دیاریکراومان پێشکەشدەکات. ئەو نەسەکە چەمك و هەڵوێستە تاکەکەسییەکانی ئەو کەسانەی لێوە دەردەچێت کە بەشداریی دروستکردنەکەیان کردووە، ئەمەش وادەکات جۆراوجۆری لە خوێندنەوەو ماناکانیدا هەبێت.

## ڕێبازێکی ئەنترۆپۆلۆژی

بە پێچەوانەی زۆری سەردەمە مێژووییەکان و شێوازە جۆراوجۆرەکانەوە لەناو مێژووی سایکۆلۆژیای مرۆڤایەتیدا، دوو قۆناغی پەرەسەندن هەن کە زۆر بنەڕەتین و پێویستە بەهەند وەربگیرێن، ئەوانیش بریتین لە قۆناغی ئەپستمۆلۆژیای ئەفسانەیی بە هێماکانی و ئەو مانایانەیەوە کە تێیدان و قۆناغی ئەپستمۆلۆژیای نائەفسانەیی (واتە ئەپستمۆلۆژیایەك کە لەسەر بیرکردنەوەی ئاوەزکاری راوەستابێ). بەڵام لەگەڵ پارێزکردن لەوەی ئەو دوو قۆناغە هیچیان بە مانا کرۆنۆلۆژییەکە بەڕوونی دیاری نەکراون و دەکرێ لەناو چەند کۆمەڵگەیەکی تاك تاکدا بەدرێژایی ماوەیەکی زەمەنی بژین.ئەو شتەی من ناوم لێنا"ئەپستمۆلۆژیای ئەفسانەیی" لەسەر بنەمای خەیاڵ بەدەوری بینای"حەقیقەت"دا دەسوڕێتەوە،

نەك لەسەر بنەمای لۆژیکی ڕەخنەگرانەو پۆلینکردنی لۆژیکی.ئەفسانە چەشنێکە لە چیرۆکەکان (القصص) (زاراوەی القصص زۆرجار لە قورئانی پیرۆزدا دێت). لەشتی سەرسووڕهێنەر و نامۆو سەروی سروشتەوە دێت، ئەو "حەقیقەت"ەی ئەو باسیدەکات بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەگەڵ هەستەکان و خەیاڵدا دەدوێت. بەمشێوەیە کاتێك قورئانی پیرۆز بڕیاردەدات "ئیبراهیم خەلیل" کە یەکێکە لەو پەیامبەرانەی خوا کە سەر بە ڕابوردووی دوورن لە مەککە سەردانی کەعبەی شەرەفمەندی کردووە، کەسێك نییە گوێ بەوە بدات هۆی ئەو سەردانە چییە و کەی و چۆن بووە! مەبەستی سەرەکی لە ئەم شێوە وێنەیە ئەوە بووە کە لە زەینی بڕوادارانی وتەکەی پەیامبەری خوا "درودی خوای لەسەربێت" بیرۆکەی کەسێتییەکی ئاینیی ڕەمزی دروست ببێت کە پەیوەست بوونە ڕاستەوخۆکەی ئەو بە کەعبەوە، بتوانێت کۆمەکی سروشتە پیرۆزەکەی کەعبە لەلای موسڵمانەکان بکات و مانایەکی ئاینیی نوێی"ڕاستەقینە"، جێگەی پەیوەندییە وەسەنییەکانی کەعبە بگرێتەوە.دەکرێ نمونەیەکی تری تەریب بەم نمونەی وەرچەرخانی پیرۆزە لە سەردەمێکی زووی ئەو کاتانەدا ببینین کە موسڵمانەکان چەند پەرستگەیەکی لە ئیسلام کۆنتریان گۆڕیوە و کردوویانە بە ماڵی خوا.ئەم گۆڕانە سیمیۆلۆژییە – کە وەرچەرخانێکە لە مانایەکی ڕەمزیی ئەندامیی بەرقەراردا–لە ئەنجامی پێویستیە سرووت ئامێزی و بیروباوەڕە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی ئەو موسڵمانە پێشەنگانەوە هاتووە.نمونەی زۆری تری هاوشێوەی ئەم نمونەیە لە کتێبی پیرۆزی هەردوو سەردەم "تەورات و ئینجیل"دا هاتوون. پرۆسەی داماڵینی مۆرکی ئەفسانەییانە لە ئەپستمۆلۆژیا لە ئەوروپادا لە سەردەمێکی زووەوە دەستی پێکردووە کە بۆ سەدەی شانزەی زاینی دەگەڕێتەوە. بەڵام دەبوو چاوەڕوانی قۆناغە گەورەکەی پیشەسازیکردنی هەردوو سەدەی نۆزدەو بیست بکرێت بۆئەوەی ئەو پرۆسە هاوکاتەی پیشەسازیکردنەکە ڕووبدات کە نەسەکێکی ئەپستمۆلۆژیانە ڕووبدات تا فەیلەسوفەکان بەسەریدا زاڵ بن، نەك تیۆرکارە (تیۆریست) سیۆلۆژییەکان، بیرکاری و زانستە پراکتیکییەکان بەسەریدا زاڵ بن، نەك بیروباوەڕی ئاینی، پیادەکردنە تەکنیکییەکان جێگەی کارامەییە پیشەییە باوەکان بگرنەوە. سەدەی نۆزدە سەرەتاکانی هەرەسی بەها تەقلیدییەکانی کۆمەڵگە ئیسلامییەکانی بەخۆوە بینی، ئەمە پرۆسەیەك بوو چەند فاکتەرێکی دەرەکی هانی دا (هەردوو سەرمایەداری و ئیستیعماری ئەوروپی) هانییدا.دیارە ئەو هەرەسەش بەوە قەرەبوو نەکرایەوە کە چەند نەسەکێکی ئەڵتەرناتیڤی ئەو هەرەسە جێگەیان بگرنەوە کە لەناو خودی کۆمەڵگەکانەوە هەڵقوڵاوبن. بۆیە کاریگەرییەکەشیان وێرانکەرانە بوو. لەکاتێکدا هزرە سکولاریستییەکان لە ئەوروپادا پایەیان بڵند دەبێتەوە و جێگەی چەمکە تەقلیدییەکەی "پیرۆز"دەگرنەوە، کەچی لە جیهانی ئیسلامیدا بنچینە سیمۆلۆژییەکە ڕووخێنراوە و پاشتریش هیچ ئەڵتەرناتیڤێکی بونیادنەر نە بۆخۆی و نە بۆ ماناکەی نەهاتۆتە ئارا.

دەکرێ وا بڕوانرێتە بونیادنانی مزگەوتێك یان چاندنی زەوییەك، یان چنینی فەرشێك، یان وانەدادانی یاسا، یان فیقهی ئاینی، یان کارکردنی پزیشکی کە ئەمانە چالاکیگەلێکی شیاوی ستایشکردنن و دەچنە ریزی ئەو بوارە

سەراپاگیرەوەی روانینی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییەوە کە خواستی خوا وروژاندویەتی و پاشتریش مرۆڤ لە چەند تێزێکی سیمیۆلۆژیدا لەناو کایەی ئەپستمۆلۆژیای ئەفسانەییدا پەرەی پێداون. ستاتیکای مزگەوتیش کە لەناو ئەم بوارەدا دیزاین کراوە و بونیادنراوە، ناکرێ بە تەنها بدرێتە پاڵ سەرپەرشتیکردن و بەهرە تەلارسازیەکەی، بەڵکو چەند فاکتەرێکی دیکە هەن دەبێ لە هەڵسەنگاندنی بینایەکدا لەبەرچاو بگیرێن، بە هەموو ئەو مەسەلانەشەوە کە پەیوەندییان بەوەوە هەیە ئایا رۆڵە سروش بەخشەکانی بڕواداریی ئاینی و پیرۆز، کۆمەکیان بە ئەو بینایە کردوە یان لاوازیان کردووە.

لەتێزی ئەو کۆمەڵگە دێرینانەدا لەسەر ئەپستمۆلۆژیای ئەفسانەیی بەرقەراربوون، شتێك کە بە خەیاڵی کەسدا نەهاتبێت ئەوەبووە مزگەوتەکان لە دووری ناوەندەکانی نیشتەجێبوونەوە دروست بکرێن، لەبەرئەوەی شوێنی پەرستاری بەشێوەیەکی نەریتی و بەبەردەوامی لە نزیکەوە تێکەڵی ژیانی رۆژانەی هەر گروپێکی ئیسلامی کراوە. لە بەرامبەری ئەمەدا چەند مزگەوتێکی نوێ -وەك ئەوانەی کە ناوەناوە بە درێژایی کۆرنیشەکەی دەوری شاری جیددەدا دروستکراون – وەك چەند یەکەیەکی سەربەخۆ بونیادنراون. لێرەدا هیچ حوکمێکی بەهایی (قیمی) سەبارەت بە هیچ کامی تەلاری ئەم مزگەوتە هاوچەرخانە نادەم کە پەیوەندییان بە گروپە خۆجێییەکانەوە نییە، بەڵام سەرنج بۆ گۆڕانێکی گەورە ڕادەکێشم کە لە تێزە سیمیۆلۆژییەکەدا ڕوویداوە. پاشان بۆئەوەی مرۆڤ دادپەروەربێت ئەو نمونەیەی هەر ئێستا باسکرا، دەکرێ وا سەیری بکرێ کە ئەوە بەرەنجامی دیاردەیەکە پێشتر نەدەکرا وێنای بکرێ، ئەویش ئەو خۆشدەستییە خێرایەیە کە بەکارهێنانی بەرفراوانی ئۆتۆمۆبێل لە زۆری کۆمەڵگە نوێیەکاندا بۆ تاکەکانی رەخساندووە.

هەمیشە مزگەوت ڕۆڵێکی سیاسیانەی هەبووە، بەڵام لەبەرئەوەی بەهانە سیاسییەکان لەلایەن هەستی ئەفسانەییانەی ئەو ئەپستمۆلۆژیاوە هەڵمژراون کە گروپەکە تێیدا بەشدارن. بۆیە چەمکی "پیرۆز" جاران و ئێستاشی لەگەڵدابێت توانیویەتی و دەتوانێت رەنگی ئامادەگی و کاریگەریی خۆی بخاتە سەر هەموو ئەو چالاکی و ڕوداوانەی دەکەونە ناو مزگەوتەوە. نمونەیەکی مێژوویی باشیش لەسەر ئەمە هەیە، ئەویش گوتاری هەینییە کە جاران یەکێك لە کارە باوەکانی ناو ئەو گوتارە ئەوەبووە دوعایان بۆ خەلیفە کردووە، لەبەرئەوەی فەرمانڕەوا بووە. ئەمەش ئەگەر لەمیانەی پێوەرگەلێکی ئاوەزکاری و سکولاریستیی دروستەوە سەیری بکەین کارێکی سیاسییانە بووە، بەڵام لەتێزی ئەفسانەیی ئەو سەردەمەدا فەرمانڕەوا کەسێك بووە کە بە حوکمی پۆستەکەی پیرۆزیی بەبەردا بڕدراوەو، ڕۆڵی پارێزگاریکردنەکەشی لە ئیسلام وەك "پیرۆز" سەیری کراوە.

لە لێکۆڵینەوە نوێیەکەی (مسجد الدولة)دا (محمد ال سعد) ئەوەی ڕوونکردۆتەوە کە هەتا سەدەی نۆزدەش هێشتا دەکرا مزگەوت بەپێی نمونە ئەپستمۆلۆژییە ئەفسانەییەکە بونیادبنرێت. ناوازەیەکی دیاریش هەیە کە ئەویش (محمد علی)ی والیی میسرە، ئەم لە سییەکانی سەدەی نۆزدەدا وەك سەرکردەیەکی سیاسی بەشێوەیەکی پوخت هەوڵیدا وایپیشان بدات کە فەرمانڕەواییەکەی هێندە بەهێزە، بواری بدات لەناو قاهیرەدا مزگەوتێکی

هەڵبژاردە دروست بکات لەو مزگەوتانە بچێت کە سوڵتانە عوسمانییەکان لە سەدەکانی رابوردوودا دروستیان کردووە، دیارە دەستەڵاتەکەی ئەوانیش دەستەڵاتێکی سیاسی و ئاینییش بووە.

ئێستە دەتوانین بچینە سەرباسی ڕۆڵی گۆڕاوی مزگەوت لەناو جیهانی ئیسلامیدا، لەوکاتەوەی هەریەك لەو وڵاتانە سەربەخۆیی خۆی لە فەرمانڕەوایی ئیستیعمار وەرگرتۆتەوە. لە سەدەی هەژدە بەدوواوە لەژێر کاریگەریی رۆژئاوادا، هەڵوێستە نەریتییەکانی بەرامبەر بە ئەپستمۆلۆژیای ئەفسانەیی لەژێر کاریگەریی رۆژئاوادا روویان لە داخوران کردووە. ئەگەرچی کۆمەڵگەی ئیسلامییش بەشێوەیەکی گشتی نەچووە ژێر کاریگەریی ئەم پێشکەوتنەوە. لەسەرەتاوە چەند دەستەبژێرێکی شارنشینیی بچووك لەچێوەی چۆنیەتیی بیرکردنەوەو هەستکردن و راڤەکردنی بوونی مرۆیی و بەهانوێیەکان وانەدادران، بەڵام لە ناوچە گوندنشینییەکاندا کەلتور_بەمانا ڕەگەزییەکەی_ بەرەنگاریی هاتنی هێزە نوێیەکانی کرد، بەڵکو بگرە بەڕاستییش لە هەندێکی گروپە ڕەگەزی و کەلتوورییەکانی وەك (بەربەر و کورد)دا کە هەر دەستیان لە زمان و نەریتەکانی خۆیان بەرنەدا، هەتا کۆتاییەکانی چلەکان و پەنجاکانی سەدەی بیست، ئەپستمۆلۆژیای ئەفسانەیی هەر بەسەر ئەو کۆمەڵگایانەدا زاڵ بوو.

چارەنوسی دیاردەی نەتەوە– و دەوڵەتی تاك حزبی، کە وەکو هێزێکی سیاسیی نوێ لەپاش سەربەخۆبوونەوە دەرکەوتووە، وابووە کە گۆڕانێکی گەورە و خێرا بەسەر رەوشی کۆمەڵایەتی و کەلتوریدا بهێنێت، ئەمەش لەدەستدانی چەند نەریتێکی کەلتوریی خۆگرتوو و رەگاژۆی لێکەوتەوە، ئاپۆرەیەکی دەلالیانەی لێکەوتەوە. ئەمەش مانای وابوو ئەو هێماو ڕەمزە کەلتورییە هێنراو و ئەو گۆشەنیگایانەی دەستەبژێرە کۆمەڵایەتی و زاناکان بەکاریاندەهێنا، وازیان لەوە هێنا بەوشێوەیەبن کە خەڵکی ساکار لێیان تێبگات. ئەمەش پەرپووتبوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی لێکەوتەوە. بۆ نمونە ئەو شێوازە جیاوازانەی ئەمڕۆ لە دیزاینکردنی مزگەوتەکاندا لە هەرشوێنێکدا بەرجەستە دەبێ، پەیوەندییەکیان بە نەریتە کەلتورییە خۆجێییەکانەوە نییە. هێندەی ئەوەی مەسەلەکە لە مزگەوتدا پەیوەندیی بە چەمکی مزگەوتەوە هەبێت، ئەوا وا پێویستە ئەو ڕاستییە لەبەرچاو بگرین کە دەڵێت بە ڕەمزە تێکەڵکێشبووەکانی ناویەوە لەباری ئەپستمۆلۆژیای ئەفسانەییەوە نەیگواستۆتەوە بۆ باری ئەپستمۆلۆژیای زانستیی ئاوەزی (مۆدێرنە)، بەڵکو گواستیەوە بۆ قەوارەیەکی پەشۆکاو کە پێیدەوترێت ڕەسەنایەتیی ئیسلامی (بەگریمانی ئەوەی لەسەر بنەمای ئەو نمونەیە دروستدەبێ کە لە پەیامبەرەوە"درودی خوای لەسەربێت" وەرگیراوە و ئەو وەسێتی لەسەر کردووە). لەگەڵ چەند نوێشکێکی هەڵکێشراو لەتێزی ئەوەوە و لە پرۆسەی پەرەپێدانە نوێیەکانی ناو بوارە ئابوری و سیاسییەکان. من پێ لەسەر سروشتی ناڕێکوپێکی ئەو قەوارە ئایدۆلۆژییە دادەگرم کە لەم شتەوە کەوتۆتەوە و پاشتر لە شەستەکاندا دەوڵەتی نەتەوە و تاك حزبی پەرەیپێدا و سەپاندی، ئەمەش ئایدۆلۆژیایەکە لەو کاتەوەو لە دەوروبەری ساڵی (1979)وە لەلایەن بزوتنەوە سیاسییە بەئیسلامکراوەکانەوە رەخنەی لێگیراوە و رەتکراوەتەوە. (پێویستە جیاوازی لەنێوان بزوتنەوە بەئیسلامکراوەکان و بزوتنەوە

ئیسلامییەکاندا بکەین)، ئەو قەوارە ئایدۆلۆژییە کاری گەشتۆتە ئەوەی کە بەتایبەتی لە رۆژئاوادا وا سەیری کراوە کە "توندڕەوە".

لەم ڕەوشە ئایدیۆلۆژییە شێواوەدا هیچ کامی هزر و کەلتورە ئیسلامییە نەریتییەکە و مۆدێرنکردنەکەش، بەشێوەیەکی نوێ لەناو بوارە پۆزەتیڤ و هزرییەکانی خۆیاندا بەشێوەیەکی نوێ پەرەناسەنن بۆئەوەی پوختەیەکی نوێی هزر بهێننە کایە. بێگومان بەپێویست زانین و بونیادنانی مزگەوتە نوێیەکان و ئەو کەرەستانەش بۆی بەکاردەهێنرێن، لەسەر هەموو ئاستەکان ملکەچی کۆمەڵبەها و لەبەرچاوگرتنێکی ئایدیۆلۆژیی دژەیەك دەکرێن کە حکومەتی نەتەوە و دەوڵەتی تاك حزبی سەپاندونی. لە ژمارەیەکی سنورداری وڵاتەکاندا و لەم ساڵانەی دواییدا مزگەوتگەلێکی گەورە بونیادنراون کە پلەوپایەی فەرمانڕەواکان بەرزدەکەنەوە ، ئەو مزگەوتانەی لەم توێژەن لە ڕووی پراکتیکییەوە بانگەشەکردنی ڕەمزیی هێزن پتر لەوەی بەڵگەبن لەسەر گوێڕایەڵیی ئاینی و بڕواداری بن، پەرستاری ڕۆڵێکی یاریدەدەری هەیە. ئەوەی لەناو بەسکولاریستیکردنی ڕوو لەزیادی ئەم ئاسۆ پیرۆزانەدا ڕوودەدات، جۆرێکە لە لەسەر ڕێگەلادانی (حەق). ئەگەرچییش زۆری ئەو موسڵمانانەی بۆ نوێژکردن دەچنە ئەو مزگەوتانە، هۆکارێکی وایان نییە وایان لێبکات هۆشیان بەرامبەر بە ئەو هاندانە سیاسییانە هەبێت کە لە بونیادنانی ئەوماڵەدا هەبێت کە خوا فەرمانی فەرمووە لەسەر بنەمای پەرستاری بونیادبنرێت.

لە گەرمەی ئایدیۆلۆژیا و کەلتوری ئەو لاوانەدا کە بەشێوەیەکی دیمۆگرافییانە زۆرینەی نوێژکەرانی زۆری وڵاتە ئیسلامییەکانی ئەمڕۆ پێکدەهێنن، ڕووبەڕووی ئەو دیاردە دەروونییە دەبینەوە کە بە تێگەیشتنە باوەکەوە گرێدراوە. ئەندامەکانی ئەو وەچە زۆر لاوانەدا کە لە هەژارترین ناوچەکانی شارە زۆر قەرەباڵغەکاندا پەروەردە دەبن، کەلتورەکەیان جیاواز نییە لە کەلتوری هاوشێوەکانی خۆیان لە ناوچەی شارۆچکەنشینەکانی تەواوی جیهاندا. هێندەش من بزانم تا ئێستە لێکۆڵینەوەیەکی زانستی بۆئەوە ئەنجام نەدراوە کە هەڵوێستی لاوان سەبارەت بە (ئاین، پیرۆز، شەیدایی، نەزعەی ڕەوانی ڕوون بکاتەوە)، خەملاندنی منیش بۆ ئەمە ئەوەیە ئەمانە تا ئاستێکی زۆر مەسەلەی گرنگیدانیان بەم مەسەلانە لەدەستداوە. کەچی لە هەمان کاتدا مزگەوت بۆ زۆر جۆری تری چالاکی بەکاردەهێنرێت کە لەناو مزگەوتدا بە ناوی ئاینەوە ئەنجامدەدرێت. زیاتر لاوان گرنگی بەوە دەدەن کە سەبارەت بە بەدەستهێنانی هەلی کارکردن و نیشتەجێبوون و خۆشنودیی کۆمەڵایەتییە. باشە ئەگەر ئەم داوایانە هاتنەدی ئایا ئیتر مزگەوتەکان واز لەوە دەهێنن کە ڕۆڵێکیان لەناو کۆمەڵدا هەبێت؟ ئایا دەستپێشخەریی بونیادنانی  مزگەوتی نوێ لەئارادا دەمێنێت؟ بوونی ئەم گومانە بەردەوامە سەبارەت ئاراستە ئایندەییە گریمانەییەکان و لایەکی تری وەرچەرخانەکانی پیرۆزی ناو کۆمەڵگە ئیسلامییە هاوچەرخەکان دەنوێنێت.

## شیکردنەوەیەکی سیمیۆلۆژییانە

لەناو مزگەوتدا عورفێکی کەلتوریی دەوڵەمەند هەیە، بەشێوەیەکی بەرفراوان وەکو خۆی لەلایەن موسڵمانانەوە پەسەند دەکرێت. بۆیە فۆڕم و ڕەگەزە هەیکەلیی و ئاسۆکان و ئاسانکارییە جیاوازەکان لەم کایەیەدا گرنگییەکی کەمتریان هەیە لەو تەندروستی و سەلامەتییە مێژووییەی کە یەکەمجار

یەکەم مزگەوت بۆ خوای تەنها "ئەلحەق" کراوە و لە ڕێگای بوونی پەیامبەریشەوە"درودی خوای لەسەربێت" مۆرکی پیرۆزیی وەرگرتووە ، یان لەو مزگەوتانەی لە سەردەمەکەی پەیامبەر خۆیدا و لەمیانەی ئەو زانایانەوە بونیادنراون کە بەردەوام ڕێز و شایانیان تێدا وەرگرتووە، لەبەرئەوەی ئەپستمۆلۆژیایەکی ئاینیی قووڵ و نەزعەیەکی ڕەوانییان تێدا وەرگرتووە. چەندان فەقێی ناودار مزگەوتیان بەکارهێناوە. بەشێوەیەکی گشتی ئەوەش مەسەلەیەکی ئاساییە کە ئەپستمۆلۆژیای ئاینی و تەقوای تایبەتی دوو مەسەلەن لە یەکتر جیانابنەوە. هەر بەوشێوەیەش زۆرجار ئەولییا لە نزیکەی مزگەوتەوە بەخاك دەسپێردرێن ، واتە ئەوان پشتێنەی چێوەی پیرۆزییەکە بۆ ئاستێك درێژدەکەنەوە کە سنوری خوودی بیناکە تێدەپەڕێنێت. بۆیە دەکرێت بازاڕەکەی دەوروبەری مزگەوت یان فرۆشگە ساکارەکانی لادێ، بەشێك لە پرشنگی ئەو پیرۆزییە وەربگرن کە بە مزگەوتەکەوە گرێدراوە. بەلای ئەو کەسانەشەوە کە لەو سنورەدا کاردەکەن هەمیشە بوونی مزگەوت بەیادهێنەرەوەیەکی ڕەوشتی بەرز و خوا و پەیامبەر و ئەولیا و ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و فەرمودەی شەریفە، هەموو ئەم ڕەگەزانەش پێکەوە ڕۆڵێکیان لە ڕێکخستنی ژیانی کۆمەڵایەتیی ڕۆژانەدا دەبێت. ئەمە لە ناوەڕۆکدا ئەو تێزە سیمیۆلۆژییەیە مزگەوت پارێزگاریی لێدەکات کە پێماندەڵێت مزگەوت هەمیشە لە کۆمەڵگە ئیسلامییە نەریتییەکاندا نەك هەر تەنها بینایەکی ئاینی بووە، بەڵکو شوێنێك بووە بۆ ئاڵوگۆڕکردنی کەلتورییش کە تێیدا موسڵمانان بۆ نوێژکردن کۆدەبنەوە. بە دەربڕینێکی دیکە: مزگەوت وەك دامەزراوێك بنچینەیەکی کۆمەڵایەتی و ڕەوانیی ڕوونی هەیە.

بەڕاستی گۆڕانێکی گەورە لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا ڕوویداوە._گۆڕانێك کە سروشتە ئیسلامییەکەی دەخاتە ژێر پرسیارەوە_ لەبەر ئەم هۆیە بوو ئاماژەم بە ئەو شتە دا (کە پێیدەوترێت کۆمەڵگە ئیسلامییەکان) ئەو گۆڕانە هێندە گەورە بووە مانای پەیوەندیی نێوانی تاك و خوا و نێوانی پەرستیار و پەرستراوی کردۆتە بابەتێکی نوێی مشتومڕی فیقهی. ئەم مەسەلەیە بۆ یەکەمجار وەك بەرەنجامێکی ئەو دابڕانە گەورەیە ڕوویدا کە لە سەدەی هەژدەدا ڕوویدا، ئەو کاتە هاوسەنگییە نەریتییەکەی نێوانی فەقێکان و فەرمانڕەواکان گۆڕانێکی گەورەی بەسەرداهات. هەرلایەکیان ڕۆڵەکانی لاکەی تری زەوتکرد. ئەمجا لەبەرئەوەی کەسی وێناکار توانای ئەوەی نەبوو، ئەو کاتە لەناو ئیسلامدا "پیرۆز "و "سکولاریستی"لەیەکتر جیابکاتەوە، هێشتا بواری ئەوە هەبوو سەبارەت بەو گۆڕانکارییانە بەهانە بۆ خەڵك بهێنرێتەوە، بەڵام لە بەدبەختییە کە ئەمڕۆ ڕەوشەکە تەواو جیاوازبووە. ئێمە ئەمڕۆ لە زۆر وڵاتە ئیسلامییەکاندا ئەوە بەچاو دەبینین کە لەلایەن دەستەڵاتدارانی سیاسییەوە ئازادیی ئاینی کڵۆم دەدرێ. لەم بارەشدا لەلایەن کەسانی دەستەڵاتدارەوە وا سەیری هەر پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی نێوانی (زاناکان) دەکرێت کە پەیوەندییەکی بە سیاسەت تەییارکراوە، کەواتە ئەوە شتێکە پێویستە سەرکوت بکرێت. بەمشێوەیە فشارە سیاسییەکان دەبنە بڕیارلێدەری لەدەستدانی ئازادیی سیاسی.

پاشان لەبەرئەوەی مزگەوت فەزایەکی پیرۆزە، وا سەیری دەکرێت کە ئەو سەر بە هەموو ئەندامەکانی کۆمەڵگەی ئیسلامییە، هەندێ کەس بۆ بەدەستهێنانی چەند ئامانجێکی سیاسیی ڕوون

دێن ئەو پارێزگارییە بۆ خۆیان پاوان دەکەن کە مزگەوت بۆ ئەو کەسانەی دابین دەکات کە دەچنە نێوانی دیوارەکانی. خەڵکانێك هەن وا وێنای مزگەوت دەکەن کە ئەویٚ پەناگەیەکی ئەندامیی پارێزراوە لە سەرکوتکی وێناکراو، لەوانەشە خەڵکانێکی تر وەك خاڵێکی کۆبوونەوەی سیاسی، یان وەك خاڵێك و بەرگێك بۆ خەونەکانی خودی فەرمانڕەوایەك، یان گروپێك بەکارییبهێنن.

بەڵام ئایا ئەگەر مزگەوتێك بۆ مەبەستی پروپاگەندەیی لەمشێوەیە، یان وەك ئامرازێك بۆ پارێزگاری کردن لە دەستەڵات بەکارهات، ئایا پێویست دەکات ئەم کاروکردەوانە ببنە هۆی کەمکردنەوە لەو پایە ڕەوانییەی مزگەوت کە شوێنێکە بۆ پەرستیاری؟یان شوێنێکە بە سروشتێکی ڕەوانی پەیوەندییە کەسێتییەکانی نێوانی کەسی بڕوادار و خوا لەیەکتر نزیك دەخاتەوە؟ ئێمە کاتێك لە وەرچەرخانەکانی پیرۆز دەکۆڵینەوە، پێویستمان بە پرسیاری ئەوە دەبێت ئایا ئەو چالاکییە نائاینییانەی ئێستای مزگەوت کاریگەری لەسەر ئەو سروشتەی دادەنێت کە هەموو موسڵمانان وا سەیری دەکەن کە ئەویٚ خودی"پیرۆز"ە!

ئەو هێماو ڕەمزانەی لە ڕابووردوا لە ناو مشتومڕی ئاینیدا بەکارهێنراون، بەوە خزمەتی بڕوادارانی کردووە کە هانیداون بیربکەنەوە و بەدووای مانای قووڵتردا بگەڕێن، بەڵام لە بەشێکی گەورەی کارو کردەوەکاندا بڵاوکردنەوەی گشتیی ئەو دروشمە ئایدیۆلۆژییانە جێگەی ئەو هێماو ڕەمزانەی گرتەوە کە بوار بۆ گفتوگۆ کردن ناهێڵنەوە.

ئێستە وەك جاران نییە فێربوون پیشەیەك بێت تەنها بە مزگەوتەکانەوە گرێدراوبیٚ. ئێستە فێرکردنی گشتی لەلایەن کۆمەڵە قوتابخانەو زانکۆیەکەوە پێشکەشدەکرێت کە دەوڵەت بەڕێوەیان دەبات، ئەمانەش مەشقێکی تەکنیکیی زانستی "نویٚ"پێشکەش دەکەن کە هیچ کێشەیەکی میتافیزیایی یان فیقهی بە هەند وەرناگرێت، لە بەرامبەر ئەمەدا"زانایان"یش هەر وەکو ئەو کۆلیژانەیان کە تایبەتن بە شەریعەو فیقهەوە، ڕێبازە زانستییە نوێیەکان لە ڕەوتی خۆیان لادەبەن. ئێستا لەپاش بەهەندوەرگرتنی ئەو ڕێگا جیاوازانەی بەهۆیانەوە مزگەوت لە ڕۆڵە نەریتییە زۆرەکانی خۆی دوورخراوەتەوە، ئایا دەتوانین بەردەوام بین لەسەر ئەو وەسفکردنەی کە ئەویٚ شوێنێکی "پیرۆزە"؟؟

## خەملاندنی چۆنیەتیی بەدەستهێنانی شەرعیەت لەلایەن دەستەڵاتەوە

ئەو پێوەرانەی لەمیانەیانەوە حوکم بەسەر ڕۆڵی مزگەوتدا دەدریٚ بۆ باری کڵێسا و پەرستگەکانی تریش ڕاستن. ئەمڕۆ لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا قەیرانی مانا هەیە، لەبەرئەوەی ئەو ڕەگە ئارامگرتووانەی سەردەمانێکی زۆرە دەستەڵاتی ئاینی هەیەتی، لەلایەن ئەو ڕوانینە تاکڕەوانەوە بەجێهێڵراوە کە لەسەر ئەو بیرۆکە پۆست مۆدێرنەییانەوە دامەزراون کەوا دان بە بوونی چەمکی تەنها واقعێکدا نانێن و داوادەکەن سەرلەنویٚ هەڵسەنگاندنێکی وورد بۆ سنورەکانی نێوانی گۆڕەپانەکانی ئەپستمۆلۆژیا تایبەتمەندەکان بکرێتەوە. بەمشێوەیە لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکانی جاراندا شەرعیەت بە دەستەڵاتێکی حکومی دراوە کە تەنها بنچینەیەکی ئاینیی هەبویٚ و بەس، بەڵام لە سەردەمە نوێیەکاندا و سەرباری ئەوەش کە ڕۆڵی پەرستگاکان وەك سەرچاوەگەلێکی

داینـامیزمیی وزەی ڕەوانـی و ئەفرانـدن كزبـووە، هێشـتا موسـڵمانەكانیش _وەك بڕوادارانـی ئاینەكانی تر_ هێشتا هەست بەبوونی نزیكییەكی زۆری شوێنە پیرۆزەكان لەخۆیانەوە دەكەن، چونكە بەلای ئەمانـەوە ئـەو شوێنانە پاشماوەی خەسڵەتە جیاكـەرەوەكانی ئاینەكـەیان و ناسـنامە گشتییەكەیان دەنـوێنن. سـەرباری ئـەوەش، لەوێـدا كـە ڕۆڵـە زۆرەكـانی خـۆی وەك پەرسـتگا و تـەوەری دامـەزراوەیی گفتوگـۆكردنی مەسـەلە كۆمەڵایـەتیو ئاینییـەكان كـەم بۆتـەوە، گـۆڕاوە بۆئـەوەی ببێت بـە كۆمەڵـە پەناگەیـەك بـۆ پـەنابردنی سیاسـی. وەك ئەنجامێكی ئەمـە ئـیتر مزگـەوت وا سـەیری ناكرێـت كە سەرچاوەی ڕەهاو گشتگیری شـەرعیەتی ئاكاری و ڕەوانـی و هزریـی هەوڵـەكانی مرۆڤایـەتی بێت بـە هـەموو شـێوەكانیەوە. ئـەمڕۆ لـە ئـەمریكای باكور و ئەوروپادا ئەو ڕۆڵە بەزۆری بە كەسە سیاسییەكان و ئابوریناس و زاناكان دەسپێردرێ، دیـارە ئەمانـە ئەو كرۆكە پێكدەهێنن كـە ئـەو شـتە دێنێتـە بەرهـەم كـە بەگشـتی دەكـرێ وا وەربگیرێـت ئـەوە ڕاسـتییە. لـەم ڕەوشەشـدا هێـزە داراییـە گـەورەكانی جیهـان دەبنـە نوێنـەری چـەقی سیاسـی و ئـابوری. باڵادەسـتیی ئەمانـەش بـەوە گەلاڵـە دەبـێ كـە بـە ئـامرازە ئـابوری و زانسـتییە پێشـكەوتووەكان حەقیقەت بدۆزنەوە. وادەزانم ئەمەش لەو تاكڕەوییە پـتر زیـانی لێدەكەوێتـەوە كـە بەوشـێوەیەی لـەزۆری دەوڵەتـە ئیسـلامییەكاندا هەیـە لـەنێوانی ئـاین و دەوڵەتـدا ڕەخنـەی لێـدەگیرێ. ئەگەرچـی لەوانەیـە وادابنرێ ئەمەی دووایان هەڕەشـەیەك لـەناو بواری ئیسـلامیدا دروسـت بكـات، كاریگەرییـەكانی باڵادەستییەكە لەسەر ئاستی هەموو جیهان هەستی پێدەكرێت و لەماوەی درێژتردا دەبێتە فاكتـەرێك بۆ بڕیارلێدانی چارەنوسی هەموو مرۆڤایەتی بەگشتی.

بە دەربڕینێكی تر چەقە نەریتییەكانی دەستەڵات لە چـێوەی ئیسـلامدا كـە جـاران گرنگیـی بـە بـەها كۆمەڵایـەتی و مەسـەلە ڕەوانییـەكانیش داوە، ڕۆڵێكـی دیكـەی پێسـپێردرا یـان لەسـەر ئاسـتی پراكتیكی وەك دوا سەنگی مەحـەكی یەكلاكـەرەوەی مەسـەلە هـزری یـان كۆمەڵایـەتی و مەدەنییـەكان دورەپـەرێزخرا. لـە ڕاسـتیدا دووفاقییـەك كـە پەیوەنـدیی بـەو شـتەوە هـەبێت كـە لـەناو (دەوڵـەت/ نەتـەوە) ئیسـلامییەكاندا بـە دەسـتەڵاتی شـەرعی ناسـراوە، لـەو ڕێگایەدایـە كـە بەهۆیـەوە هـەڵاواردن نـەك هـەر لـەدژی بێگانـەكان دەكرێـت، بـەڵكو لـەناو كەرتـەكانی خـودی دانیشـتوانەكەی خۆشـیاندا دەكرێـت. ئـەوەتا لەكاتێكـدا ئـەم نەتەوانـە ملكەچـی ئەو پرەنسیپی لێبووردەییە دەكرێن كە لەناو هەموو ئاینەكانـدا هەیـە (بـە ئیسلامیشـەوە)، بـەپێی ئـەو لێبوردەییە مافەكانی هەموو خەڵك، بەچاوپۆشین لـە ڕەگـەز و ئـاین و نەتـەوەیان ڕێزیـان لێـدەگیرێت و دەپـارێزرێن. كـەم حكومـەت هەیـە بـە كـردەوە ئـەو پرەنسیپانەی پیـادە كردبێـت. لـەناو كـۆی هۆكـانی تردا تەنها لەبەر ئەم هۆیـە ناكرێـت سـەرلەنوێ بڵـێین ئەو سیستمە نەریتییانـەی فـەرمانڕەوایی كـە لەسـەر بنەمای ئاین دامەزراون، مۆركگەلێكی باشتریان لـەو مۆركانـە پێشـكەش كـردووە كـە دەوڵەتـە عیلمانییـە نوێیەكان پێشكەشی دەكەن.

ئـەو كەسـانەی پەرسـتگە و بیـاع و كڵێسـاو مزگەوتـەكانیان دروسـت كـردووە، هەریەكـەیان لەچـێوەی كەلتورەكـەی خۆیـدا بەشـێك بـووە لـە كەشـێكی كۆمەڵایـەتیی تێكەڵكێشـكراو. ئـەمجا لەبەرئەوەی ڕۆڵ و مانای ئـەو تـەلارە ئاینییانـەی كە لەلایەن تەلارساز و وەستا گەورەكانەوە بونیادنراون بەتەواوی ڕوون بووە، توانیویانە لە دیزاینەكانیاندا گـوزارە لـە مانـای لەمشـێوەیە بكـەن، لەبەرئـەوە

بەشداربیەکی گەورەیان لە شارستانیی سەردەمەکەیاندا کردووە. من وادادەنێم ئەمڕۆ پێویستییەکی زۆرمان بەوە هەیە سەرلەنوێ دان بە بوونی ئەو پەیوەندییەدا بنرێتەوە، بۆئەوەی بتوانین ئەو پەیوەندییە پتەوە ڕوون بکەینەوە کە لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا لەنێوان "پیرۆز و کۆمەڵایەتی و سیاسیدا" هەیە. دەکرێ بە ئەنجام گەیاندنی ئەم تێگەیشتنە نوێیە کۆمەکمان بکات لە گەڕاندنەوەی ئەو هەست بەیاساکردنەدا کە لە دەستمان داوە. بۆئەوەی بیگەڕێنینەوە ناو کۆمەڵگەیەك کە ملکەچی گۆڕانکاریی خێرا بووە. هەروەها بوار بە شوێنە نوێیەکانی پەرستارییش بدەین بەشێوەی تەلارێکی نوێ و گونجاو دیزاین و بینابکرێت.

## سەرچاوە

ماڵپەڕی (نزوی) لەسەر ئینتەرنێت.

لە وەرگێڕانێکی (کامل یوسف حسین)ەوە کراوە بە کوردی.

# پەیوەستی ڕەخنە بە ڕەهەندەکانی فەلسەفەوە

لە ئیسپانییەوە: حەمەی ئەحمەد ڕەسوڵ

فەلسەفە، زانستی یاسا گشتیەکانی بوونە/ بوونی سروشت و کۆمەڵگا/ هەروەها بیری مرۆڤایەتی و پرۆسێسی زانینە ( *Proceso del-Epistemo*) خەسڵەتە گشتییەکانی بریتییە لە هەمەلایی و یەکێتی و قووڵبوونەوە لە گەڕان بەدوای بنەماکاندا.. بەڵام ڕەخنە، هونەر و زانستە، لێکۆڵینەوەی شێواز و میتۆدە جیاجیاکانە، بەخشش و ئاسۆیە کە لە بیرکردنەوەی مرۆڤایەتی و جیهانی نووسین ڕۆشن ئەکاتەوە، لە خەسڵەت و ڕێبازەکانی ئەدوێت و پەیوەندی ئەدەب و هونەر و فەلسەفە بە چالاکییە بەرفراوانەکانی دیکەوە ئاشکرا ئەکات.. کە فەلسەفە بریتی بێت لە زانستی یاسا گشتییەکانی بوون و بیری هیومانیستی، دیار و ئاشکراشە کە ئاراستەکردنی ڕەخنەش پێك دێنێ..

ڕەخنە لە لایەن پیتۆڵ و بیریارانی فەلسەفەوە لەدایکبووە و باڵێکی گەورەی فەلسەفەی یۆنانی بووە.. ئەو بیریارەی بیەوێت پرۆگرامێکی فەلسەفیی بنیات بنێت، ئەبێت لایەك لە دونیای ئەدەب و هونەر و داهێنانە تاکە کەسییەکان بکاتەوە و هەر هیچ نەبێت پێویستە هەڵوێستی خۆی دەرببڕێ.

ئەگەر لەو بوارانەدا پێشنیاز و نوومایشتی نەبێت، هەر کەسێك نووسینەکانی بخوێنێتەوە بۆی ئاشکرا ئەبێت کە هەگبەکەی بریتیە لە پەرتەوازەیی و پەرشوبڵاوی.. هەرچۆنێك بێت! زۆربەی فەیلەسوفە مەزنەکانی پێش زایین، بۆچوون و بیروڕایان سەبارەت بە گەردوون و کۆسمۆس بە شیعر دائەڕشت..!

پێئەچێت کە پلاتۆ "کە ئێمە بە کاریگەریی عەرەبەکان ئەڵێین ئەفلاتۆن/ کە نازانم لە کوێوە هاتووە!؟؟" یەکەم بیریارێکی ڕەخنەگر بێت کە نووسراوەکانیمان لەم بارەیەوە بە تەواویی پێگەیشتبێت.. کە سەرەتا و ناوەرۆکی فەلسەفەکەی ئەمەیە ئەو شتانەی لەم جیهانەدا گۆڕانکاریی و ئاڵوگۆڕکردنیان بەسەردا دێت، بە گوێرەی شتە کامڵەکانی (جیهانی ئایدیاڵ)ەوە هاتوون. ئەو کورسییەی کە دارتاشێك ئافەریدەی

ئەکات نموونەی قەرەوێڵەیەکی تەواوە بە گوێرەی (جیهانی ئایدیاڵ/ بێهاوتا) بوونی ڕاستەقینە لە فەلسەفەدا تەنها لاسایی ڕاستیە تەواوەکانە، بێگومان لاساییکردنەوەش لە ڕاستی نزمتر و بێبەهاترە، واتە لاساییکردنەوە تەنها سێبەری شتە ڕاستیە نموونەییەکانە..

ئەبێ کاری شێوەکارێك چی بێت کاتێك تابلۆیەك ئەنەخشێنێت؟ یان مەبەستی شاعیرێك لە هۆنینەوەی هۆنراوەیەك چی بێت؟!

ئایا لاسایی جیهانی نموونەکان ئەکەنەوە، یان ئاخۆ ڕووداوەکانی ئەم جیهانە کۆپی ئەکەنەوە؟!

پلاتۆ (347 پ.ز) ئەڵێت؛ ئەمانە لاسایی جیهانی نموونەکان ناکەنەوە، بەڵکو لاسایی شتەکانی ئەم جیهانە ئەکەنەوە.. ئەوان لە بنەڕەتی کێشەکە دوور ئەکەونەوە.. ئیشەکەیان لە نەقڵێکی کتومت و لاسایی دەقاودەق زیاتر چیدیکە نییە، لەبەرئەوەیە وێنەی نیگار کێشەکە و هۆنراوەی شاعیرەکە بە کارێکی ڕاستەقینە دانانرێت.. شایستەی ئەوەش نین مرۆڤ باوەڕیان پێ بکات، ئەمەش پاساو و بیانوویەکی ئەپستمۆلۆژییە و سەر بە تیۆرییەکەی پلاتۆیە.

پلاتۆ، ویستی کۆمارێکی بێهاوتای دوور لە هەست و سۆز بنیات بنێ و تیایدا ئەقڵ دەسەڵات بگرێتە دەست، هەموو شتێك بۆ مەبەستی ئافەریدە بوون فەراهەم بێت، ئاکاری بەرزی مرۆڤیش ئەوە بێت کە لە ژێر باری نەهامەتیدا خۆی ڕاگرێت، ئەگینا مرۆڤ دەست بە هاوار و پاڕانەوە ئەکات گریان و کروزانەوەش لە سروشتی شیعرن و چەکی دەستی شاعیرن بۆیەشە ناتوانێت ڕاستی کێشەکان بە هێمنی و کارامەیی چارەسەر بکات..

پلاتۆ، بەوە شیعری ڕەتئەکردەوە کە گوایە ڕاستی (حەقیقەت) نییە و ناتوانرێت لە بواری زانستدا پەنای بۆ ببرێت، چونکە لە ناواخندا سۆزێکی زیانبەخش پەروەردە ئەکات و ناهێڵێت مرۆڤ بەرەو لوتکەی کامڵبوون هەنگاو بنێت.. ئەو دوو ڕەخنە و پاساوەش یەکەمیان: ئەپستمۆلۆژی بوو، دووەمیشیان ئاکاریی بوو.. هەردوو ڕەخنەکەش لە فەلسەفەیەکەوە هەڵقووڵابوون کە شرۆڤە و ڕاڤەی مرۆڤ و گەردوونی پێئەکردن..

هەر کاتێك ناوی پلاتۆ هێنرا، پێویست وا ئەکات ناوی ئارستۆش (322 پ.ز) لە یاد نەکرێت، ئەویان مامۆستا و ئەمیان قوتابی، هەرچەندە ئەو پێگگەیشتن و نۆرمە کۆمەڵایەتیە قۆرخی ئەوە ناکات کە ئارستۆی قوتابی بەرپەرچی مامۆستاکەی بداتەوە هەروەها ببێتە زانایەکی گەورەی جیهان..

ڕافاییل "نیگارکێش و هونەرمەندی گەورەی چەرخی ڕێنیسانس" ئەو جیاوازییەی نێوانیانی بە پەیکەرێك نەخشەکێشاوە، تیایدا پلاتۆ دەست بۆ ئاسمان بەرز ئەکاتەوە و ئارستۆش ئاماژە بۆ زەوی ئەکات.. لێرەدا مەبەستی ڕافاییل ئاشکرایە:

پلاتۆ لە بیرکردنەوەدا لە شتە هەست پێکراوەکانی دەوروبەر و جیهانی ماددە دوور ئەکەوێتەوەو بەرەو جیهانێکی ئایدیایی ڕووت مل ئەنێت، کەچی ئارستۆ پشت بە ئەزموونە واقیعیەکانەوە ئەبەستێت..

ئەو مۆدێلی بیرکردنەوەیە لای ئارستۆ، بۆ ئەوەبوو تا بتوانێت سروشت و یاسایەکانی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا بدۆزێتەوە، بۆیە ئەگەر بیویستایە لە ئەدەب بکۆڵێتەوە، بابەتە نووسراوەکانی ئەخوێندنەوە تاوەکو خەسڵەتە هەرە دیارەکانی دەستنیشان بکات و بڕیاری ئەوە بدات کە تا چ ڕادەیەك هەستی نووسەر ڕاست و پاك و کەڵك بەخشە..

بیرکردنەوەی ئارستۆ لەگەڵ پلاتۆی مامۆستایدا گفتوگۆیەکی گەوهەریی بوو، ئارستۆ بە نوسین و بەرهەمەکانی پلاتۆدا چووەوە و لە چوارچێوەیەکی دیکە دایڕشتنەوە، بۆ وێنە: "پلاتۆ وای بۆچوو بوو و کە هۆنراوە لە حەقیقەتەوە دوورە و هەست و سۆزێکی زیانبەخشە".. بەڵام ئارستۆ پێچەوانەی ئەو ڕایەی سەلماند کە "شاعیر گەر لە دەرخستنی ڕاستیەکاندا هەڵەی کرد نووشوستی ناهێنێ و هەرچۆنێك بێت بە هەڵەی گەوهەریی و سێنتەریی دانانرێت بەڵکو هەڵەیەکی لابەلاییە لە شیعردا و کارناکاتە سەر ڕاستگۆیی شیعریی"..

ئارستۆ، بە ئاشکرا لە سەرێکەوە جیاوازی لە نێوان پرۆسێسی زانستی و ڕاستگۆیی پیشەییدا ئەکرد و لە سەرێکی دیکەشەوە ئاسۆی دەرك پێکردنی ئەندێشە و ڕاستگۆیی شیعریی لە یەکتر جوودا ئەکردەوە، ئاوەهاش لێکۆڵینەوەکانی پلاتۆی لەم بوارەدا یەکالا کردەوە و دەریخست کە گەلاڵەی کێشەکان پەرشو بلاو و تێکەڵ و پێکەڵن..

سەرگوزەشتەی ئەو دوو مەزنە بیریارە، چیرۆکی دوو ڕەوتی گشتین لە بیرکردنەوەی مرۆڤایەتیدا، یەکێکیان ڕەوتی ئایدیایی و ئەوی دیکەیان ڕەوتی واقیعی، یان ئەتوانین بڵێین: چیرۆکی دوو میتۆد و پرۆگرامێکن لە بیرکردنەوەو بۆچووندا..

***یەکەم:*** میتۆدی ڕێبەدیکردن، کە ئاوێتەی مەسەلە جەنجاڵەکان شیئەکاتەوە کە بەلای مرۆڤەوە سەلماندیان دژوار و سەختە.

***دووەم:*** میتۆدی هەڵێنجان، کە لە دیاردەکان ئەکۆڵێتەوە، دووبارە بوونەوە و دیاریکردنیان بەرجەستە ئەکات، تا ئەگاتە ئەوەی یاساکانی مانەوەی لە قاڵبێکی ئەوتۆدا بۆ دابڕێژێت؛ ئەویش لە ڕێگەی تێبینی و سەرنجدان و گریمانەکارییەوە، بۆ نموونە: تاقیکردنەوە گرێمانەیەکە لە ڕێگەی ئەزموونەوە بەرجەستە ئەکرێت.. هەموو بیروڕایەکی ڕەخنە ئامێزیش سەر بە یەکێك لەو دوو میتۆدەن.

فەلسەفە کاریگەری خۆی بەسەر ڕەخنەی ئەدەبییەوە جێهێشتووە و لەم بوارەدا سروشتی ڕەخنە وایسەپاندووە کە سەربەخۆیی تایبەتی وەرنەگرێت: "هەر لە کۆنەوە زاراوە و چەمکە فەلسەفییەکان وەرئەگرێت و ئەگەر دەربارەی ئەم لایەنانە – گشت، بەش، کامڵی یاخود – یەکێتی و لاساییکردنەوە دووا لە ئەدەبدا، ئەوە ئەگەیەنێت کە ڕەخنە پشت بە فەلسەفەی میتافیزیکی بەستووە، خۆ ئەگەر ووتەزاکانی "ناچاری و شیاوی" بەکارهات ئەوا سەرچاوەی وەرگرتنییان ئەگەڕێتەوە بۆ سروشت..

بۆ دەرکەوتن هەر فەلسەفەیەکی نوێش، تێڕوانینێکی نووژەن سەبارەت بە ئەدەب و هونەر و هزر سەری هەڵدابێت، ئەوا بانگەشەی دامەزراندنی ڕێباز و تەوژمێکی نوێ ڕادێراوە، فەلسەفەی ژیریی واتە فەلسەفەی ئارستۆ و موریدەکانی.. ئەو بیریارانەی کاریگەری ئارستۆیان بەسەرەوە بوو لە دەموەختی ڕێنیسانسدا تا سەدەی هەژدە.. ڕێبازی کلاسیکیان خوڵقاندووە..

ڕۆمانسییزمیش، لە فەلسەفەیەکەوە سەری هەڵدا کە بە شانو شکۆی ئەندێشەدا هەڵیانئەدا و سنووریان بۆ دەسەڵاتی یاساکانی هۆش و ژیری دائەنا.. ڕۆمانسیزمەکان لە ژێر سایەی بیروڕای (ڕۆسۆ)دا ستایشی مرۆڤ و سروشتیان ئەکرد، چەوساندنەوەی کۆمەڵایەتی و کۆیلەیەتی بیرکردنەوەیان ڕەتکردەوە هەربۆیەشە لە بیرکردنەوە و بە قاڵبوون و ڕەها بەندی کلاسیزم وەڕسبوون و دەستیان بە بوژاندنەوەی ناخی مرۆڤ کرد؛ فەلسەفەی چەرخی نۆزدە ڕووبەڕووی زانست بۆوە،

ئەیویست وەکو زانست لە بەڵگەنامەکان جیانەبێتەوە، بۆیە فەلسەفەی (پۆزیتیڤیزم — *Positivism*) نەشونمایکرد و سەریهەڵدا کە ڕایگەیاند: "پێویستە واز لە هەوڵی دۆزینەوەی ئەو هۆکارانە بێنن کە میتای سروشت — ئەودیوی سروشت — بەسەر جیهاندا ئەیسەپێنێ" ئەو فەلسەفەیە ڕوو ئەکاتە جیهانی واقیع، ئەو بۆچوونانە هەر زوو لە ڕەخنەدا، لە ئەدەبدا، لە هونەر و هزردا ڕەنگی دایەوە و تەوژمەکانی (ڕیالیزم — *Realism*) سەریهەڵدا.

بێگومان سیمای هەر ڕێبازێك، شەقڵی ڕێبازێکی ڕەخنەییە چونکە لە هەر قۆناغێکی نوێدا ڕێبازە کۆنەکە بە شێوازێکی ڕەخنەیی ئاگادار کراوەتەوە..

ڕۆمانتیك ڕەخنەیەك بوو ئاراستەی کلاسیزم کرا، هەروەك چۆن ڕیالیزمیش ڕەخنەیەك بوو دژ و ئەنتی بە ڕۆمانسیزم.. سەراپای ڕێبازەکان لە سەرچاوەیەکی فەلسەفییەوە ئافەریدە بوون و لەیەك ئاستدا ئەڕواننە گەردوون و مرۆڤ و چالاکییەکانی بیرکردنەوەی مرۆڤایەتی.. واتە فەلسەفەی هەر بیریارێك، لق و پۆپی جۆراوجۆری لە ئەدەب و هونەر و ڕەخنە و هزردا لێئەبێتەوە..! وەکو چۆن تیۆفیل جۆتێ (ژۆتێ) لە فەڕەنسادا بانگی بۆ قوتابخانەی (هونەر بۆ هونەر)ی ڕائەهێشت، ئەو بیروڕاکانی لە (ئیمانۆییێل کانت/ *I. Kant* — 1804)ەوە وەرگرتبوو کە ئەیووت: "ناتوانین لە زانیاری و چۆنیەتی خودی شتەکان بگەین، بەڵکو هەر ئەوەندەمان لەسەرە کە ڕووکاری دەرەوەیان وێنابکەین!".

کانت، کاری هونەریی لە واقیع دائەبڕی و شێوەش لە ناوەڕۆك، هەروەها بە کردەیەکی ڕەها و موتڵەقی ناوزەد ئەکرد! هەروەها جوانیی وێنە و ئێستاتیکای بە مۆسیقا و نەخش و نیگارێك ئەبەخشی کە ناوەڕۆکی تیادا بەدیناکرێت کە ئەوەش — بە بڕوای کانت — ئەوپەڕی مەبەستە.. ئەمەش پاڵی بە نوێنەرانی گوێڕایەڵی فەلسەفەی کانتەوە نا کە هەڵگری مەشخەڵی هونەر بۆ هونەر و سیمبۆڵیزم — ڕەمزیی — بن..

تێکڕا فەلسەفە ئایدیاڵییەکان، هونەر و جوانیی لە شێوەدا بەدیئەکەن، لەم بوارەدا تەنها (هیگڵ — *Hegel*) نەبێت کە ووتوویەتی: "یەکێتی نێوان شێوە و ناوەڕۆك هێندە پتەوە کە بەبێ یەکتر هەڵناکەن و کار لە یەکدی ئەکەن.. بایەخدان بە ناوەڕۆك و هەڵوێستی تایبەتی نووسەر، تەنها لە هەگبەی فەلسەفەی ڕیالیزمیدا بەرچاو ئەکەوێت، بە تایبەتی "بوونگەرایی و سۆسیالیزمی" بوونگەرایی لە چەرخی نۆزدەدا و لەسەردەستی بیریاری دانیمارکی (کیرکەگۆر — کیرگجارد/ 1855) سەریهەڵدا کە فەلسەفەیەکە و بە پلەی یەکەم بە حاڵەتەکانی "مردن و نیگەرانیی و ترس و ڕاڕایی" مرۆڤەوە خەریکبوو!

دەبوایە ڕەشبینەکان هەڵوێستی خۆیان لە ڕێگەی وێژەوە دەرببڕن، بۆیە سارتەر ڕۆمان و شانۆییەکانی: "ئێڵنج و گەرداو و ڕێچکەکانی ئازادی و.. تاد)ی نووسی. هەروەها ئالبێر کامۆ: "نامۆ، پەتاسپیکە (طاعون)ی نووسی، ئەم کەڵە نووسەرانە میتۆدێکی تایبەت بە خۆیان هێنایە کایەوە، بۆ وێنە: سارتەر (شیکردنەوەی دەروونی بوونگەرا)ی فەراهەمکرد و بەسەر بۆدلێر و ژان ژینێ و فلۆبێردا پیادەی ئەکردن..

ئەوان لە بواری ئەدەب و هزر و ڕەخنەوە ئاشکرایانکرد کە: ئەرکی وێژە و نووسین تەنها دروستکردنی جوانی و شێوەکاریی نییە، بەڵکو پێویستە مۆدێل و مۆرکێك بێت لە ڕواڵەتەکانی

هەستی مرۆڤایەتی و پێویستە کەم تا زۆر، کێشەی پابەندی "مەسەلەی ئیلتزامی" تێدا بەدیبکرێت.. هەروەها سۆسیالیزمیش لە چەشنی بوونگەرایی، بایەخ بە ناوەڕۆك ئەدات هەرچەندە لە بنەمای فەلسەفیدا لێکدی جیاوازن.. بوونگەرایی فەلسەفەی تاکەکەسە و سۆسیالیزمیش فەلسەفەی کۆمەڵە، لەبەرئەوە پێویستە ناوەڕۆکی ئەو بابەتەی ڕووبەڕووی ئەدەب و هونەر و نووسین ئەبێتەوە لە ناواخندا و لەگەڵ بوونگەرایدا جیاواز بێت، ئەوەندەش کە بایەخ بە جیهانی دەرەوە و کێشەکانی کۆمەڵگا ئەدات، ئەوەندە برەو بە جیهانی ناوەوەی مرۆڤ نادات.

بەو شێوەیە بوارەکانی هزر و نووسین لەلایەك و ڕەخنەش بە گشتی لە لایەکی دیکەوە، پێبەپێی ئەو فەلسەفەیەی لێوەی دەرئەچێت، جیاوازن و ئەگۆڕێن.. لێرەوە بە کورتی پەیوەستی نێوان فەلسەفە و ڕەخنە لەم سێ شێوەیەی خوارەوەدا خۆیان ئەنوێنن:

1–پێویستە ڕەخنەگر، بیریار و زانایەك بێت، بەپێی فەلسەفەکەی بڕیاری تێگەیشتن و ئاراستەکردنی وێژە و هونەر و بوارەکانی نووسین بدات، چەشنی پلاتۆ و ئارستۆ لە کۆندا و سارتەر و پارت و هابەرماس لە دەموەختی نوێدا.

2–پێویستە ڕەخنەگر، پوختەی فەلسەفەیەك بێت، زادەی سەردەمەکەی خۆی بێت، وەکو چۆن (تیۆفێل ژۆتێ) هەڵگری بیروڕای (کانت) بووە و دامەزرێنەری ڕێبازی –هونەر بۆ هونەر– بووە، لایەنگرانی سیمبۆڵیزمیش –ڕەمزیی– هەر بەو شێوەیە...

3–ئەبێت ڕەخنەگر، چەمکی فەلسەفیی سەردەمەکەی بە پاڵپشتی زانست دابنێ.

ئەوسێ شێوەیەی باسکران، لەنێو یەکتریدا هەریەکەیان کار لەویدیکەیان ئەکات..

## سەرچاوە

*1-Enrique A. Imberto, La critica literaria Contemp – oranea, Madrid, 1997.*

*2-Alfonso S. Reyes, La Comunicacion masay Critica del filosofia, Barcelona, 2000.*

3–پاشکۆی ڕۆژنامەی *ABC*، ڕۆژی 2002/6/21.

# تیۆری ئەدەبی: پاش – پاش مۆدێرنیزم

## وەرچەرخانێكی نوێ لە گۆڕانی زانیاری هاوچەرخ

لە فارسییەوە: عادل محەمەد پوور

ئەگەر بتوانین نموونەیەك لە "چیرۆكی پاش مۆدێرن" لە دەهەكانی "هەفتا و هەشتادا" ناودێر بكەین، بێگومان ئەو بەرهەمە "سەد ساڵ تەنیایی" گابریل گارسیا ماركێزە"ە. لەم دەقەدا بەشێوەیەكی زۆر روون و ئاشكرا، دۆزە تەجروبییەكانی لەگەڵ بارودۆخی سیاسی و كۆمەڵایەتیدا، تێكەڵ كراوە. لە واقیعدا، شاكارەكەی "ماركێز" پڕ بە پێست نموونەیەكی باڵا و نواندراوە بۆ باشترین چیرۆكەكانی جیهان. "سەد ساڵ تەنیایی" رێبردە تەجروبییەكان، بۆ كەشف و دۆزینەوەی شێوەگەلی پێوەندی دووبارە لەگەڵ جیهانی دەرەكی "چیرۆك و زمان"، بەكار دەبات.

"سەدساڵ تەنیایی" لە فرە لایەنەوە بە روانینە جادوویی و ماكە "سوور رێئال" و باقی رەهەندەكانی تر، وەك ڕۆمانێكی "غەیر واقیع گەرایانە" خۆی نواندووە. بەم حاڵیشەوە بەو هەموو ئەزموون گەرێتیەوە، "سەدساڵ تەنیایی" دەقێكە شیاوی خوێندنەوە، چیرۆكێكی پێوەندیدار و ئافرێنەری زۆربەی كەسایەتیە لە یاد ماندوەكانی دنیای ڕۆماننووسی. ئەم چیرۆكە پێداگرانە، لە بارودۆخێكی سیاسی و مێژوویی و رەوان ناسی، ئاوڕ دەداتەوە، كە لە ئەزموون گەرێتی ژیانی ئێمەدا تەوەرە دەژمێررێن. بەم جۆرە "سەد ساڵ تەنیایی" ئەو تایبەتمەندیانە، كە بۆ "پاش مۆدێرنیزم" دیاری كراوە، دەگرێتە خۆی: خۆئاگا بوون بە میراتی ئەدەبی خۆ، پەرەپێدانی ئەزموونگەرێتی تایبەت بە خۆ، پێداگری و جەخت لەسەر پێوەندی بەرقەراركردنی خوێنەران لەگەڵ دنیای دەور و بەریان بە لێكۆڵینەوەیەك لەسەر زۆربەی دەقگەلێك كە لە ساڵەكانی 1975 بەولاوە بەدی هاتوون، – نامەكانی بارت، جی ئارگدیس، زاڕوڵەكانی نیوەشەوی سەلمان رۆشدی، خاربۆتەی ویلیام كێندی،– دەتوانن هاوتا و لێكچووی یەك بە ئەژمار بێن. ئەم هاوتا تەجروبیە و تێڕوانینە سوننەتە ئەدەبیە، ئەكرێ لە زۆر لایەنەوە، روون بكرێتەوە. بەڵام ئەگەر رۆحی شۆڕشی گشتی، بێ بڕوایی و ناهێمنایەتی لە چەشنە چیرۆكە وروژێنەرەكانی "دەهەی شەست و هەشتا"دا، نواندرابا، بەم جۆرە

دەبوا داهاتە سیاسی، کۆمەڵایەتی کۆنەپەرەستانە، و موحافزەکارانەی کۆتاییەکانی "دەهەی هەفتا و سەرەتاکانی دەهەی هەشتا" بە ناچار لە ئەدەبیاتی ئەم خولە خۆی نواندرابا. ئەڵبەتە ئەم دیاردەیە، بە مانای ئەوە نییە، کە دانەرانی ئەمڕۆژی، لە چاو دە پانزە ساڵ پێش کەمتر، لایەنگری تازەگەری ئەدەبین. هۆکاری ئەم گۆڕانکاریە حەساسە، ئەبێ لەوپەڕی کەش و هەوای سیاسییەوە، کەشف بکرێ. کێشەکە ئەمەتە، بەگوڕبوونی ئەزموون گەرێتی، کە پێ دەچێ، زامنی مانەوەی ساڵانێك، لە ڕێبازی "پاش مۆدێرنیزم" بووبێ، کەوتە بەر قەمچی ورووژمی یەك لە دوای یەکی، داهێنەران و رەخنەگرانێك، وەك: (گاردنێر، کارۆر، گور ویدال، و گراف)ەوە. گرنگتر ئەوەی کە: شاهێتی سەرهەڵدانی دانەرانێکین، بە سانایی توانیان لە بەستێنەگەلی جۆراوجۆر و بە رەوش گەلی نوێکارانە، لەسەر چەمکی جوانکاری و واقیع گەرایی، دروست بەهەمان شێوەی کە "فۆتۆڕێئالیستەکان" لە هونەری شێوەکاریدا، کردبوویان، دووبارە پێناسە بکەن و لێی بکۆڵنەوە. ئەمە سیناریۆیەکی ئاشنایە: شۆڕشە هونەرییەکان تەمەنێکی سروشتییان هەیە و ناچار جێی خۆیان بە دۆخی هونەری تازە دەدەن کە داخوازگەل و پێداویستی و لێپرسراوانێکیان هەبووە، کە لەگەڵ شوور و شەوقی گرۆی پێشوودا هاوبەند نەبوون، کەڵکەڵەیان ئەمە بووە: بەشێوەی تاکی خۆیان، دووبارە ئاوڕێك لە پێناسەی خۆ بدەنەوە. بە ڕوانین لەسەر دەقگەلێك لە هەندێ لە نووسەران کە لە ساڵەکانی 1975 بەم لاوە نووسراون و زۆریش لە زەیندا کەوتوونەتە بەرچاو — دانەرانێك وەك: ران هانسن، یان ماك ئاوان، فێردریك بارتلمی، ڤیلیام کێندی، تونی موریسون، جین ئان فیلیپس، ئێستێفێن دیکسون، ریموند کارۆر و ئان بیتی — کە دەگەینە کەشفی حەساسیەتێکی جوانی ناسانە، کە لەگەڵ ئەو حەساسیەتە جوانی ناسانەی کە پێشتر نووسەرانی "پاش مۆدێرن" بناغەیان داڕشت بوو، جیاوازیەکی ئەوتۆی هەیە. حەساسیەتێك کە پێدەچێ راکێشراوی "واقیع گەرایی تەجروبی" —لە ڕوانگەی منەوە— بێ. مەبەستی من لە "واقیعگەرایی تەجروبی" ئەو چەشنە ئەدەبە چیرۆکییەتە کە لە ئەساسدا لە نێو دڵی خودی دۆزەکانی واقیع گەراییدایە، بەڵام لە پانتایی ڕواڵەتدا، ڕێ بردە تازەگەرییەکان، دەنوێنێ. وەك: (چیرۆکەکانی بیتی، کارۆر و بارتلمی کە کۆتایەکی باز و والآیان هەیە و دەقگەلێك لە "سیلیمن" کە کەسایەتی و پێ رەنگیان نیە)، و یان ئەو دیاردە نوێ خوازییە کە لە زماندا روو ئەدات (پەخشانی شاعیرانەی "فیلیپس" یان "ماکسین هۆنگ کینگستۆن" یان "مریلین رابینسۆن" یان "کولاژ" — تێکڕا داڕشتەکانی "سیلیمن")، یان ئەوەی تازەگەری لە کەڵك وەرگرتن لە دەستمایە غەیر ئاساییەکانە (وەك کەڵك وەرگرتن لە دەستمایەکانی "لێك هەڵچوو، درهم ریختە" یان دەغەڵکاریە ئەفسانەییە مێژووییەکان لای "هانسن، کێندی، لێزلی سیلکۆ، و کینگستۆن)، و.. ئەڵبەتە خوڕبوونەوە و بەرەو خواربوونەوەی "ئەزموونگەرێتی، تەجروبەگەرایی" لە فرەلایەنی ترەوە، پێکهاتەی ئاشنایی پتری ئێمەیە لەگەڵ ڕێ بردە تازەگەرییەکاندا کە سەردەمێك بۆمان زۆر دژوار و نامۆ بوون. بۆیەکانێ، چیرۆك گەلێك کە پاشتر ئەم ڕێ بردە ئەزموونگەرێتیەیان بەکار دەبرد، ئاشناتر و کەمتر مەترسی هێنەر و ورووژێنەر ئەیاندایە بەرچاو، کەمتر پرشەیان دەنواند — کەواتە ئیتر بە هیچ کلووجێك وەك ئاسەواری تەجروبی نانوێندرێن. نموونەی بەرچاو: (دنیا لە روانینی گارپ) بەرهەمی "جان ئێروینگ" کە لە روانگەی زۆربەی خوێنەرانەوە، رۆمانێکی "تەجرۆبی" ناژمێررێ. هەرچەند لەم دەقەدا

ئەوپەڕی "تەکنیکی پەڕ چیرۆکی، فراداستانی" کەڵك وەرگیراوە – کتێبێك لە نێو دڵی کتێبێکا، تێك ئالآوی چیرۆك و واقیعیەت، خۆ– گەڕاندنەوەی بازی گەرانە و گەڕانەوە بۆ بەرهەمە پێشوەکانی دانەری دەقەکە – کە دەقە رادیکاڵەکانی تر لە دەهەی شەستدا بەکاریان دەبرد. ئەم وتە بە مانای ئەوە نیە بڵێن: دەقەکەی (ئێروینگ) دەقێکی تەجرۆبی یان پەڕ (فرا) چیرۆکی نییە. – ئەڵبەت کە ئاوایە، بەڵام لەم ڕوانگەوە، چەسپاندنی ئەم سیفەتە بۆ ئەم دەقە، لاوەکی و غەیر سەرەکی دەبێ. ئەم خاڵە لەبارەی زۆربەی بەرهەمە بەنرخەکانی چیرۆك لە ساڵەکانی 1975 تا 1984 کە لە ئامریکایش بڵاوکراونەتەوە، دەچەسپێ. کتێب گەلێ وەك: "لە دووی کاچیاتۆ" بەرهەمی "تیم ئۆبراین"، پشیلەی دارکنۆیل" بەرهەمی "ئێلێکساندێر ترۆکس"، "سبتی" بەرهەمی "جان بارت"، "جێکەوتوو" بەرهەمی "ئان بیتی"، "سابقەدار" بەرهەمی "کورت فونە گوت"، "غەزەلی سلێمان" بەرهەمی "تونی مۆریسون"، "سێ کانەی ئابانی" بەرهەمی "ڤیلیام کندی"، "بەسەرهاتەکانی کە لە ئەستێرەی کلکداری هالی" بەرهەمی "جان کالوین بچلۆر" – تەنیا وەك نموونە– ڕێ بردە تەجروبیەکانی "پاش مۆدێرن" بە چەشنێك لەگەڵ داڕشتنی دەقەکانی خۆیان، جوانکارانە، تێکەڵ کردووە کە زۆربەیان خاوەن شێوازی سوننەتی دەژمێررێن. هەروەها ئاسەوارێکی تەجروبی "رادیکاڵتر" دەنووسرێن، بەڵام سەرەڕای ئەم جیاوازییە بەرچاوانە، – زۆربەی کتێب گەلێك کە لەلایەن "پەخشکاری فیکشن کالتیۆ" وە بڵاوکراونەتەوە، تەجروبە پەخشانیەکانی "ران سیلیمن"، "لی هجینیان"، بەرێت واتێن"، "چارڵز برنشتاین"، "پلاس" بەرهەمی "جۆزێف مەك ئێلرۆی"، "قورمە سەوزی" بەرهەمی "گیلبێرت سۆرتینۆ"، "ڕۆمانەکانی پانکی"، "کتی ئێکێر" و بەرهەمەکانی "والتێر ئێبیش" – زۆربەی چیرۆکە گرینگەکانی "دەهەی هەشتا، نە تاکی تەجرۆبی، بە چەشنێکی روون و ئاشکرا و خۆ نوێنەرانە، بوون، نە لە چەمکی واقیع گەرایانە و سوننەتی، دەق گەلێکی "بازنومایانە" دەژمێررێن. هەر ئەم بار و دۆخیشە دەتوانین لە چەشنە "هونەرەکان"ی تردا هەست پێ بکەین کە لەوانەدا، مەنهەجگەل و ڕێکارگەلی نوێ و پێشکەوتوو، لە لایەن هونەرمەندانی سەردەمێکەوە، لە پێش چاو گیراوە (بە فەرز، کرتان لە بازنومایی و پێرسپێکتیوی تاك تەوەری لە هونەری شێوەکاریدا) بەرە بەرە لە لایەن هونەرمەندانی نەوەی داهاتوو، وەرگیراوە، دەرەنجامی بووەتە وەستانێکی سەردەمی تازە، کە لە کۆتاییدا "شۆڕشێکی" تازەی بە دوودا بووە. کەوابوو، لە ڕاستییدا گۆڕانکارییش بەردەوام لە "هونەر"دا، وەك باقی شێوەکانی تر کە بێ وچان، چۆنیەتی (ماهیت) واقیعیەت (و چۆنیەتی ژیانی ئێمە لەم دۆخە وروژێنەرەدا) شکڵ دەدەن و ئاوەژووی دەکەن – ئاسوودە لە تامەزرۆی رەخنەگران بە ئولگووە راشکاوەکان – روو دەدات.

## "سەدساڵ تەنیایی"

ئەو تایبەتمەندیانە، کە بۆ "پاش مۆدێرنیزم" دیاری کراوە، دەگرێتە خۆی: خۆئاگا بوون بە میراتی ئەدەبی خۆ، پەرەپێدانی ئەزموون گەرێتی تایبەت بە خۆ، پێداگری و جەخت لەسەر پێوەندی بەرقەرارکردنی خوێنەران لەگەڵ دنیای دەوروبەریان.

## سەرچاوە

لە کتێبی ئەدەبیاتی پەساموٚدێرن، نوسینی پەیام یەزدانجوو، ل 40–36.

# ئاین و واتا

## ماڵکۆڵم هاملتۆن

لە فارسییەوە: یاسین عومەر

هەروەك بینیمان، ڤیبەر لە بنەڕەتدا ئاینی بە فەراهەمکەری ئاڕاستەکەری مەزهەبی لەپێناوی بەختی باش‌و بەختی خراپ دەزانی. هەرچەندە ئەم مەسەلەیە لەزۆر ڕووەوە، زۆرتر ڕێبازێکی دەروونناسییە تا کۆمەڵناسی، بەڵام ئەو گونجاندنەی ڤیبەر لەنێوان ئەم دیدەی کە پێکهاتووە لە ڕەگەزە ئەقڵی و سۆزدارییەکان لەگەڵ شیکردنەوەیەکی لە بنەڕەتدا کۆمەڵناسییانە بۆ پەیوەندیی نێوان بیروڕاکان و دەستە کۆمەڵایەتییەکان دروستیدەکات، دەیکات بەیەکێ لەو پێشەنگانەی کە هەوڵیانداوە دیدی ڕێبازە تیۆرییەکانی پێشوو، پێکەوە بگونجێنێ. پیتەر بێرگەر یەکێك لەم پێشەنگە کاریگەرانە بووە کە وەکو ڤیبەر، ئاین بە یەکێ لە سەرچاوە سەرەکییەکان دادەنێت کە مرۆڤەکان لە چەرخ و سەردەمی جۆراوجۆردا کۆشاون تا لە ڕێی ئەوەوە مانا بە بوونیان بدەن. بەڵام یەکێ لەو کەسانەی کە ماوەیەك بەر لە ڤیبەرو بێرگەر پشك‌و بەشدارییەکی گرنگی لەم مەسەلەیەدا هەبوو، کلیفۆرد گێرتس بوو کە وەکو ئەو دووانە جەختی لە مانای ژیان دەکردەوە.

## ڕوانگەی کلیفۆرد گیرتیس دەربارەی ئاین‌و واتا

سەرچاوەی سەرەکیی بیرە تیۆرییەکانی گیرتس سەبارەت بە ئاین، وتارەکەیەتی بەناوی ((ئاین وەکو سیستەمێکی کلتوری)) (1966) کە تیایدا، ڕەهەندی کلتوریی ئاین شیدەکاتەوە. گیرتس، وەکو بەشێك لە سیستەمی کلتوری، دەڕوانێتە ئاین. مەبەستی گیرتس لە کلتور، "نمونەی چەند مانایەکە کە هاوتەریب لەگەڵ مێژوودا دەگوێزرێتەوەو لەڕێی هێماکانەوە بەرجەستە دەبێت، یان سیستەمێکە لەو چەمکانەی کە بەمیرات بۆ مرۆڤەکان دەمێنێتەوەو بە شێوەگەلی هێمایی دەردەبڕدرێت" (لاپەڕە 3) بەقسەی گێرتس،

ئاین وەك بەشێك لە كلتور سەروكاری لەگەڵ هێما پیرۆزەكان و كاركردنەكانیدا هەیە.

"بۆ ئەوەی روحییاتی مرۆڤ، واتە عەزم و ئیرادە، تایبەتمەندی و چۆنییەتی ژیان، شێوازیی ئاكاریی و جوانیناسی و باری ژیانیان، لەگەڵ دنیابینییەكانیاندا، واتە ئەو تەسەورەی لەسەر واقیعیەتی كاركردی شتەكان هەیانەو بەرفراوانترین ئەندێشەكانی ئەوان سەبارەت بە سیستەم، ئاوێتە بكات." (لاپەرە 3)

كەواتە دەبینین گیرتس دوو رەگەز لەیەك جیادەكاتەوە، یەكێكیان روحییاتی مرۆڤەكان ئەوی تریان دنیابینییان. هێما پیرۆزەكان، یان بە دەربرینێكی تر هەمان ئاین، لە دروستبوونی روانینی مرۆڤەكان بۆ جیهان و پەیوەستكردنەوەیان بە رۆحییاتەكانیان، رۆڵێكی گرنگی لەئەستۆیە. هێما پیرۆزەكان روحییاتی مرۆڤەكان لەرووی ئەقلیی و لۆژیكییەوە پیشاندەدەن، لەبەرئەوەی ئەم رۆحییاتە وەك شێوازێك لە ژیان نیشاندەدەن كە لەگەڵ ناوەرۆكی دنیابینیی ئەوان گونجانێكی ئایدیالی هەیە. بە دەربرینێكی تر، دنیابینیی مرۆڤەكان وەلامدەرەوەیە، چونكە بەجۆرێك دروستبووە كە لەگەڵ شێوازی كرداریی ژیاندا دێتەوە.

كەواتە، روحییات و دنیابینی یەك جەخت لەوی تر دەكاتەوە. "هێما مەزهەبییەكان لەنێوان شێوازێكی دیاریكراو لە ژیان و جۆرێك میتافیزیكای تایبەتدا گونجانێكی بنەرەتی دادەمەزرێنێت و بەم شێوەیە، هەر یەك سوود لە سەرچاوەكەی تر وەردەگرێت" (لا4). گیرتس بەپێی ئەم بۆچوونە دەگات بە پێناسەیەك بۆ ئاین كە زیاتر لە تیۆری كورتكراوەی ئاین دەچێت. لە بەشی یەكەمدا بینیمان كە پێناسەكانی ئاین زۆرتر بەشێوەی شاراوە ئارەزووە تیۆرییەكان دەردەبڕێت. بەقسەی گیرتس، ئاین بریتییە لە:

"سیستەمێك لە هێماكان كە كاری سەقامگیركردنی حاڵەتەكان و خولیا بەهێزو قەناعەتپێكەرو پایەدارەكانە لە مرۆڤدا، لەرێی رێكخستنی چەند چەمكێك لە سیستەمی گشتی جیهان و داپۆشینی ئەم چەمكانە بەوەها خەرمانەیەك لەراستیبوون، تا ئەم حاڵەت و خولیایانە واقیعبینانەتر دەربكەون."

گیرتس پاشان ئەم "پێناسەیە" زیاتر شیدەكاتەوە و سەبارەت بە بەشەكانی روونكردنەوەی زیاتر دەدات. لەتوێی ئەم كارەدا، بەوردی باسی ئەو تیۆرە ئاینیە دەكات كە مەبەستێتی.

یەكەمین خاڵێك كە باسی دەكات، ئەوەیە كە ئاین كۆمەڵێك هێمایە. ئەو دەڵێت هێمایەك دەتوانێت جێی شتێك بگرێتەوەو شتێك بنوێنێت یان دەربڕێت، یان دەتوانێت وەك جۆرێك پیشاندەر یان رێنوێنی ئەو شتەی كە دەبێت ئەنجام بدرێت، كاربكات. دەتوانرێت ئەم بیرە بە نمونەیەك روون بكرێتەوە كە خودی گیرتس بەكارینەهێنا، بەڵام ئەو خاڵەی مەبەستییەتی بە باشی دەردەبڕێت؛ ئەم نمونەیە، چراكانی ترافیكلایتە. چرای سوور ئەو دۆخەمان بۆ روونەكاتەوە كە تێیداین، واتە پێمانەدەڵێت كە لە مەترسیی بەركەوتنی ئۆتومبیلەكانی تر، لە چواڕیانی سەرڕێگاكە، نزیكبووینەتەوە. بەلام لەپاڵیشیدا، هەر ئەم چرا سوورە ئێمە ئامادەدەكات هەتا بە شێوازێكی تایبەت كاربكەین، هەروەها فێرمان دەكات و پێمان دەڵێت كە دەبێت رێگای كارێكی تایبەت بگرینەبەر. ئەم چرایە هەم رەوشەكەمان پیشاندەدات و هەمیش دەبێتە هۆی ئەوەی كە رەفتارێكی دیاریكراو

بنوێنین. بەهەمان شێوە، هێما ئاینییەکانیش پێگەی ئێمە لە جیهاندا دەردەبڕن، هەمیشە فۆرم بەم پێگەیە دەدەن. ئەم هێمایانە لە ڕێگای جێخستنی ئارەزووگەلێك لە مرۆڤەکاندا بە مەبەستی ڕەفتارکردن بەشێوەی دیاریکراوو هاندانیان بۆ حاڵەتگەلێکی تایبەت، فۆرم بە جیهانی کۆمەڵایەتی دەدەن. بۆ نمونە، ئەم هێمایانە دەتوانن ویقارو بەهێزیی و شتی تری لەم شێوەیە ببەخشنە عیبادەتکەران ، یان سەرمەستی و شادمانی و هەژانیان تیا بوروژێنیٚ.

پاشان گیرتس دەڵێت ئاین لە ڕێی فۆرم پێدانی تێگەیشتنگەلێکەوە سەبارەت بە سیستەمی هەمەیی بوون، ئەم کارانە ئەنجامدەدات. بەڕای ئەو، مرۆڤەکان پێویستییان بە تێگەیشتنگەلێکی لەم چەشنە هەیە. ئەوان پێویستییان بەمە هەیە کە جیهان بە مانادار و ڕێکخراو ببینن. ئەوان ناتوانن تەحەمولی ئەو تێڕوانینە بکەن کە جیهان لە بناغەوە بێسەروبەرەیەو لەسەر بنەمای ڕێکەوت دروستبووەو بۆ ئەوان مانا یان نرخ و بایەخێکی نییە. ئەم جۆرە تاقیکردنەوانە، جیهان دەگۆڕن بۆ بێسەروبەرییەکی بێمانا. گیرتس ئەم جۆرە تاقیکردنەوانە بەمایەی سەرلێشێواوی و ڕەنج و خراپەکاری دەزانێت.

ئەزمونی سەرگەردانی کاتێك دێتەپێشەوە کە ڕوداوگەلێکی نائاسایی یان سەرسوڕهێن ڕودەدەن کە هیچ یەکیٚ لە هۆکارە ئاساییەکانی دەربڕین نەتوانن دەربڕی ئەو ڕووداوانە بن. ئاین وەڵامێکی دەستبەجیٚ بۆ ئەم ڕوداوانە دەستەبەر دەکات و سەبارەت بەم ڕووداوانە کە بەهیچ شێوەیەکی تر ڕونکردنەوە هەڵناگرن، لێکدانەوەیەکی جێگای پەسەند پێشکەش دەکات. گیرتس بیروباوەڕە ئاینییەکان وەك ئەو کۆششانە لەبەرچاو دەگرێت کە ئامانج لێیان، ڕوونکردنەوەی ڕوداوو ئەزمونە بێسەرەوبەرەکانە. ئەو ڕوداوگەلێکی وەك مردن، خەوو خەیاڵ و بەلاٚ سروشتییەکان لەڕێزەی ڕوداوو ئەزمونە بیٚ بنەما و بێسەرەوبەرەکان دادەنێت."

ئەم تیۆرەیە بە ڕواڵەت زۆر ئەقڵانییانە دەردەکەوێت و بڕێك تایلۆرییانەیە، بەڵام گیرتس ئەم پێویستییە بۆ خستنەڕوو بە پێویستییەکی عاتفیش دادەنێت. بۆ نمونە، ئەو دەڵێت هەرجۆرە سەرنەکەوتنێکی درێژخایەنی سیستەمی بەیانکردنی تاك... لە خستنەڕوی کاروبارێکدا کە پێویستی زۆریان بە بەیانکردن هەیە، بێئۆقرەییەکی زۆر لە مرۆڤدا دروستدەکات" (لا15).

گیرتس جەخت لە دیاردەیەکی نائاسایی و ناسروشتی و سەرسوڕهێن دەکاتەوە. بەلای کەمەوە هەندیٚ لە مرۆڤەکان، بێئەوەی نکوڵی لە هێزی تایبەتی ڕوداوگەلێکی ئاوا نائاسایی بکەن، دەشێت دەربارەی مانای شتە ڕۆتینییە زۆر ڕۆژانەییەکان، دنیایی و وەکیەکی ژیانیش، توشی دودڵی بن. ئەوپەڕی وەکیەکبوونی زۆرێك لە لایەنەکانی ژیانی ڕۆژانەیان، ڕەنگە ڕێك لەبەر تایبەتمەندیی وەکیەکبوون و ڕۆژانەییان بێئیعتیبار بێتە پێش چاو. کەواتە، ئاین نەك تەنها کۆششێکە بۆ ئاڕاستەکردنی لایەنە سەرسوڕهێنەرەکانی جیهان، بەڵکو لە زەمینەیەکی فراوانتردا، ئیعتبارێك بۆ دووبارەبوونەوەی ژیانیش دەستەبەردەکات.

دووەمین ئەزمونێك کە بەڕای گیرتس بۆچوونی ئێمە سەبارەت بە سیستەمی واتاداری جیهان توشی دودڵی دەکات، ئەزمونی ئازارە. گیرتس لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا نییە کە ئاین لەبەرگەگرتنی بارودۆخی گوشارە عاتیفییەکان لە ڕێگەی سوککردن یان هەلاٚتن لەم دۆخانە کۆمەك بکات. ئەو بەتایبەتی بۆچوونەکانی مالینۆڤسکی لەم بوارەدا بە

ناتەواو دەزانێ. وەك نادێل بە ((ئیلاهیاتی گەشبینی)) وەسفی دەکات. بەڕای گیرتس، مەسەلەی ئاین ئەوە نییە کە دەبێت چۆن خۆ لە ئازار دووربخەینەوە، بەڵکو ئەوەیە کە دەبێت چۆنچۆنی قبوڵی بکەین ، وای لێبکەین کە تەحەمول بکرێت. زۆربەی نەریتە ئاینییەکانی جیهان ئەم مەسەلەیە دەسەلمێنن کە ژیان پێویستی بەئازارە، تەنانەت لاشیان ئازیزە.

لەکاتێکدا کە کاردانەوەی ئاینی لەبەرامبەر حاڵەتی سەرگەردانیدا لە بنەڕەتەوە کاردانەوەیەکی ئەقڵانییە، بەلاّم هەر ئەم کاردانەوەیە لە بەرامبەر ئازاردا زیاتر کاردانەوەیەکی عاتیفییە. ئاین لەلایەنە ئەقڵیەکەیەوە ڕونکردنەوەی کۆتایی ئەزمونەکان دەسەلمێنێ، بەلاّم لەلایەنی سۆزدارییەوە ئامانجگەرایی بوون ئەسەلمێنێت. ئاین ئەم کارە بە دەستەبەرکردنی هێماگەلێك بۆ دەربڕینی سۆزو عاتیفە، ئەنجامدەدات. ئاین لەڕێی دانانی ئازار لە بوارێکی واتاداردا، مرۆڤی لەگەڵ دەگونجێنێ‌و بە دەستەبەرکردنی شێوەگەلێکی تایبەت لە کار هەوڵدەدات لەم ڕێیەوە ئازار شیبکاتەوەو وای لێبکات قابیلی تێگەیشتن بێت. توانای مرۆڤ بۆ تێگەیشتن لە ئازار، لەڕاستیدا بەواتای توانایی قبوڵکردن‌و تەحەموڵکردنی ئەو.

سێیەمین جۆری ئەزمونی هەڕەشەکەری واتا، ئەزمونی خراپەیە. خاڵی بنچینەیی لەم ڕووەوە، ئەو هەستی گشتییەیە کە لەنێوان مەسەلەکاندا بەو شێوەیەی کە هەن‌و بەو شێوەیەی کە دەبێت بن، کەلێنێك هەیە. ئەم هەستە کاتێك گرنگی پەیدادەکات کە مرۆڤ بەبوونی ناکۆکی نێوان ڕەفتاری ڕەوشتی‌و پاداشتە مادییەکان بزانێت. زۆربەی کات مرۆڤە چاکەکان ئازار دەچێژن‌و بەدخووەکانیش سەرکەوتن بەدەستدەهێنن. هەڵبەت لێرەدا گیرتس بۆچوونی ڤیبەر و زۆرێك لە وەزیفیەکانی ئەم بوارە پیشاندەداتەوە. بەقسەی خودی ئەو، ((ڕونکردنەوە هەڵنەگرتنی ڕازئامێزی ئەم نادادیە گەورەیە، ئەم ڕەشبینییە ناخۆشە دروستدەکات کە ڕەنگە جیهان‌و ژیانی مرۆڤ لە جیهاندا هیچ سەروسامانێکی دروستی نەبێت)) (لا23).

ئاین هەوڵدەدات ئەزمونەکانی مرۆڤ لە نایەکسانی‌و نادادپەروەری ئاڕاستە بکات. ئاین دەیەوێت ئەوە پیشان بدات کە ئەم واقیعیەتانە تەنها ڕواڵەتین، خۆ گەر مرۆڤ ڕوانینێکی بەرفراوانتری بۆ ئەوان هەبێ، تێدەگات کە تەنانەت ئەم بێدادییانەیش ئەلگۆیەکی واتاداریان هەیە. شێوازێکی زۆر باو بۆ لێکدانەوەی ئەم واقیعیەتانە، ئەم ئیدیعایەیە کە نادادپەروەری لەم جیهانەدا بە دادگەری لەو دنیا قەرەبوو دەکرێتەوە.

بەگشتی، دەبێت بوترێت کە ئاین لەگەڵ سێ قۆناغی سەرگەردانی‌و ئازارو خراپە، سەروکاری هەیەو هەوڵدەدات دیارییان بکات‌و نکوڵی لەوە بکات کە ئەم مەسەلانە تایبەتمەندی بناغەیی هەموو جیهان دەژمێردرێت، و دەیەوێ بە بەستنەوەی ئەم مەسەلانە بە پانتاییەکی بەرفراوانتر لە واقیعیەت، ماناداریان بکات.

بەلاّم مرۆڤەکان بۆچی بیروباوەڕگەلێکی ئاوا قبوڵدەکەن؟ چۆنچۆنی قەناعەت بەم جۆرە بیروباوەڕانە دەکەن؟ ئەو بەشە لە پێناسەکەی گیرتس بۆ ئاین کە دەڵێت ئاین خەرمانەیەك لە واقیعیبوونی لەسەر ئەو چەمکانەی پەیوەستن بە سیستەمی گشتی جیهان دروستدەکات، لەڕاستیدا لەگەڵ ئەم جۆرە مەسائلانەدا سەروکاری هەیە.

گیرتس ناکۆکە لەگەڵ لێکدانەوە دەروونناسیەکانی لەمەڕ هۆکانی قبوڵکردنی چەمکە

ئاینییەکان. ئەگەرچی سەرگەردانو ئازار و خراپە، مرۆڤەکان بەرەو لای باوەڕ بەخواکانو ڕۆحیانەتەکانو شەیتانەکان، پاڵ پێوەدەنێت، بەڵام بنەمای ڕاستەقینەی ئەم باوەڕانە نین. بە باوەڕی گیرتس، بنەمای حەقیقیی ئەم باوەڕانە یان لە سەرچاوەدایە یان لەنەریتدا. ئاین تەنها جۆرێکە لە جۆرەکانی ئەو ئاسۆیانەی کە مرۆڤ لەڕێیانەوە تەماشای جیهان دەکات. کەواتە مەسەلەی یەکەم ئەمەیە کە بڕوانین بزانین ئاسۆی ئاینی لەبەرامبەر ئاسۆکانی تردا چ تایبەتمەندیگەلێکی تری هەیە، دووەمیش ئەوەی کە مرۆڤەکان چۆنچۆنی ئەم ئاسۆیە قبوڵ دەکەن؟

گیرتس دەربارەی تایبەتمەندییەکانی ئاسۆی ئاینی، دەڵێت گرنگترین تایبەتمەندی ئاین، باوەڕە. ئاسۆی زانستی لە بنەڕەتەوە گومانارییەو هەمیشە چەمکەکانی دەخاتە ژێر تاقیکردنەوەوە. بەڵام ئاسۆی ئاینی بەپێچەوانەی ئاسۆی زانستییەوە کاردەکات، چونکە هەوڵدەدات چەمکەکانی بە جۆرێکی ڕاستەقینەو بەدوور لە هەر جۆرە گومان و بەڵگە جیاوازەکان بسەلمێنێت.

بەبڕوای گیرتس، میکانیزمی دروستکەری باوەڕ، ڕێوڕەسمەکانە. یەقینی ئاینی لە ڕێوڕەوتی ڕێوڕەسمەکاندا دروستدەبێت. بۆ نمونە، ئەو دەڵێت ((قبوڵکردنی بوونی سەرچاوەیەك کە زاڵە بەسەر ئاسۆی ڕێوڕەسمە ئاینییەکاندا، لە خودی ڕێوڕەسمەکانەوە سەرچاوە دەگرێت)) (لا34). ڕێوڕەسم هەم تێگەیشتنی گشتیی ئاینی دادەڕێژێت، هەمیش ئەرکی ئەو سەرچاوەیە دیاریدەکات کە قبوڵکردنو تەنانەت پێویستی قبوڵکردنی ئەم تێگەیشتنە ئاینییە لێکدەداتەوە.

لێرەدا دەتوانرێت ڕەخنەیەك لە گیرتس بگیرێت. ئەگەر یەقینی ئاینی لە بەشداری لە ڕێوڕەسمەکاندا سەرچاوەدەگرێت، کەواتە لە قۆناغی یەکەمدا چی مرۆڤەکان هاندەدا لەم ڕێوڕەسمانەدا بەشداریی بکەن؟ ئەمە هەمان ئەو نەهامەتییەیە کە دامێنگری تیۆرییەکانی هەموو ئەوانە دەبێت کە ڕۆڵی پلەیەك دەدەنە ڕێوڕەسمەکانو ڕۆڵی پلە دووش دەدەنە باوەڕ، وەکو تیۆرەکانی ڕۆبەرتسۆن سمیت، دۆرکهایمو ڕادکلیف براون.

گیرتس لەدواین بەشی پێناسەکردنەکەیدا، ئاماژە بۆ کۆمەڵێك حاڵەت و هۆکار دەکات کە ئاین دروستیان دەکاتو ڕویەکی واقیعبینانەی بێ هاوتایان دەداتێ. بنەڕەتیترین وشەی ئەم ڕستەیە، سیفەتی "بێهاوتا"یە. گیرتس دەڵێت کە هەریەك لە ئاسۆ ئاینییەکان شێوازێکی بێهاوتایە بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ جیهاندا و تەنها بۆ ئەو کەسانە واقیعبینانەیە کە باوەڕیان بەو ئاسۆیە هەیە و پێیانوایە زۆر پراکتیکیو ماقوڵانەیە. بە بۆچوونی گیرتس، کاریگەری نەبوونی گومان لەسەر ئاسۆ ئاینییەکان ئەو شتەیە کە توانای دانانی کاریگەری قوڵتر لەسەر کۆمەڵگە دەبەخشێت بەئاینەکان. ئەم ڕاستییەی کە بڕواداران لەهەریەك لە ئاسۆ ئاینییەکاندا بەجۆرێکی بەڵگەنەویست ئاسۆکەیان بە ماقوڵترینو واقیعبینانەترین ئاسۆ دەزانن، دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەم ئاسۆیانە توانایەکی کاریگەر پەیدابکەن.

لەبەرئەوەی هەر ئاسۆیە خۆی لەخۆیدا بێهاوتایە، هیچ هەوڵێك بۆ پێوانەکردنی بایەخی کۆمەڵایەتی یان کارکردی زاتیی ئاین مومکین نییە. هەر لەم ڕووەوە بە بۆچوونی گیرتس، ناتوانرێت وەڵام بەم پرسیارە بدرێتەوە کە ئایا ئاین بەشێوەیەکی گشتیی کارکردی ئیجابی یان سەلبی هەیە. ئەم پرسیارە تەنها سەبارەت بە ئاینە

تایبەتەکان دەتوانرێت بکرێت. ئێمە تەنیا دەتوانین ئەم پرسیارە ماقوڵە بکەین کە ئایا ئەم یان ئەو ئاینی تایبەتی لە سنووری کارکردنی خۆیدا ڕۆڵی هەیە، لەبەرئەوەی دەشێت ئاینێك یان بزوتنەوەیەکی ئاینی بۆ کۆمەڵگەکەی دەورێکی نەبووبێت و نەتوانێت یەکیبخات.

گیرتس، سەرباری ئەوەی ئەو پێناسەیەی کە بۆ ئاین کردوویەتی و ڕەنگوبۆیەکی پراکتیکی هەیەو وادەردەکەوێت کە تیۆرەکەی وەزیفیانەیە، بەلاٚم لەڕاستیدا جیاوازە لە زۆربەی تیۆرە وەزیفییەکان. لێرەدا دەتوانرێت ئەم پرسیارە بهێنرێتە گۆڕێ: ئایا پێناسەکەی گیرتس دەتوانێت سیستمگەلێکی هزری لە چەشنی ناسیونالیستی، کومونیزم و هاوشێوەکانی ئەوانیش بگرێتەوە؟ بەڕواڵەت، پێناسەکەی ئەویش وەکو زۆرێك لە پێناسە وەزیفیەکانی تر، تایبەتمەندییەکی لەو شێوەیەی هەیە. ئەگەرچی پێناسەکەی گیرتس بواری چەوتی کارکردەکانیش لەبەرچاودەگرێت، بەلاٚم لەزۆر ڕووەوە تایبەتمەندییە وەزیفیانەکەی بەتوندی دەپارێزێت و لەبەر نەبوونی زیندوویێتی پێویست، لە ناساندنی ئەو ڕۆڵەی کە ئاین لە گۆڕانکاریو کێشمەکێشە کۆمەلاٚیەتییەکاندا دەتوانێت هەیبێت، بەجێدەمێنێت. بە دەربڕینێکی تر، پێناسەکەی گیرتس کێشەی دەسەلاٚت و توانا لە پەیوەند بەئاینەوە، لەبەرچاو ناگرێت (ئاسد، 1983). لە نووسراوەکەی گیرتسدا، دەربارەی ئەو پرۆسانەی کە هێماکان لەڕێی ئەوانەوە حاڵەتگەل و خولیا پێویستەکان دەوروژێنن، شینەکراوەتەوە. بەپێی بەڵگەکانی ئاسد، لێرەدا ئێمە دەبێت ئاگامان لەو پرۆسە کۆمەلاٚیەتییە بێت کە کارکردەکانی دەسەلاٚت، ڕێساکان و ئەو گوتارانەی کە هێز بەبەر بیرو سیمبولە ئاینییەکاندا دەکەنەوە، لەڕێی ئەوەوە بەدیدێن. دەربڕینەکەی گیرتس پشتبەستووە بەو کارامەیییە گریمانەیییەی کە لە خودی فۆرم و فەرهەنگەکاندا هەیەو پشتئەستوورە بە حاڵەتە زیهنییەکان کە ئەم فۆرم و ڕێوڕەسمانە پێکدەهێنن.

ئاشکرایە ڕێبازی گیرتس لەژێر کاریگەریی زۆرێك لەو ڕوانینانەی ڕێبازەکانی پێشوو، لەوانە: ئەقلاٚنیەت و سۆزگەرایی، شێوەی گرتووەو لەسەرئەو باوەڕەیە کە تێکەڵەیەك لەوانە دروستبکات.

## ڕوانگەی پیتەر بێرگەر دەربارەی ئاین و مانا

بێرگەر لە کارە سەرەکییەکەیدا دەربارەی کۆمەڵناسیی (ئاین) (1974)، دەیسەلمێنێت کە کۆمەڵگە دیاردەیەکی دیالێکتیکییە، چونکە هەم بەرهەمێکی مرۆییەو هەمیش واقیعیەتێکە لە دەرەوەی مرۆڤ کە کاریگەری لەسەرمرۆڤە داهێنەرەکانی ئەم بەرهەمە دادەنێت. ئەو پرۆسەیەی کە لەڕێی ئەوەوە دەتوانین بەهۆی چالاکیی هزری و جەستەییەوە جیهانی کۆمەلاٚیەتیمان بخوڵقێنن و هەروەها، ئەم جیهانە کۆمەلاٚیەتییە وەك واقیعیەتێکی دەرەکی و سەربەخۆ تاقیی بکەینەوەو خۆمان بە دروستبووی ئەو بزانین، پرۆسەیەکە کە لەتوێیدا، سیستەمێکی واتادار بەسەر ئەزمونی ئێمەدا زاڵدەبێت. بێرگەر ئەم سیستەمی واتادارییە ناودەنێت ناموس. ((مرۆڤەکان بەشێوەیەکی زاتی حەزیان لەوەیە کە سیستەمی واتاداری بەسەر واقیعدا زاڵبکەن)) (1973، ص31).

ناموس بەرهەمێکی کۆمەڵایەتییەو بەشێوەیەکی کۆمەلاٚیەتی دروستدەبێت. دابڕان لە کۆمەڵ هەستی ڕێکوپێکی لە مرۆڤدا لاوازدەکات و ئەوانەی دوچاری گۆشەگیرییەکی ئاوا دەبن،

پەیوەندییان بە واقیعیەتەوە نامێنێ، ئەزمونی ژیانیان تێکدەچێت و حاڵەتی ناسروشتی پەیدادەکات. کەواتە، ناموس قەڵغانێکە لەبەرامبەر ئەو کێشانەدا کە هەڕەشەی بێ سەرەوبەرەیی و بێمانایی لەجیهان دەکەن. ئەزمونگەلێکی وەکو مردن هەڕەشەیەکی جدین بۆ هەستی ڕێکخراوی. مردن نەک تەنها جۆری پچڕانە لە زنجیرەی بەردەوامیی پەیوەندییە مرۆییەکان، بەڵکو هەڕەشە لەو گریمانە بناغەییانەیش دەکات کە بنچینەی سیستەمی کۆمەڵایەتین.

مرۆڤەکان، بەشێوەیەکی ئاسایی ناموس وەکو شتێك کە ((لە سروشتی شتەکان))دایە و بەشێوەی فۆرمێکی بەڵگەنەویست و ئاشکرا، ڕاستەقینە و پەسەندکراوی واقیع بەهەمان ئەو شێوەیەی کە بەڕاستی هەیە، لەبەرچاودەگرن. ئەگەرچی مرۆڤەکان ناموس دروستدەکەن، بەلاّم دیسان وەك دیاردەیەکی سروشتی و بەشێك لەو جیهانەی وەردەگرن کە لە ئیرادە و توانایی و مێژوی مرۆیی سەروترە. ئەوە ئاینە کە تێگەیشتنێکی ئاوا لەمەڕ واقیعیەتی پەتی و سروشتی بوون دەربارەی ناموسی دروستبووی مرۆڤەکان، دەپارێزێت. ناموس لەڕێی ئاینەوە خەسڵەتی پیرۆزی بەدەستدەهێنێت و دەبێت بەجیهانی پیرۆز. ناموس لەبەرئەوە پیرۆزە کە ڕازئامێزە و زۆر بەهێز دادەنرێت. ((ئاین کارێکی مرۆییە کە جیهانی پیرۆز لەڕێی ئەوەوە سەقامگیر دەبێت)) (1973، لا34). ((ئاین کۆششێکی بوێرانەیە بۆ ئەوەی کە سەراسەری جیهان بۆ مرۆڤ واتادار بێت)) (1973، لا37).

بێرگەر پاشان دەریدەخات کە چۆنچۆنی ئاین کۆمەڵگەی مرۆیی بەم جیهانە پیرۆزەوە دەبەستێتەوە و چۆنچۆنی کۆمەڵگەی مرۆیی لە وێنەی جیهانێکی فراوانتردا دادەنێت و لەتوێی ئەم پرۆسەیەدا، سیستەمی کۆمەڵایەتی دەکاتە شتێکی ڕەوا. ئەم بەڕەواکردنە دەشێت چەندین شێوەی جۆراوجۆری هەبێت، بەلاّم لەم ڕێیەوە، بونیاتە شکێنەرو ناسەقامگیرە هەڵقوڵاوەکانی چالاکی مرۆیی، حاڵەتێك لە ئاسایشی و بەردەوامی کۆتایی بەخۆیانەوە دەگرن.

پەیوەندی نێوان ئاین و کۆمەڵگە، لەلایەکی تریشەوە گرنگە. چەمکە ئاینییەکانی جیهان لەڕێی زنجیرە پرۆسەیەکی تایبەتەوە کە بە دەربڕینی بێرگەر (بونیادی ئاڕاستەکردن!) دروستدەکەن، بایەخیان بەهێز و پتەو دەکەن و دەیانپارێزن. ئەمانە ئەو پرۆسانەن کە بۆچوونە ئاینیەکان لەڕێیانەوە بەهێز دەکرێن و، ڕەواجیان پێدەدەن و بەرگرییان لێدەکەن یان دەسەپێنرێن. ئەگەر ئەم (بونیادی ئاڕاستەکردنە) لاواز ببێت یان لەنێوبچێت، بالاّدەستی باوەڕی ئاینی بەسەر زەینی مرۆڤەکاندا بەئاسانی لەناودەچێت.

لەبەرئەوەی ڕێساکان، ڕۆڵەکان، پێویستییەکان و دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان زۆر شکێنەرن، پێویستیمان بەوە هەیە کە بەردەوام بیرمان بخرێتەوە کە چی بکەین، دەشبێت هەمیشە واتا بەرجەستەبووەکان لەکلتورو دامەزراوەکاندا بەگوێماندا بدرێن. ڕێوڕەسمەکان ئەم بەبیرهێنانەوەیەمان بۆ ئەنجام دەدەن. لەکاتی ئەنجامدانی ڕێوڕەسمەکاندا، هەمیشە لەنێوان دۆخی هەنوکەیی و نەریتی کۆمەڵایەتیدا بەرقەرار دەبێت و ئەزمونی ئەندامانی کۆمەڵ زەمینەیەکی مێژووی بەدەستدێنن.

ئاین تەنها کاری ئەوە نییە کە سیستەمی کۆمەڵایەتی والێبکات قابیلی تێگەیشتن بێت و شەرعییەتی پێبدات، بەڵکو ئەو ئەزمونانەیش کە

دەشێت ببنە مایەی لێکترازانی کۆمەڵایەتی و بێسەروبەرەیی، بەئەقڵانی دەکات. ئاین پێگەو ئەزمونە پەراوێزییەکانیش کە لە دەرەوەی سنوورەکانی ئەزمونی ئاسایی ڕۆژانەن، دەکاتە کارێکی ڕەوا. ئەم ئەزمونانە بریتین لە: خەونەکان، بەلاکان، جەنگ، شۆڕشی کۆمەڵایەتی، خۆکوژیی، ڕەنج و خراپە. بێرگەر بە پەیڕەوی لەڤیبەر، دەرکەوتنەکانی ئەم دیاردانە ناودەنێ (ئاڕاستەکەرە ئاینییەکان). ڕۆڵی ئاڕاستەکردنە ئاینییەکان بریتییە لە خەبات لە دژی ناسروشتی. ئاین ((لە سەراسەری مێژوودا یەکێ بووە لە کاریگەرترین قەڵاکانی مرۆڤ لەبەرامبەر بێ دسپلینیدا)) (1973، لا94).

بەهەرحاڵ، ئاین بەهۆی ئەم دەسەڵاتە زۆرەیەوە لە زاڵبوون بەسەر ناسروشتیدا، بەیەکێ لە بەهێزترین هێزەکانی لەخۆنامۆبوون لە ژیانی مرۆییدا دەژمێردرێت. دیدگای ئاینی کە جیهان وەکو دیاردەیەکی دەرەوەی تاك لەبەرچاودەگرێت و چارەنووسی مرۆڤ دیاریدەکات، ئەم واقیعیەتە لەبەرچاوناگرێت کە هەر ئەم مرۆڤانە دەتوانن جیهانی خۆیان بگۆڕن و دیاریبکەن، بە دەربڕینێکی تر، ئەم دنیابینییە لەخۆنامۆیە، ڕێك هەمان ئەو بۆچوونەیە کە کاری پاراستنی لێتێگەیشتنێکی ڕێکخراو و واتادارە لە واقیعیەت و ئەرکیشی بەرگرتنی ناسروشتیە. ئەم هێزی لەخۆنامۆبوونەی ئاینە کە بە مەبەستی پاراستن و بەردەوامیی سیستمە جوانەکانی واقیعی کۆمەڵایەتی هێز و تین دەبەخشێت.

*((ئەو جیهانەی کە دەستکردی مرۆڤە،* بەشێوەیەك بەیاندەکرێت کە نکوڵی لەوە دەکات دەستکردی مرۆڤە. ڕوونکردنەوە ئاینییەکان سەبارەت بەکۆی جیهان، سەرباری ئەوپەڕیی شایستەییەکانیان، مەیلی پراکتیکییان بەرەو ئەو لایە بووە کە ئاگایی مرۆڤ سەبارەت بەو بەشەی جیهان بشێوێنێت کە دروستکراوی چالاکیی خۆیەتی، واتە جیهانی کۆمەڵایەتی_ کلتوری. (1973، لا96).

هەرچی چۆنێك بێت، بێرگەر سەبارەت بە ڕوانینی یەکلایەنانە بۆ ئەم مەسەلەیە، ئاگادارماندەکاتەوە. لەبەر پەیوەندیی دیالەکتیکیی نێوان مرۆڤ و کۆمەڵگە، ئەم ئیمکانەش لەئارادایە کە ئاین نەك تەنها وەك هێزێکی لەخۆنامۆکەر بەڵکو لەهەمان کاتدا وەکو هێزێکی نەهێڵەری لەخۆنامۆیی و فاکتەری ڕەوایەتی لەخۆنامۆییش بتوانێت کاربکات. ((ئاسۆ ئاینییەکان دەتوانن پێگەی پیرۆزیی لەو دامەزراوانە زەوتبکەن کە بەرلەمە لەڕێی ڕەوایەتی ئاییینییەوە پێگەیەکی ئاوایان هەبووە،... لەو ڕووەوە، دەتوانرێت بوترێت کە ئاین لە مێژووی مرۆڤدا هەم هێزی پارێزەری جیهان بووە، هەم هێزی جوڵێنەری جیهان، (لا105 و 106).

ڕێبازی بێرگەر ئاوێتەیەکی داهێنەرانەی ڕوانگەکانی دورکیم و ڤیبەرو مارکسە. بەڵام دەتوانرێت دوو ڕەخنەی سەرەکی لەم ڕێبازە بگیرێت. یەکەم ڕێبازەکەی بێرگەر ئەوە لەبەرچاوناگرێت کە پێویستبوونی واتا دەشێت بەرئەنجامی ئەو جۆرە پێگە کۆمەڵایەتی یان پەیوەندیی مرۆڤ بە سروشتەوە بێت کە ڕێبازی مارکسیی جەختی لێدەکات. بە دەربڕینێکی تر، بێرگەر وایدادەنێت کە پێویستی بە واتای شتێکی سروشتی مرۆڤە کە لەسەرتاسەری جیهاندایەو سەربەخۆیە لە هەلومەرجی تایبەتی کۆمەڵایەتی یان هەلومەرجەکانی تر. هەر لەبەرئەوە، ڕێبازەکەی ئەو پێمان ناڵێت کە بۆچی دیدگای ئاینی لە

هەڵوێستێکی تایبەتدا هەندێك کەس تێیدەگەن بەڵام لە هەڵوێستگەلێکی ترداو بۆ هەندێك کەسی تر، وا ڕوونادات. ئەم مەسەلەیە ڕەنگە بەواتای ئەوە بێت کە ڕێبازەکەی بێرگەر هەروا وەزییفیبوونەکەی دەپارێزێت، لەبەرئەوەی کەموزۆر جەختکردنەوە لەسەر ڕۆڵی بەهێزکەری دیسپلین، بەسەر ڕێبازەکەی بێرگەردا زاڵە.

ڕەخنەی دووەم ئەمەیە کە ڕێبازەکەی بێرگەر ناچێتە سەر ئەو مەسەلەیەی کە بۆچی کۆمەڵگەی نوێ سەرباری ئەوەی کە جۆری دنیابینیی لەخۆنامۆیی تیایدا ڕەواجی هەیە، هەروا بەشێوەیەکی کارامە درێژە بەژیان دەدات.

## دیدگای تۆماس لاکمان دەربارەی ئاین و واتا

ڕێبازی لاکمانیش کە هاوکاری نزیکی بێرگەرە، جەخت لە ڕۆڵی ئاین لە دروستکردنی واتادا دەکاتەوە. بەڕای لاکمان، ئاین شانبەشانی ژیانی کۆمەڵایەتی دەچێتەپێش. بەبڕوای ئەو، ڕەوتی کۆمەڵگەی نوێی خۆرئاوایی بەرەو دنیاییبوون، تەنها بەهۆی سستبوونەوەی سیماکان و دامەزراوە تەقلیدییە ئاینییەکانەوە دروستبووە، نەك ئەوەی کە ئاین خۆی سست بووبێت. لەم جۆرە کۆمەڵگانەیشدا هەندێ پرسیار و مەسائیلی بناغەیی، هەروا ڕووبەڕووی مرۆڤەکان دەبنەوە" ئەم پرسیارانە پەیوەستن بە بەهاگەلێکەوە کە لاکمان بە بەهاگەلێکی زاڵ و گشتگیر ناودێریان دەکات و پەیوەستن بە بنەمای کۆمەڵایەتی_پێکهاتەیی و کارکردی ئەم بەهایانە لە ژیانی کەسەکانیشەوە.

لاکمان لە کتێبی ئاینی نامریی (1967) دەیەوێت ((هەلومەرجی مرۆڤناسی))ی ئاین دیارییبکات؛ مەبەستی لەم هەلومەرجە، ئەوانەیە کە بەسەر هەموو ئاینە مرۆییەکاندا زاڵن و لایەنە جیهانییەکانی ڕەگەزی مرۆڤ و ژیانی مرۆڤایەتی پێکدەهێنن. ئەم هەلومەرجە زاڵانەی سەر ژیانی مرۆڤ لە سەرتاسەری جیهاندا، بەشێوەی جۆراوجۆر دەرکەوتەی ئاینی، واتە بەشێوەی ئاینەکان و دامەزراوە تایبەتییە ئاینییەکان، کە تایبەتمەندییان پەیوەندی بە داوارکارییە ڕەواکانی هەریەك لە کۆڕوکۆمەڵە ئاینییەکانەوە هەیە، خۆی نیشاندەدات. بەڵام لاکمان مەبەستی ئەو فاکتەرە ئاینییەیە کە لە سەرتاسەری کۆمەڵگەی مرۆییدا زاڵە بەسەر هەموو مرۆڤەکاندا، بەرلەوەی ئەم هۆکارە شێوەگەلێکی مێژوویی جیاواز بەخۆوە بگرێ" هەر یەك لەم شێوانە یەکێکە لەو ڕێگایانەی کە ڕەوتی بناغەیی ژیانی مرۆیی لەڕێی ئەوەوە بەشێوەیەکی بەرجەستە بنیاتدەنرێ. هەر یەك لە ئاینە مرۆییەکان لەڕاستیدا، دەربڕی دامەزراوەیی پرۆسەیەکی گشتییە کە لەڕێی ئەوەوە ((جیهانی ڕواڵەتی)) بەجۆرێکی کۆمەڵایەتی دروست دەبێت و لەگەڵ جیهانی ژیانی ڕۆژانەدا پەیوەندیی دەبەستێت.

جیهانی ڕواڵەت سیستەمێکە لە واتا کە لەڕێی ئەوەوە ژیانی ڕۆژانە پەیوەست دەبێت بە ڕاستییەکی مەزنەوە. ئەم سیستەمە بۆیە سیستەمێکی واتادارە کە بەشێوەیەکی کۆمەڵایەتی دروستدەکرێ و دەپارێزرێ. ئەم پرۆسە واتادارە تەنها بۆ بوونەوەرگەلێك دەشێت بتوانن لە سروشتی ژینگەناسییان واوەتر بڕۆن؛ بە دەربڕینێکی تر، تەنها بۆ مرۆڤەکان شیاوە، چونکە مرۆڤەکان خۆیان هۆشیارن و دەتوانن سەرلەنوێ بیر لە ئەزمونەکەیان بکەنەوە. مرۆڤەکان لەبەرئەوە خەسڵەتێکی وایان هەیە چونکە بوونەوەرگەلێکی کۆمەڵایەتین کە دەبێت بەجۆرێك پەیوەندی لەگەڵ ئەوانی تردا

دابمەزرێنن کە خۆیان بخەنە جێگای ئەوانی ترەوەو لەم ڕێیەوە کاردانەوەی ئەوانی تر سەبارەت بە کرداری خۆیان پێشبینی بکەن‌و کارەکانیان بەپێی ئەم کاردانەوانە ڕێکبخەن. ئەم کارە ڕێگە بەمرۆڤ دەدات کە بەو جۆرە بڕوانێتە خۆی کە ئەوانی تر تێیدەڕوانن و لەتوێی ئەم پرۆسەیەدا، هۆشیاری سەبارەت بە خودی خۆی بەدەستبهێنێت.

لاکمان ئەم پرۆسەیە (پرۆسەی بەدەستهێنانی هۆشیاری لەمەڕ خود)ی زۆرتر بە پرۆسەیەکی ئاینی دادەنێت. ئەم پرۆسەیە شانبەشانی کۆمەڵایەتیبوونەوەی منداڵ کاردەکات و بە درێژایی پرۆسەی کۆمەڵایەتیبوونەوەی، منداڵ لەگەڵ وێنەیەك لە واقیعیەت یان جۆرە دنیابینییەکیش ئاشنا دەبێت" ئەم وێنەیە جیهانێکی ڕواڵەتی پیشاندەداتەوە، کە واتا بە واقیعیەت‌و بوونی تاك دەبەخشێت‌و، خودی تاکەکەیش لەچوارچێوەی ئەم جیهانە ڕواڵەتییەدا جێدەخات. لە کۆمەڵگەکانی ڕابوردوودا بەگشتی ئەم پرۆسەیە لەڕێگەی سیستەمی ئاینی بەواتا تەقلیدییەکەی کاریدەکرد. بەڵام لە کۆمەڵگەی ئێستادا ئەم پرۆسەیە لەڕێی چەمکگەلێکی وەکو تەحقیقی زات، خۆدەرخستن‌و سەربەخۆیی فەردییەوە کاردەکات، چەمکگەلێك کە بە ڕواڵەت تەسەورناکرێت دروستکەری بەهای ئاینی بن، بەڵام ئەگەر ئاین بەواتایەکی فراوانترو بنچینەیی تری لەبەرچاوبگرین، ئەم چەمکانەیش ناوەڕۆکێکی ئاینی پەیدادەکەن.

گرفتی سەرەکی ڕێبازەکەی لاکمان، ئەوەیە کە ڕوونی ناکاتەوە بۆچی دەبێت قبوڵبکرێت کە واوەترچوون لە سروشتی ژینگەناسییەوە، لە بنەڕەتدا پرۆسەیەکی ئاینییە. ناوەڕۆکی ئاینی ئەم پرۆسەیە چییە؟ هەڵبەتە ئاین و بەکۆمەڵایەتیبوون لە زۆربەی کۆمەڵگە تەقلیدییەکاندا لێکهەڵپێکراون، بەڵام لەم ڕاستییەوە ئەوە ئەنجامگیری ناکرێت کە کۆمەڵایەتیبوونەوە لەخۆیدا هەڵگری تایبەتمەندییەکی ئاینییە. پێویستییەکە بۆ هاتنەناوەوەی ئاین بۆ ئەم پرۆسەیە، بوونی نییە. تەنانەت ئەگەر لاکمان ڕاستی کردبێت کە تایبەتمەندی مرۆڤ واوەترچوونە لە سروشتیی ژینگەناسی‌و خۆیی‌و هەر ئەم فاکتەرەیە کە مرۆڤەکان دەگۆڕێت‌و دەیانکات بە بوونەوەرگەلێکی ئاکاری‌و بەها جیهانگیرەکانی مرۆڤی لێدەکەوێتەوە، دیسان ناتوانرێت وا ئەنجامگیری بکرێت کە ئەم مەسەلەیە بەتەواوی ژیانی مرۆڤ دەکاتە شتێکی تەواو ئاینی، مەگەر ئەوەی کە ئەم پرۆسەیە هەمووی وەك ((ئاین)) وەربگرین.

## سەرچاوە

جامعەشناسی دین، ملکولم هملتون، ترجمە: محسن ثلاثی، چاپ اول، موسسە فرهنگی انتشارات تبیان، (1377) هجری شمسی.

# جەستە حوکمدراوەکان

**میشل فۆکو**

له فارسییەوە: فرزند شێرکۆ

لە دووەمی مارتی 1757 کەسێك بە ناوی دامی ین (*Damiens*) حوکمدرا کە (بەشێوەیەکی نیوە ڕووت و تەنیا بە کراسێکەوە، لە کاتێکدا کە مەشخەڵێکی بە قورسایی یەك کیلۆگرام لەدەستگرتووە، بە عەرەبانە بۆ بەردەرگای سەرەکی کڵێسای پاریس و پاش دانپیانان بە تاوانەکانی خۆیدا لەبەرچاوی خەڵك، بە عەرەبانە بۆ مەیدانی گرێڤی (*Greve*) بەرن. لەوێدا بە داربەستێکەوە، کە پێشتر هەڵخرابوو، بیبەستنەوە و لە ناوچەی مەمك، قۆڵ و رانیدا جەستەی هەڵدڕن و برینداری بکەن. ئینجا ئەو چەقۆیەی کە باوك کوشتنەکەی پێ ئەنجامدابوو بە ئاگری گۆگرد سورکەنەوە و دەستی راستی ئەوی پێ بسوتێنن و بەسەر برینەکانی جەستەشیدا قورقوشمی تواوە، ڕۆنی قرچاو و تێکەڵێك لە مۆم و قیر و گۆگردی تواوە بڕژێنن. ئەو کات لاشەکەی بە چوار ئەسپ راکێشن و ئەندامە لێکهەڵپساوەکانیشی بسوتێنن، تا دەبێتە خۆڵەمێش و خۆڵەمێشەکەشی بدەن بەدەم باوە).

ڕۆژنامەی ئەمستەردام – لە ژمارەی ئەپریلی هەمان ساڵ، واتا پاش یەك مانگ – بڵاویکردەوە کە ئیدی لە کۆتاییدا ئەویان کرد بە چوارکەرتەوە. پرۆسەی کۆتایی سزاکە زیاد لە پێویست درێژەی کێشا، چونکە ئەسپەکان بە راکێشانی کەسێك رانەهاتبوون، بەشێوەیەك کە کار گەیشتە ئەوەی لەبری چوار ئەسپ شەش ئەسپیان بەکارهێنا. بەڵام ئەمەش دادی نەدان. بۆیە بۆ جیاکردنەوەی ئەندامەکانی جەستەی ئەو بەدبەختە بەناچار لاتەنیشتەکانیان هەڵدڕی، دەمار و بەستەرەکانیان بچڕاند و جومگەکانیشیان جوێ کردەوە..

"لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو ئەهلی لەعنەت و نەفرەت بوو، لەم دۆخەدا هیچ وشەیەك لە دەمی نەهاتە دەرێ کە بۆنی کوفری لێبێت. تەنها ئەوە نەبێت بەهۆی ئەشکەنجە و ئازاری زۆرەوە قیژە و هاواری تۆقێنەری لێهەڵدەستا. ئەو بەردەوام دەیگوتەوە: خودای من رەحمم پێ بکە. عیسای مەسیح یارمەتیم دە. تەماشاچییەکان بە گشتی

کەوتنە ژێر کاریگەری دڵسۆزانەی قەشەی کڵێسای سەن – پول وە کە بەو تەمەنە زۆرەشەوە کە هەیبوو هیچ چرکەیەکی بۆ دڵنەوایی کردنی سزادراوەکە لەدەست نەدا".

## بە پێی شایەتی بووتۆن ( *Bouton* ):

گۆگردەکەیان سوتاند بەڵام ئاگرەکەی هێند هێور بوو کە تەنیا پێستی سەر دەستی سزادراوەکە زیانێکی کەمی لێکەوت. ئەو کات جەللادێك کە تاسەرو ئانشکی هەڵکردبوو، مەقەستێکی پۆڵاینی (کە درێژییەکەی دەگەیشتە نیومەتر و تایبەت بەم بۆنەیە بوو) گرتە دەست. سەرەتا ئەوەی لە ناوچە گۆشتنەکەی قاچی ڕاست و ئینجا ناوچەی ڕان و دواتر هەردوو ناوچەی گۆشتنی قۆڵی ڕاست و ئینجا گۆی مەمکەکان، زامدار کرد. ئەم جەللادە هەرچەند کە بەهێز و بەخۆ بوو، بە سەختی دەیتوانی پارچە گۆشتەکانی یەك ناوچە کە دوو سێ جار لە مەقەستی دەناو لە دوولاوە دەیگوشی، لەلاشە جوێ کاتەوە. ئەوەی جیایدەکردەوە لەگەڵ قەڵغانێکی سێ کیلۆییدا هاوتا دەهاتەوە.

(دامی ین) لە ئاکامی ئەو برینانەی کە بە مەقەست لە لاشەیدا سەریهەڵدا، زۆر هاواری کرد، بەڵام جوێنێکی نەدا. تەنها سەری بەرز دەکردەوە و لە خۆی دەڕوانی. هەمان ئەو جەللادەی کە مەقەستی بەکاردەهێنا بە کەوچکێکی ئاسن لەناو مەنجەڵێکدا، گیراوەیەکی کوڵاوی هەڵدەگرت و بەبڕی زۆر بەسەر هەر برینێکیدا دەکرد. دواتر چەند تەنافێکیان لە ڕان و قۆڵی ئەو بەست و سەرەکانی دیکەی تەنافەکانیشیان لە ئەسپەکان بەست.

"جەنابی (*Le Breton*) لوبروتون کە چاودێری دادگا بوو، چەند جار لە حوکمدراوەکە نزیك بووەوە تاکو لێی بپرسێت کە ئایا شتێکی هەیە بۆ وتن؟ بەڵام ئەو وەڵامی نەرێی دایەوە. ئەو وەك ئەوەی لە دۆزەخێکان دەگێردرێتەوە، هیچی بۆ وتن پێنەبوو، بەڵام لەگەڵ هەر ئەشکەنجە و پاش ئازارێکدا هاواری دەکرد: "خودایە ببەخشە! خودایە ببەخشە!" ئەو سەرەڕای هەموو ئەو ئەشکەنجانەی کە باسکرا جار جار سەری بەرزدەکردەوە و بە ئازایەتیەوە لە خۆی دەنواڕی. ئەو تەنافانەی کە پیاوەکان توند لێیان بەستبوو بەهێزەوە ڕایاندەکێشا، ئازارگەلێکی وای لێدەکەوتەوە، کە وەسف ناکرێت. لەم دۆخ و کاتەدا جەنابی لوبروتون جارێکی دی لێی نزیك کەوتەوەو پرسی کە ئایا نایەوێت شتێك بڵێت. وەڵام هەمدیسان نەرێ بوو. ئەو کات قەشە درکێنەر – بیستەکان چوونە لای و ماوەیەکی زۆر لەگەڵیدا قسەیانکرد. ئەو بە حەز و شادیەکی زۆرەوە ئەو خاچەی ڕادەموسی کە قەشەکان لێیان نزیك دەکردەوە. لێوەکانی دەکردەوە و بەردەوام دەیگووت: "خودایە ببەخشە".

ئەسپەکان لەپڕێکدا بە زەبری قامچی جێی خۆیان بزوان و لە کاتێکدا کە جڵەوی هەریەکەیان بە دەستی جەللادێکەوە بوو، ئەندامێك لە لاشەی سزادراوەکەی ڕاستەوخۆ بەرەو لای خۆی ڕادەکێشا. چارەکە سەعاتێك دواتر هەمدیس هەمان بۆنە ئەنجامدرا، لە ئاکامدا پاش چەندجار دووبارە کردنەوە پەنایان بردە بەر هێزێکی زیاتر. بەم شێوەیە ئەو ئەسپانەی کە دەستی ڕاستیان ڕادەکێشا بەرەو لای سەری سزادراوەکە دەبزوان و ئەو ئەسپانەشی کە ڕانیان ڕادەکێشا بەرەو لای قۆڵی دەسوڕانەوە. لە ئەنجامدا قۆڵی سزادراوەکە لە جومگەی خۆی جیابۆوە و ئەم ڕاکێشان بە ئەسپە چەند جارێك بەبێ ئاکام دووبارە بووەوە و

حوکمدراوەکە جار ناجارێك سەری بڵند دەکردەوە و لە خۆی دەنواڕی. لە کۆتاییدا ناچاربوون دوو ئەسپی دیکەش لە رانی حوکمدراوەکە ببەستن و بەمە ژمارەی ئەسپەکان گەیشتە شەش ئەسپ، بەڵام دووبارە ئامانجی چاوەڕوانکراو نەهاتە دی.

"سەرەنجام جەللاد، کە ناوی سامسۆن بوو، چووە لای جەنابی بروتون و گوتی کە هیچ ئامرازێکی دی بۆ کۆتایی هێنان بە کێشەکە لەبەردەستدا نیە و ئومێدێك نیە؛ ئەگەر بەڕێزان قایل بن و پێیان باش بێت، ئەو حوکمدراوەکە پارچە پارچە بکات. جەنابی بروتون کە پیاوێکی شارستانی بوو، فەرمانی دا کە جارێ کۆڵ نەدەن و خەریك بن. بڕیارەکە جێبەجێ کرا، بەڵام ئەسپەکان ماندوو بووبوون و یەکێکیان کە بە ڕانی حوکمدراوەکەوە بەسترابوو، بەسەر زەویدا کەوت. قەشە درکێنەر – بیستەکان گەڕانەوە و سەرلەنوێ دەستیان بە گفتوگۆکردن کرد لەگەڵیدا. ئەو پێی دەگوتن (خۆم بیستم): "ماچم کەن، بەڕێزان".

جەنابی قەشەی کڵێسای سەن – پول نەیوێرا. وەها زاتێکی نەکرد، بەڵام جەنابی مارسیلی (*Marsilly*) بە ژێر تەنافی قۆڵی چەپیدا تێپەڕی و ناوچەوانی ماچ کرد. جەللادەکان کۆبوونەوە، و دامی ین بەوانی گوت کە جوێن نەدەن، کارەکەی خۆیان راپەڕێنن. ئەو دڵی لێیان نەئێشاوە. دامی ین تەمەننای دەکرد کە لای خواوەند دۆعای بۆ بکەن – داوای لە قەشەی کڵێسای سان – پولیش کرد کە لە ئێوارەی یەزدانیدا، دۆعای بۆ بکات.

سامسۆنی جەللاد و ئەو جەلادەشی کە بە مەقەست کاری ئەشکەنجەدانەکەی ڕاپەڕاندبوو، پاش ئەوەی چەند جار هەوڵدانەکەیان بێ ئاکام مایەوە، هەریەکەیان چەقۆیەکیان لە گیرفانیان دەرهێنا و دەستیانکرد بە لەتکردنی ڕانەکان و جیاکردنەوەی لە جەستە، چوار ئەسپ کە بە هەموو تواناوە لە هەوڵی ڕاکێشاندا بوون، ڕانەکانیان لەگەڵ خۆدا برد: بەم مانایەی کە سەرەتا رانی لای راست جیابووەوە و دوای ئەو رانەکەی دی. هەر ئەم کردارەش سەبارەت بە قۆڵەکان لە ناوچەی شان و بن باخەڵ و چوار تەنیشتەکەی لەش ئەنجامدرا، پێویستیشی کرد کە گۆشتەکان تا سەر ئێسقان ببڕن. ئەسپەکان کە بە توندی تەنافەکانیان رادەکێشا، سەرەتا دەستی راستیان هەڵکەند.

کاتێك کە ئەم چوار بەشەی لەش لە مەیدانەوە بەرەو دەرەوە راکێشرا، قەشە درکێنەر–بیستەکان بەرەو لای هاتن تا بکەونە وتوێژ لەگەڵیدا، بەڵام جەللاد پێیانی گوت کە ئەو مردووە. هەرچەندە راستیەکەی ئەوە بوو کە هێشتا پیاوەکە دەجولاو شەوێلگەی خوارەوەی، سەر و خواری دەکرد، پێدەچوو شتێك بڵێت.

یەکێك لە جەللادەکان پاش نەختێك گوتی: تەنانەت ئەو کاتەشی لاشەکەیمان بۆ سوتاندن بەرزکردەوە، ئەو زیندوو بوو.

چوار ئەندامەکەی لەشیان کە لە تەنافەکان جوێ کردەوە، بەسەر دار و چیلکەو چەوێڵێکدا، کە لە تەنیشت داربەستەکەدا ئامادە کرابوو دا و دواتر لاشەکەیان بە چەوێڵ و پوش و چیلکە داپۆشی و ئەو کایەی کە لەگەڵ دارەکاندا تێکەڵاو ببوو ئاگری تێبەردرا.

.. بەپێی حوکمەکە، تەواوی ئەمانە بوونە خۆڵەمێش. دوابەشی لاشەی سزادراوەکە کە لە خەڵوزەکەدا دۆزرایەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە سەعات لە دە و نیوی شەو تێپەڕیبو، هێشتا بە تەواوی نەسوتابوو. پارچە گۆشتەکان و پەیکەرەکەی نزیکەی چوار سەعات لەناو ئاگردا دەسووتا. فەرمانبەرە دەوڵەتیەکان کە من و کوڕەکەشم لەوان

بووین، لەگەڵ سەربازەکاندا تا سەعات 11 لە شوێنەکەدا مانەوە.

"بۆ سبەی بەیانی سەگێك لەسەر ئەو چیمەنەی کە پێشتر دار و چەوێڵەکەی لێبوو، نووستبوو. چەند جارێك راویان نا بەڵام هەمدیسان بۆ ئەوێ گەڕایەوە. ئاشکرایە کە ئەم ئاژەڵە شوێنی ناوبراوی لە شوێنەکانی دی بە گەرمتر دەزانی".

پاش سێ چارەکە سەدە، لئون فوشە ( *Leon Faucher*) بۆ "خانەی گەنجانی دەستگیرکراو لە پاریس" یاسا و دەستورێکی بەم شێوەیە دارشت: مادەی حەڤدەهەم: زیندانیەکان زستانان سەعات شەش و هاوینان سەعات پێنجی بەیانی چالاکی رۆژانەی خۆیان دەست پێدەکەن. ماوەی تایبەت بەکارکردن لە تەواوی وەرزەکاندا نۆ سەعات دەبێت لە رۆژدا. لە ڕۆژدا دوو سەعات بۆ کاری فێرکردن تەرخان دەکرێت. چالاکیەکانی ڕۆژانە، زستانان لە سەعات نۆ و هاوینان سەعات هەشتی شەو کۆتایی دێت.

مادەی هەژدەهەم: هەستە لە خەو. بە لێدانی تەپڵ و کرانەوەی دەرگای قاوشەکان بە هۆی پاسەوانانەوە، زیندانیەکان دەبێت بەخەبەربێن و لە بێدەنگیدا جلك لەبەربکەن. بە دووەمین دەنگی تەپڵ، دەبێت بە پێوە بن و جێگەی خۆیان رێکبخەن. بە سێیەمین دەنگی تەپڵ، دەبێت بۆچوونە شوێنی نوێژ، شوێنی نزاو پاڕانەوەی بەیانیان، بەڕێکوپێکی ریز ببن. لە نێوان هەردوو لێدانی تەپڵێکدا 5 دەقیقە کات رەچاو کراوە.

مادەی نۆزدەهەم: پاڕانەوە. قەشەی زیندان رێوڕەسمی نزا و پاڕانەوە جێبەجێ دەکا و لەگەڵیدا دەقێکی ئەخلاقی یا مەزهەبی دەخوێنرێتەوە. ئەم کارە نابێت زیاد لە نیو سەعات بخایەنێت.

مادەی بیستەم: کار. لە هاویندا چارەکی بوێت بۆ سەعات شەش و لە زستاندا چارەکی بوێت بۆ سەعات حەوت زیندانیەکان دێنە حەوشە تا لەوێ دەست و دەموچاویان بشۆن و یەکەم ژەمی نانی خۆیان وەربگرن. دواتر، بێ ماتڵ بوون بەسەر گرووپی کاری جیاجیادا دابەشدەبن و دەچنە سەرکار. سەعاتی دەستپێکردنی کار لە زستاندا حەوت و لە هاویندا شەشە.

مادەی بیست و یەك: لە سەعات (10) دە دا، زیندانیەکان بۆ چوونە هۆڵی نانخواردن کارەکانیان جێدەهێڵن. ئەوان بۆ شوشتنی دەست و دەموچاویان و پێکهێنانی گرووپی جیاجیا دەچنە حەوشە. پاش خواردنی نان تا سەعات دە و چل دەقە لە کاتی پشوودا دەبن.

مادەی بیست و دوو: خوێندنگە. کاتژمێر 10.40، بە دەنگی تەپڵ، ریزگەلێك پێکدەهێنرێت کە زیندانیەکان بەشێوەی لێکدابڕاوانە دەچنە خوێندنگەکە. ماوەی خوێندن دوو سەعات دەخایەنێت کە ئەم ماوەیە و بە گۆڕانکاری بۆ خوێندنەوە و نووسین، وێنە و بیرکاری تەرخان دەکرێت.

مادەی بیست و سێ: کاتژمێر 12.40 زیندانیەکان بە پاراستنی ریز و گرووپەکانیان لە خوێندنگە دێنە دەرێ و بۆ پشوودان دەچنە حەوشەکانی تایبەت بە خۆیان. کاتژمێر 12.00 بە دەنگی تەپڵ دووبارە بۆ چوونە کارگە کۆدەبنەوە.

مادەی بیست و چوار: کاتژمێر یەك، زیندانەکان دەبێت لە کارگە ئامادەبن، کارکردن تا کاتژمێر چوار درێژە دەکێشێت.

مادەی بیست و پێنج: زیندانیەکان لە کاتژمێر چواری پاش نیوەڕۆدا بۆ چوونە حەوشە کارگەکان

جێدەهێڵن. لەوێ دەستیان دەشۆن و لە گروپی جیاجیادا بۆ چوونە هۆڵی نانخواردن کۆدەبنەوە.

مادەی بیست و شەش: نانی ئێوارە و ماوەی پشوو تا کاتژمێر 5 درێژە دەکێشێت، لەم سەعاتەدا زیندانیەکان هەمدیسان بەرەو کارگەکان دەبنەوە.

مادەی بیست و حەوت: هاوینان کاتژمێر حەوت و زستانان کاتژمێر هەشت، کارکردن کۆتایی پێدێت. دواژەمی ڕۆژانەی نان لە کارگەکاندا دەدرێت. بە ماوەی یەك چارەك، یەکێك لە زیندانیەکان یان چاودێر دەقێك کە ناوەڕۆکی ئەخلاقییان بە سوودی تێدا بێت، دەخوێنێتەوە. دوابەدوای ئەو نزاو پاڕانەوەی شەوانە دەست پێدەکات.

مادەی بیست و هەشت: زیندانیەکان هاوینان کاتژمێر حەوت و نیو و زستانان کاتژمێر هەشت و نیو، پاش شتنی دەست و جێبەجێکردنی پشکنینی جلەکانیان، کە لە حەوشەی زینداندا ئەنجامدەدرێت، دەبێت بۆ ناو بەشەکانیان بگەڕێنەوە. بە یەکەمین لێدانی تەپڵ، دەبێت جلکەکانیان داکەنن و بە دووەمین لێدانی تەپڵ دەبێت بچنە ناو جێگاوە. دەرگای بەشەکان دادەخرێت و پاسەوانان لە ڕاڕەوەکاندا ئێشکدەگرن بۆ ئەوەی لە بێدەنگی و ڕێکوپێکی نێوەندەکە دڵنیابن.

وەهایە شێوەی ئەشکەنجە و دابەشکردنی کاتی زیندانیەکان. تاوانەکان جودان و سزاکانیش یەکسان نین. بۆ هەریەکە لە زیندانیەکان ئەشکەنجەیەکی تایبەت بەکاردێت. لە نێوان ئەوەی کە "فوشە" نووسیویەتی و ئەوەی کە پێشتر هەبووە، کەمتر لە سەدەیەك جودایی هەیە.

لەم سەردەمەدا، لە ئەوروپا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕێوشوێنێکی نوێ بۆ ئەشکەنجە و سزادانی حوکمدراوەکان گیراوەتەبەر. دەتوانرێت ئەم سەردەمە بەم شێوازە کورت بکرێتەوە: سەردەمی رسواییە گەورەکان بۆ دەزگای قەزائی "دادی" سوننەتی، سەردەمی بیرۆکە چاکسازییە بێ شومارەکان، سەردەمی بیردۆزی نوێی یاسا و سزا و لێکدانەوەی نوێی ئەخلاقی و سیاسی بۆ قانونی سزادان، سەردەمی سڕینەوەی شێوازە کۆنەکان، سەردەمی کاڵبوونەوەی داب و نەریت، سەردەمی داڕشتنی یاسا مۆدێرنەکان. بەڵام داڕشتنی یاسا سزاییە نوێیەکان لە کاتە جیاجیاکاندا ئەنجامدرا: روسیا 1769، پروس 1780، پنسلڤانیا و تڤسکانی 1786، نەمسا 1788، فەرەنسا 1791، 1808.

من لە نێوان تەواوی ئەم گۆڕانکاریانەدا، تەنیا ڕەچاوی یەك خاڵ دەکەم، ئەویش پووکانەوە و نەمانی ئەشکەنجە (تەعزیبە). لەمڕۆدا تاڕادەیەك راکان بەرەو ئەوە دەچن کە ئەم بابەتە بەرەو فەرامۆشی ببرێت. ڕەنگە لەڕووی لێبوردن و بەشێوەیەکی زیادەڕۆیانەوە، سڕینەوەی ئەشکەنجەیان بە حسابی "مرۆڤ بوون" دانابێت، ئەمەش ڕێگەی بەشینەکردنەوەی ناوەڕۆکەکەی دەدا. ئیدی ئەم بابەتە چ گرنگیەکی دەبێت کاتێك بەراوردی بکەین بە گۆڕانکاری مەزنە دەزگاییەکان، یاسا ئاشکراو گشتیەکان، ڕێسا و شێوازە وەکیەکەکانی حوکمدان، بوونی دەستەی حاکمەکان کە لە هەموو جێیەکدا کەم تا زۆر پەسەند کراوە. ئایا تەئکیدکردنە سەر ئەشکەنجەدانە بە شێوازێکی شیاوو ڕێکوپێك کە پاش سەدەی 19 بەشێوەیەکی بەردەوام و بەرەو داڕشتنی ئەشکەنجەگەلێکی گونجاو لەگەڵ دۆخی کەسانی "هەڵە"دا پەیڕەوکرا؟

ئەشکەنجەگەلێك کە بەشێوەیەکی راستەوخۆ جەستەیی نییە، جۆرێك داڕشتنەوە و شاردنەوەیە

لە هونەری ئازاردانادا، یاریەکی زیرەکانەترە بۆ ئازاردانێکی بێدەنگتر و دوور لە بینینی چاو.

دەبێت ئەم خاڵە ببینرێت و بە دیدێکی قوڵتر لێی بڕوانرێت. بەڵام ڕاستیەك لێرەدا شاراوەیە: بە درێژایی چەند دەیە لە سزادانی جەستە ئەشکەنجە، پارچەپارچە کردن، لێکردنەوەی ئەندامی کەسی هەڵەکار، بریندارکردنی سەر و دەموچاوی، شانەکانی، ئیدی نەما.

بەم شێوەیە بە تێپەڕبوونی کات، لە بایەخی جەستە وەك ئاکامی سەرەکی لە سزادان و تەمێکردن، کەمبۆوە.

لە کۆتایی سەدەی هەژدەو دەستپێکی سەدەی نۆزدە، جگە لە چەند بابەتێکی توند، جەژنی شوومی تەمێ کردنی هەڵەکاران رووە و خامۆشی ڕۆیشت. لەم گۆڕان و جیاوازبوونەدا، دوو ڕێچکە لێکیاندا کە لە هەمانکاتدا، کە مێژوویەکی تەواو لێکچوویان هەیە، هۆکاری پەیدابوونیان نایەکسانە. لە لایەکەوە، نیشاندانی سزادان لە شوێنی گشتیدا، لابرا، دواتر مەراسیمی سزادانی تاوانبار وەلانراو ئیدی هەندێك پلەی کەوتە بەر رەوتی یارمەتیدان. سزادان لە شوێنی گشتیدا لە فەرەنسا بۆ یەکەم جار لە ساڵی 1791 و دوای ماوەیەکی کورت لە دووبارە بوونەوەی، جارێکی دی لە ساڵی 1830دا بۆ هەمیشە سڕرایەوە.

سزادانی بەستنەوە بە عەرەبانە و بردنی بۆ پێشچاوی خەڵك لە ساڵی 1789 لە فەرەنسا و لە ساڵی 1837 لە بەریتانیا، هەڵگیرا. ئەو بێگاریانەی کە لە نەمسا، سویسراو هەندێك لە ویلایەتەکانی ئەمریکا وەك پەنسلڤانیا لە شوێنی گشتی شەقامەکان و شاڕێکاندا ئەنجامدەدرا، لە کۆتایی سەدەی هەژدە و سەرەتای سەدەی نۆزدەدا، ئیدی سڕایەوە و کاری پێنەکرا. ئەم تۆڵە سەندنەوەو سزادانە بەم شێوەیە بوو کە سزادراوەکە بە تەوقێکی ئاسنی لەملدا، جلکێکی ڕەنگاورەنگ لەبەردا و تۆپێکی ئاسنی لە پێدا کە بە زنجیر بە پێکانیەوە بەسترابوو، لە کاتێکدا کە خەڵکی، قسەی ناشرین، ناوەناتۆرە، لێدان و تێهەڵدانی سەرچاوە گرتوو لە ڕق یان هەستکردن بە گوناحیان لەگەڵدا بە کاردەهێنا، دەنێردرایە ناوچەی بێگاریکردنەکە. بە نمایشکردنی حوکمدراوان لە فەڕەنسا، سەرباری ڕەخنەگەلێکی بەهێز، تا ساڵی 1837 درێژەی کێشا. ریاڵ (*Real*) ئەم سزادانانەی بە "دیمەنە رقهەستێنەکان" ناودەبرد. ئەم جۆرە مەراسیمانە سەرەنجام لە ئەپریلی 1848دا هەڵوەشا. بەڵام لە ساڵی 1837، بردنی زیندانیەکان لە سەرانسەری فەرەنسا تا برێست (*Brest*) و تۆلۆن (*Toulon*) هەڵوەشێنراو لە بری، عەرەبانەگەلێکی بە روخسار ئامادەکراو، ڕەنگ ڕەش و دەرگا داخراویان بەکاردەبرد. سزادان هێدی هێدی ئەو حاڵەتە نمایشیەی خۆی لەدەستدا. لەوەودوا هەر شتێك کە دەیتوانی نمایشیانە بێتە بەرچاو، رێی پێگیراو نێگەتیڤ بوو. دەتگوت هێواش هێواش کارکردی مەراسیمی سزایی بۆ خەڵکی بووە شتێکی نەشیاو، بۆ درك پێکردن. مەراسیمی حوکمدانی تاوانبارەکان، ئەگەر لە رووی وەحشیگەرییەوە خراپتر لە تاوانی تاوانبار نەبوو بەلایەنی کەمەوە، بەرابەری دەوەستا، لەم رووەوە خەڵکی شکیان هەبوو کە ئەم مەراسیمە بتوانێت لایەنە خراپەکانی (هەستان بە تاوان) نیشانی خەڵکی بدات. ئەم نمایشە، تەماشاچییانی بە دڵڕەقی رادەهێنا، لە کاتێکدا کە مەبەستی سەرەکی لەو مەراسیمە، دوورخستنەوەی خەڵکی بوو لە دڵڕەقی. مەراسیمی ناوبراو خۆی لە خۆیدا درێژەی نمایشی سەرپێچیکردن بوو، بەشێوەیە کە لە جەللاد

تاوانبارێك و لە دەزگای دادوەریش، پیاوکوژێکی دروست دەکرد لە دوا چرکەشدا بە هەڵگەڕانەوەی دەورەکان، سزادراوەکە دەکەوتە بەر ڕێژنەی سۆز و بەزەیی. (بکاریا) ئەم خاڵەی زۆر پێشتر لەمانە باسکردبوو:

"ئێمە بێ هیچ پەژارەیەك و بە خوێنساردیەوە، لە مەراسیمی پیاو کوژیدا رادەوەستین کە خۆی لە خۆیدا تاوانێکی تۆقێنەر و گەورەیە".

بەم شێوەیە، سزادانەکان ناوخۆیی ترین و شاراوەترین بەشی رەوەندی سزاییان پێکدەهێنا.

ئەم ڕووداوە چەند ئاکارێکی لەگەڵدایە: سزادان هێدی هێدی فەزای هەستیە ڕۆژانەکان بە مەبەستی چوونە فەزای هۆشیاری زەین و گۆشەگیرەوە، بەجێدێڵێت؛ لەمەولا کاردانەوەی تەمێ کردنیان نەك لە هێز و ئاستی دەستلێدراو و دیاریەوە، بەڵکو لە دەوری دیاریکەریدا بۆی دەگەڕێن؛ ئەوەی مەبەستە ئیدی نمایشی بێزراوی سزادان نییە، بەڵکو دڵنیابوون لە جێبەجێکردنی تەمێ کردنەکە دەبێت ببێتە هۆی پاشگەزبوونەوە لە ویستی کردن و ئەنجامدانی تاوان؛ میکانیزمی تەمێ کردنی تاوانباران رەوەندێکی دیکەی دەبێت. لە ئاکامدا دەزگای دادوەری لەگەڵ ئەوەدا کە لێپرسراوی راپەڕاندنی سزادانە، ئیدی ئەرکی جێبەجێکردنی بەشی ئاشکرای سزادانی توندوتیژی لە ئەستۆدا نیە. ئەگەر ئەم دەزگایەش دەست بکات بە ئەنجامدانی کوشتن و لێدان، مانای بەهێزی دەزگاکە نییە بەڵکو یەکێك لە پێکهاتە کارکردیەکانی دەزگاکەیە کە بە ناچاری دەبێت لەگەڵیدا رابێت بەڵام بەهەرحاڵ لێبوردن خاڵی نییە لەکەموکوڕی.

گوتن و شیکردنەوەی رسوایی، روخسارگەلێکی دی وەردەگرێت: لە نمایشە سزاییەکاندا، (سێدارە) بەردەوام رقێکی نادیاری دەهێنایە ئاراوە کە هەم جەللاد و هەم مەحکومی دەگرتەوە. هەرچەندەکە ئەم رقە، بەردەوام دەبووە هۆی ئەوەی کە کینەی تەماشاچییەکان بەرامبەر بە سزادراوەکە بگۆڕدرێت بە سۆز و بەزەیی و تەنانەت شانازیەك بێت بۆ سزادراوەکە و توندوتیژی جەللاد ببێتە هۆی قێزەونکردنی (جەللاد) لەلای خەڵك. لەمەولا رسوایی و شانازی بە شێوازێکی دی دابەش بوو؛ پرۆسەی سزادان ئیدی نیشانەیەکی نێگەتیڤ و ئاشکرا بوو بۆ تاوانبار. لەمڕووەوە ئیدی دادگایی کردن و راگەیاندنی راوبڕیارەکە بە ئاشکرا دەبێت، بەڵام جێبەجێکردنی حوکمی سێدارە وەك نەنگ و شەرمێك دەبێت بۆ دەزگایی قەزایی و دەزگاش لە راپەڕاندنیدا هەست بە نەنگ دەکات. بۆیە دەزگای دادوەری دەیەوێت ئەم بەرپرسیارێتیە بهاوێتە سەرشانی ئەوانی دیکە و بە نهێنی دەقی بڕیارەکە واژۆ بکات. لە ئاستی (تەمێکردندا بوون)، خۆی لە خۆیدا ڕووداوێکی ناشایستە بەڵام تەمێکردنیش، شانازییەکی ئەوتۆ نیە. لەم ڕووەوە، هێزی دادوەری لە نێوان خۆی و ئەو سزایەی کە پیادەی دەکات، پەرژینێك دەبینێت. راپەڕاندن و جێبەجێکردنی حوکم، هێدی هێدی دەبێتە بەشێکی سەربەخۆ و پێکهاتە کارگێڕیەکان، دادگا لەم بەڵایە رزگار دەکەن.

ئەم خاڵە مایەی سەرنجە کە لە فەرەنسادا، سیستمە ئیداریەکانی زیندانیان کە ماوەیەکی بەرچاو لە ژێر چاودێری وەزارەتی وڵاتدا بوون، زیندانیانیان بۆ بێگاری کردن لە ژێر چاودێری هێزی دەریایی یان ناوچە داگیر کراوەکاندا راپێچدەکرد.

لە تان و پۆی ئەم دابەشکردنی دەورانەدا، بەرپەرچدانەوەی بیردۆزێك دەسەلمێت کە: نابێت وا

بزانرێت کە بەشی سەرەکی ئەو سزایەی کە ئێمەی دادوەران دەیسەپێنین بەسەر سزادراوەکاندا، بە مەبەستی تەمێ کردنیانە، بەڵکو ئامانج لە راستیدا چاککردنی تاک، ئاقڵکردنی و چارەسەریەتی.

بە بەکارهێنانی هونەرەکانی چاکسازی سەرپێچی، هۆکارەکانی دوورخستنەوەی سزایی جەستەیی لە بەرامبەر سەرپێچی دەستەبەر دەبێت و ئەمە، دادوەران لە پیشەی پەستی سزای جەستەیی، رزگار دەکات. لە دەزگای دادی مۆدێرن و لە نێوان ئەو کەسانەی کە سەرقاڵی کاری دادگایین و بڕیار بەدەستن، رقێکی پڕ لە شەرم بەرامبەر بە پیادەکردنی سزای جەستەیی، بوونی هەیە کە بەردەوام روو لە زیادبوونە: وەها برینێك هۆکاری زۆربوونی ژمارەی دەروونناسان و کارمەندە باڵاکانی بواری چاکسازییە.

## سەرچاوە

نیچە، فروید، مارکس، چاپی یەکەم 1381، جسم محکومان، ترجمە مهرداد نورایی، ل 29-39.

# دوا گفتوگۆ
# لەگەڵ سامۆییل بێکیت دا

لە فارسییەوە: ئازاد بەرزنجی



لە لۆبی هۆتێل دانیشتبووم چاوەڕێی بێکیت بووم کە بینیم کەسێك لە دەرگای کافتیریاکەوە هاتە ژوورێ، بەلامدا تێپەڕیو کاتێ گەیشتە ناوەڕاستی ڕاڕەوەکە وەستا. پێدەچوو بەدوا کەسێکدا بگەڕێت. وەختێ ئاوڕی لە من دایەوەو بەرەو ڕووی من هات، یەکسەر تێگەیشتم ئەو وێنەیەی کە لە خەیاڵی خۆمدا سەبارەت ئەو دروستم کردبوو، ڕاست دەرچوو: تەواو خۆی بوو.بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا سەیرم لێ هات کە زۆر لەو وێنانەی خۆی ناچێت کە لە کتێب و گۆڤارەکاندا بڵاو دەبنەوە. باڵایەکی قیت و ڕێك.

چاوە ڕوون و تیژەکانی ئەدرەوشانەوە. بە دەموچاویدا کە زۆر چرچولۆچ نەبوو قورس بوو بڕوات بکردایە کە ئەم پیاوە تەمەنی لە هەشتا تێپەڕیوە.

بانگی کردم تا لەگەڵیدا بچم بۆ کافتیریاکە. لە کاتێکا من نیگەرانی ئەو چاوپێکەوتنە بووم کە قەراربوو لەگەڵیدا ئەنجام بدەم، چونکە زۆرجار ئەوەم خوێندبۆوە کە بە هیچ جۆرێك حەز ناکات کەس لەبارەی کار و بەتایبەتیش شانۆنامەکانییەوەو نمایش کردنیان لەگەڵیدا بدوێت. لەمەش گرنگتر ئەوە بوو کە لە هاوڕێ نزیکەکانیەوە بیستبووم کە تاقەتی ئەوەی نییە پرسیاریشی لێ بکرێ. بیرم لەم شتانە ئەکردەوە.

کاتێ بە پلەکاندا سەردەکەوت چاوم بە پێی کەوت، زانیم کە گۆرەویی لەپێ نەکردووە، بەراوردکردنی پێستە سپییەکەیو پێڵاوە ڕەشەکەی و شێوەی کراس و پانتۆڵەکەی ، "ستراگۆن"ی بیرهێنامەوە کە پاڵەوانێکی ناسراوێتی .هەموو شتێکم بیرچۆوەو نوقمی شوبهاندنی ئەو بووم بە کاراکتەرە کۆمێدییەکان. بێکیت یەکسەر بەرەو مێزێکی مەرمەڕ چوو کە نزیکی پەنجەرەیەك بوو کە بەڕووی بۆلڤارێکدا ئەیڕوانی، پاش کەمێك وتی: "نزیکەی سی ساڵ ئەبێت کە کەسە

خۆشەویستەکانی خۆی بۆ ئەویٚ ئەهێنێت، ئەو شوێنەی کە زۆر حەزی لێیە، لەودیو مێزە سوورەکەوە."کە ئەو شتانەی دەوت بە هەستێی پڕگوزارشتیشەوە دەستی بۆ مێزەکە درێژ ئەکرد. دیسانەوە دووبارەی کردەوە کە ئەو مێزەی چەند خۆش ئەوێت.

پاشان داوای قاوەیەکی گەورەی بۆ خۆیو چایەکیشی بۆ من کرد. ئەو هەلەم قۆستەوەو ئەو کتێبانەی خۆی کە کرابوون بە فارسی و کتێبێکی وێنەداری عومەر خەییام و هەروەها نامەو پۆستەری نمایشی کارێکیم داپێی کە دەرهێنەرێکی ئەمریکایی ناردبووی.

هەرلەو کاتەدا کە خەریکی کردنەوەی نامەکە بوو یەکسەر ڕای گۆڕیو وتی: "دوایی سەیری ئەکەم" و خستیە ئەولاوە، بەڵام بەوردی سەیری پۆستەرەکەی کرد. خەتە فارسییەکەی کارە وەرگێڕراوەکانی ئەوی سەرسام کردبوو. پرسیی: ببوورە من لەم زمانە ناگەم. لە زمانی تزارەوە تەرجەمە کراوە؟ ببورن مەبەستم شایە..... منیش وتم بەڵیٚ ژمارەی ئەو دەزگایانەم دایێ کە کارەکانی ئەویان تەرجەمەو چاپ کردبوو باسی ئەو شانۆنامانەیم کرد کە لە ئێران و بەتایبەتیش لە زانکۆ پێشکەش کرابوون. ئەو هەموو ئەم شتانەی خستە لاوە .پاشان پرسیم:

–ئەتوانم ئەم چاوپێکەوتنە بەشریت تۆمار بکەم؟

سەری دانەواند و بە شەرمەزارییەکەوە وەڵامی دایەوە:

–ببورن، نەخێر، وام پیٚ باشترە ئەوە نەکەن.

منیش دەستم بە پرسیار کرد.

–ئایا ئەتوانین بڵێین کە مرۆڤ گیانەوەرێکە لە حاڵەتی چاوەڕوانیدایە؟

بێکیت نوقمی بیرکردنەوە بوو و مژێکی لە جگەرەکەی دا، وەڵامی دایەوە:

–لە ڕاستیدا مرۆڤ چاوەڕێی شتێکە کە خۆی دەیەوێت! کاتیٚ لەم بارەیەوە دەمنووسی هەرگیز لە خۆم نەدەپرسی کە من خۆم چاوەڕوانی چیم؟

پاشانیش وەکو بیرمەندێك بەردەوام بوو وتی:

–مرۆڤ هەمیشە لەحاڵەتی چاوەڕوانیدایە. ئەمە حەقیقەتە. ئەمە یەکێکە لە لایەنەکانی مرۆڤ، یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی.

بێکیت کاتیٚ دەگاتە ئەوەی سەبارەت بە مەسەلەی چاوەڕوانی وەڵام بداتەوە وا دەردەکەویٚ خۆی لیٚ بدزێتەوە، بەتەواوی پێوەی دیارە کە حەز ناکات لەم بارەیەوە قسە بکات. سەرنجم دا کە پیاوێکی نیگەرانەو ناتوانێت بەردەوام مژ لە جگەرەکەی نەدات. هەر لەو ماوە کەمەدا سیٚ جگەرەی دیپلۆماتی کێشابوو. زەینی پەرتەوازە بوو، تەنانەت کە جگەرەکەشی کوژابۆوە ئەو هەر مژی لێئەدا.

پرسیم:

–ئایا تۆ خۆت قەت چاوەڕوانی کەسێك یان شتێك بوویت؟

بێکیت وەڵامی دایەوە: "نا،نازانم!"دیسانەوە خۆی لە وەڵام دزییەوە. بەدەم قاوە خواردنەوەکەوە وتی: "من بە پەندێك وەڵامتان ئەدەمەوە: بەدرێژایی شەو چاوەڕوانی هاتنی ڕۆژیت و بەدرێژایی شەویش چاوەڕوانی شەویت تا خەو ببینیت. ئەمە خولانەوەیەکی بازنەئاساو بێکۆتاییە. "پاشان ئاگاداری کردمەوە کە قسەکانی بە جیددی وەرنەگرم و دەستی کرد بە پێکەنین _بەدرێژایی گفتوگۆکەش ئەمە حاڵی بوو تا قۆشمەیی خۆی بسەلمێنێت_ بەهەرحاڵ ئەمە سێیەم جار بوو داواکەم ڕەتبکاتەوەو نوقمی بیرکردنەوە بوو: جارێکیان کە وتم با گفتوگۆکەمان بە شریت تۆمار بکەم و جارێکی تر کە ویستم وێنە بگرین و، سێیەم جاریش کاتیٚ کە سەبارەت بە چاوەڕوانی دواین.

–ئێوە لە وەرگێڕانە ئینگلیزییەکەی "لە چاوەڕوانیی گۆدۆدا" دەتانویست بڵێن کە چاوەڕوانی شتێکی پیرۆزە؟ گەرچی تەنها لە پێناوی چاوەڕوانیشدا بێت! لەبەرئەوەی چاوەڕوانی ئەنجامی وێناکردنەو ڕەتکردنەوەی دۆخی هەنووکەییە.

بێکیت سەرەتا لەبیری چووبوو کە شتێکی وای نووسیوە. پاش کەمێك بیرکردنەوە قبووڵی کرد کە لەڕاستیدا چاوەڕوانی لەپێناوی چاوەڕوانیدا شتێکی پیرۆزە.

–ئێوە وتتان کە گۆدۆ خوا نییە. بەڵام پاش هەموو ئەمانە، ئەو ڕزگارکەری ستراگۆن و ڤلادیمیرە کە نوێنەری مرۆڤایەتین. کاتێ ئێوە ئەم شانۆنامەیەتان دەنووسی بیرتان لە مەسیح نەدەکردەوە؟

بێکیت وتی: "نەخێر، کاتێ لە چاوەڕوانیی گۆدۆدام دەنووسی نە بیرم لە مەسیح و نە لە خواو نە لە هیچ کەسێك دەکردەوە."

–بوونگەراکان ئەڵێن مرۆڤ ئازادە، خۆی چارەنووسی خۆی هەڵدەبژێرێت و خۆیشی لەوە بەرپرسیارە. بەهەرحاڵ نابێ چاوەڕوانی نێوەندێك یان ڕزگارکەرێك بێت لە ئاسمانەوە. ئێوە لە شانۆنامەکەتاندا جەخت لەسەر ئەوە ناکەنەوە؟

بێکیت وتی: "هەرگیز بیرم لەوە نەکردۆتەوە. پێم بڵێ بوونگەرایی چییە؟"

دەستی کرد بە پێکەنین و وتی:" من فەیلەسووف نیم."

–گەرچی لە شانۆنامەی لە چاوەڕوانیی گۆدۆدا ئاماژە بۆ کتێبی پیرۆز هەیەو لە هەندێ وڵاتدا کە کۆڵکەی دینەکەیان بە چاوەڕوانییەوە بەندە ئەم شانۆنامەیە بە دژەدین لەقەڵەم ئەدرێ، ئێوە خۆتان لەم بارەیەوە چی دەڵێن؟

بێکیت بە سەرسوڕمانەوە ئاماژەی کرد کە تێناگات چی دەڵێم و پرسیی: "ئایا ئەم شانۆنامەیە لە تاران پێشکەش کراوە؟" منیش وتم بەڵێ .ئەیویست بزانێ کەی و لە کوێ. وتم: "لە زانکۆکانی تاراندا و لە زەمانی شادا."

–ئێوە کە نمایشە جیاوازەکانی شانۆنامەکانی خۆتان دیوە، کامیانت لا پەسەند بووە؟

لەساڵی 1955دا نمایشی کارێکی خۆی بینیبوو کە دەرهێنەرێکی ئەڵمانی دەریهێنابوو و کەیفی پێ نەهاتبوو، بگرە بیرەوەرییەکی ناخۆشیشی لا جێهێشتبوو. بەشێوەیەکی گشتی یەکەمین نمایشی لەندەنیشی بەدڵ نەبوو. بەڵام دەرهێنانەکەی "ڕۆجێ بلین " ی پێ باش بوو، نەشیتوانیوە ئەوەی "ئالان شنایدەر" ببینێت، لە کاتێکا ئەو زۆر باش دەناسێت و متمانەی پێیەتی و دەشزانێ کە دەرهێنەرێکی باش بوو و هاوڕێیەکی باشیش بوو و، بێکیت بۆ مەرگی بێتاقەت بوو.

–ئەی ئێوە دەرهێنانەکەی کریجاتان بینیبوو؟

نەیبینیبوو، بەڵام زۆری لەبارەوە بیستبوو و دەیزانی کە نمایشێکی سەرکەوتوو بووە، جگە لەوە قەرار بوو هەفتەی داهاتوو "ڕۆفۆس"ببینێت، ئەو ئەکتەرەی کە لەدوا نمایشی ئەو شانۆنامەیەدا لەگەڵ "میشیل بۆکێت" دا بەشدار بووبوو.

–بۆچی ئێوە ڕازی نەبوون "جوانی ئاکالیتیس" شانۆنامەی"دواگەمە" لە بۆستۆن دەربهێنێت.

لە پێکەنینەکەی وەستا، وتی کە لە کاری ئەو زۆر ناڕازیم و تەنانەت ویستم بەشێوەیەکی یاسایی لێی بپێچمەوە. بەڵام دوایی وازی لەوە هێنابوو و زیاتریش ئەوەی پێ ناخۆش بوو کە نمایشەکە پێشکەش کرابوو بە ئالان شنایدەر، ئەو دەرهێنەرەی کە باش لە کارەکانی بێکیت دەگەیشت و ئەمەکداری بوو.

بێکیت وتی کاتێ وێنەی هەندێ لەدیمەنەکانی شانۆنامەکەم پیشانی ئالان دا ڕتیکردەوەو وتی "بۆ خۆتیان هەڵگرە" وتی: "زۆر سەیرە، من وامدەزانی ئەو ژنێکی زۆر هوشیارە. نازانم بۆ وایکردووە!!" بێکیت بەڕقەوە باسی ئەو دەرهێنەرانەی کرد کە چیتر گوێ بە ڕێنوێنییەکانی نووسەر نادەن و خۆیان چییان پێ خۆش بێت ئەوە دەکەن.

دیسانەوە گەڕایەوە سەر دەرهێنانەکەی جوانی ئاکالیتیس کە چۆن وێستگەیەکی ژێرزەمینێکی چۆڵی بۆ شوێنی ڕووداوەکان هەڵبژاردووە کە لە دەقی "دواگەمە"دا وانییە و وتی شتێکی زۆر ناشرینە کە دەرهێنەرەکان حیساب بۆ ڕێنماییەکانی نووسەر ناکەن سەبارەت بە دیکۆر !بەلای بێکیتەوە نمایشی سادە باشترین جۆری نمایشەو ئاماژەی بۆ نواندنەکەی "مادلین ڕۆنۆ" کرد کە لە نمایشی "ڕۆژە خۆشەکان"دا زۆر جوان دەوری بینیوەو وتی ئەو ژنە بۆ شانۆ ئەژی.

–ئێوە خۆتان لە نمایشی" لەچاوەڕوانیی گۆدۆدا" فەزای چاوەڕوانییەکەتان چۆن دەبینی؟

بێکیت کە بە دەستی خەتی لەسەر مێزە مەڕمەڕەکە دەکێشا وتی: "دوو کەس بەرەو ڕووی یەك دێن و هەریەکەیان دەیەوێ بۆ شوێنێك بچێت، پاشان لەگەڵ یەکدا دەگەڕێنەوە و ئیدی ناتوانن لە یەکتر جیا ببنەوەو دەبێ لەگەڵ یەکدا بن." سەرنجی منیشی بۆ ئەوە ڕاکێشا کە لەم کارەیدا جووڵە ڕۆڵێکی زۆری هەیە، لەبەر ئەوەی ئەو کەسانەی لەچاوەڕوانیدان کەسانێکی نیگەران و شپرزەن و بەردەوام لەجووڵەدان.

–ئێوە لەگەڵ ئەوەدا نەبوون کە لە ئەڵمانیا ئەکتەری ژن لە نمایشی "لەچاوەڕوانیی گۆدۆدا" بەشدار بن، بۆچی؟

"گرنگ نییە!" دەستی کرد بە پێکەنین و بە گاڵتەوە وتی: "لەبەر ئەوەی ژن غوددەی پرۆستاتی نییە." لەکاتێکا خەریکبوو ئەپچڕا لە پێکەنیندا سێ جار ئەمەی دووبارە کردەوە "بۆیە ئەوان ناتوانن دەوری پیاوان ببینن و ئەم شاٍنۆنامەیەش بۆ پیاوان نووسراوە."

–کاراکتەرەکانی تۆ هەمیشە کەسانێکی بەساڵاچوون. بۆمان ڕوون ئەکەیتەوە بۆ؟لەکاتێکا تۆ ئەمانەشت نووسیوە کە لاو بوویت؟ بێکیت بە دڵنیاییەوە وتی :"نا هەموویان بەساڵاچوو نین. کاراکتەری لاویشیان تیایە. لەڕاستیدا من تەمەنم بەلاوە مەبەست نەبووە." کاتێ ئەوەم بیر هێنایەوە کە کەسانی شانۆنامەکانی "لە چاوەڕوانیی گۆدۆدا" و "دواگەمە" و "دوا شریتی کریپ" هەموویان بەساڵاچوون، وتی وایە بەڵام هیچ پاساوێکی بۆ ئەوە نەهێنایەوە.

–ئێوە خۆتان چۆن پێگەی شانۆنامەکانی خۆتان هەڵدەسەنگێنن لە کاتێکا لەتەواوی دونیادا پێشکەش کراون؟

یەکسەر وەڵامی دایەوە: "لە تەواوی دونیادا نا !هێشتا لە مۆسکۆ پێشکەش نەکراون، بەڵام دەکرێ. ناشزانم بۆ، چونکە لێی تێناگەم." کەمێك بیری کردەوە و لە کاتێکا بەدەمی نووقاوەوە پێدەکەنی وتی: "دەزانی من لە ئێرلەندەدا زۆر بەناوبانگم." کەمێك بێدەنگبوو و ئینجا وتی: "ئەمەوێ بەسەرهاتێکت بۆ بگێڕمەوە، شانۆنامەی لەچاوەڕوانیی گۆدۆدا سەرەتا لە بەندیخانەیەکی ئەمریکادا پێشکەش کرا و زیندانییەکان زۆریان پێ خۆش بوو، لەبەر ئەوەی زۆر باش لە شانۆنامەکە گەیشتبوون، چونکە زۆرباش دەیانزانی چاوەڕوانی یەعنی چی؟ دەزانی، ئەو کابرا زیندانییەی کە دەوری دەبینی ئازاد کراو تائێستاش وەکو ئەکتەر کار دەکات."

–ڕەخنەنووسان وەکو "یۆنسکۆ" ئێوەش بە یەکێك لە نووسەرانی "شانۆی ئەبسۆرد" (شانۆی

نامەعقول) لەقەڵەم ئەدەن. قسەکەی پێ بڕیم و وتی: "ئەمانە کۆمەڵێك وشەن و هیچی تر .ناولێنانی بێمانان." پاشان وتی: "من قەت نووسینی ڕەخنە نووسەکان ناخوێنمەوە."

–ئێوە سەبارەت بە شانۆنامەکانی یۆنسکۆ ڕاتان چییە؟

بێکیت وتی کە شانۆنامەکانی سەرەتای بەدڵ بووە.یۆنسکۆ هاوڕێیەکی باشی بووە و زۆر ڕێزی لێ دەگرێت. ئینجا پرسیی ئاخۆ من یۆنسکۆم دیوە، منیش وتم: "بەڵێ پیاوێکی گەورە بوو و هاوڕێیەکی میهرەبانیش بوو. تەنانەت پێشەکیەکی بۆ ئەو دکتۆرانامەیم نووسی کە من پێشکەشم کردبوو بە شانۆنامەی "کەرکەدەن"ی ئەو.

–هیچ شانۆنامەیەکی تازەتان نووسیوە؟

بێکیت وتی کە لە ساڵی 1983 ەو هیچی نەنووسیوە، لەبەر ئەوەی مەیلی نووسینی نەبووە، بەڵام ئەیەوێت نمایشێکی دە دەقیقەیی بۆ تەلەفزیۆنی ئەڵمانی لە شتوتگارت بنووسێت. بێکیت پێی خۆش بوو بچێت بۆ ئەڵمانیاو لەوێ کاربکات، لەبەر ئەوەی بڕوای وابوو کە خەڵکی ئەڵمانیا زۆر باش کار ئەکەن. بابەتی ئەو نمایشەش "بێدەنگی"یە.

–ئێوە فیلمی بێدەنگی لە بێدەنگیداتان بینیوە کە بۆ تەلەفزیۆنی ئینگلیزی بەرهەمهێنراوە؟

بێکیت کردی بە فەرەنسی "*dun silenent a l autre*". بەرلەوەی پیشانبدرێ بەشێکی لێ بینیوەو بەڕای ئەو فیلمێکی زۆر جوان و سەرنجڕاکێشە، بەتایبەتیش تۆنی دەنگی ئەکتەرەکەی زۆر بەدڵ بوو. هەروەها وتی کە ئەو دەرهێنەرە دەناسێت و لە دۆبلن ناسیویەتی. ئەو پرسیارانەی دەمویست بیانکەم تەواو بوون و ئەویش تازە دەستی کرد بە پرسیارکردن لە من و یەکەمین پرسیاریشی دەربارەی ئەو هاوڕێ ئەکتەرەم بوو کە لەگەڵمدا هاتبوو و ناوی چارلز گۆنزالس بوو. بێکیت پرسیی ئاخۆ گۆنزالس کە دەرهێنەرە هیچ کارێکی ئەوی کردووە؟وەڵامەکە نەرێ بوو.پاشان پرسیی :ئاخۆ ئێمە ژان لۆك گۆدارمان خۆشدەوێ؟ لەبەر ئەوەی ئەو خۆی زۆری خۆشدەویست و دواتر دانی بەوەدا نا کە هەرگیز بۆ سینەما ناچێت و لەماڵەوە سەیری ڤیدیۆ دەکات.

–ئایا ئێوە قورئانتان خوێندۆتەوە؟

"بەڵێ، بەڵام زۆر قورس بوو."

لەبارەی دوا شانۆنامەیەوە قسەمان کرد کە لە ساڵی 1983 دا نووسیبووی. دەیوت کە لە دەرەوە نمایشکراوە، بەڵام لە فەرەنسادا نمایش نەکراوە. پاشان ئەو هەواڵەی دایێ کە "لە چاوەڕوانیی گۆدۆدا" دووبارە لە نیویۆرك پێشکەش دەکرێ و بەو زووانە "داستن هۆفمان" و " ڕۆبرت ڕێدفۆرد" دەبینێت. ئەو ئەکتەرانەی کە قەرارە لە نمایشی نوێی شانۆنامەکەیدا دەور ببینن.

چارلز گۆنزالس وتی دەتوانێ چ دەورێك لە شانۆنامەکانی بێکیت دا ببینێت؟

بێکیت وتی: دەوری کلۆڤ *clov* لە شانۆنامەی "دواگەمە"دا.

لە کۆتاییدا سوپاسی بێکیتم کرد کە وەڵامی پرسیارەکانی داینەوە.

## سەرچاوە

ئەمە وەرگێڕانی ئەم نامیلکەیەیە:

"آخرین مصاحبه با ساموئل بکت" احمد کامیابی مسك، برگردان: فریده رازی، تهران – انتشارات آرویج، چاپ اول 1381(2002).

# لەگەڵ ڕامین جەهانبەگلودا

لەفارسییەوە: کارزان محەمەد



د. رامین جەهانبەگلو لەساڵی (1966)ز لەشاری تاران لەدایك بووە، پلەی کارناسیو کارناسیباڵای لەساڵانی (1981-1983)دا لەبوارەکانی فەلسەفەو مێژوو و زانستە سیاسییەکانی لە زانکۆی سۆربۆندا بەدەستهێناوە.

ئەو لەساڵی (1998)دا توانی پلەی دکتۆرا لە بواری فەلسەفە لە هەمان زانکۆدا بەدەست بهێنێت. هەروەها لە هەمان زانکۆدا دکتۆرای باڵای لە رۆژهەڵاتناسیدا بەدەستهێناوە.

چالاکییە فێرکارییەکانی د.جەهانبەگلو لە ساڵی (19993)دا لە ئەنجومەنی حیکمەت و فەلسەفەی تاران دەستیپێکردووە. ناوبراو لەم ساڵانەی دواییدا وەك لێکۆڵەرەوەیەك لە ئەنجومەنی ئێرانناسی فەرەنسا لە تاران سەرگەرم بووە. چالاکییە فێرکارییەکانی ناوبراو، وەك مامۆستای بواری فەلسەفەی سیاسی لە زانکۆی تۆرنتۆدا بەردەوام بووە.

د. جەهانبەگلو ئێستا سەرپەرشتیاری گروپی هرزی هاوچەرخە لە نوسینگەی توێژینەوە کلتورییەکان. بەرهەمەکانیشی بریتین لە (بەجیهانیبوون، راڤەکاریی هیگڵی، شارستانییەت و نوێبوونەوە، شەپۆلی چوارەم، مۆدێرنێتەو دیموکراسیو رۆشنبیران، رەخنەی عەقڵی مۆدێرن، مۆدێرنەکان، هرزی ناتوندوتیژی، گەران بەدوای ئازادیدا، کلاوزڤیتس و تیۆری جەنگ، ماکیاڤیلیو هزری رێنسانس، ویژدانی ژیان، شۆپنهاوەرو رەخنەی عەقڵی کانتی، هیگڵ و سیاسەتی مۆدێرن، رۆشنبیری لە ئێران..) ئەمەی خوارەوەش بەشێکە لە گفتوگۆیەکی فرەرەهەند لەگەڵ جەهانبەگلوی بیرمەندا.

******

*** پێناسی تۆ بۆ کلتور و پیشەسازی چییە؟**

– کلتور کە لەڕاستیدا کۆمەڵە دابونەریت و ڕەوت و چەمکگەلێکی کۆمەڵایەتییە کە لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر دەگوازرێتەوە. لەڕاستیدا بەبێ بوونی ئەم ڕەوتانە پێوەرو چەمکە کۆمەڵایەتییەکانی هیچ کۆمەڵگایەك ناتوانن چوارچێوەیەکی سیاسی یاخود کلتوری بۆ خۆیان پێکبهێنن و بتوانن نەوەی نوێیان فۆرمەڵە بکەن. بۆ نمونە لەهەر کۆمەڵگایەکدا ڕەوتە کلتورییەکان هەن کە رۆڵی پیاو و ژن و لاو دەستنیشان دەکات و یاخود دیاری دەکەن. ئەم کۆمەڵگایانە دەبێ چ جۆرە دەستورێکیان هەبێت، تێڕوانین بۆ جیهان و بۆ خودی خۆی چۆن بێت؟ بۆئەوەی بتوانن پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتیمان هەبێت، گوتەزای کلتور یەکێکە لە گوتەزا کلیلییەکان. ئەم تایبەتمەندییە لەتەواوی سەردەمەکانیشدا هەبووە. بۆ نمونە ئەگەر کۆمەڵگای ڕۆمای کۆن، یۆنانی کۆن یاخود ئێرانی کۆن لەگەڵ کۆمەڵگایەکی مۆدێرنی ئەمڕۆدا بەراوردبکرێت، دەبینین کە هەموویان یەك ئاراستەی پێوەرو ڕەوتیان هەبووە کە دەرئەنجامی تێڕوانینی ئەوانە بۆ جیهان و بۆ مرۆڤ. بۆ نمونە یۆنانییەکان وەك ئێرانییەکان بیریان نەکردۆتەوە، تێڕوانینیان بۆ مرۆڤ یا بۆ مەسەلەی گەردوون لە بنچینەوە بەشێوەیەکی گشتی تێڕوانینێکی تر بووە. بە هەمان شێوەش لەرۆمای کۆندا.

بەڵام پیشەسازی لەڕاستیدا گوتەزایەکی تاڕادەیەك نوێیە کە بۆ مرۆڤایەتی هاتۆتەئارا. بێگومان پێویستە پیشەسازی لەهونەر جیابکەینەوە. واتا ئەو چالاکییەی کە یۆنانییەکان لەڕێگەی ئەمەوە پێناسی ئەویان دەکرد. لەگەڵ ئەمەشدا ئەوەی کە ئەمڕۆ ئێمە بەو پیشەسازییە دەڵێین لەڕاستیدا یەکێکە لە تەوەرە کلیلیەکانی کۆمەڵگای مۆدێرن. بەوهۆیەوەیە کە دەرئەنجامی تێڕوانینێکی کلتوریی تایبەت و جیاوازە سەبارەت بە جیهان.

*** جیاوازی هونەر و پیشەسازی چییە؟**

– هونەر لەڕاستیدا ڕێبازێکە بۆ دروستکردنی شتێك یاخود دۆزینەوەی. بەڵام لە پیشەسازیدا تێڕوانینێکی نوێ بۆ جیهانیش، خۆی ئیزافەی ئەم کۆمەڵەیە دەکات.

هەربۆیەشە کە من دەڵێم لەنێوان پیشەسازی مۆدێرن و پرۆژەی مۆدێرنێتەدا بەشێوەیەکی گشتی پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ هەیە، واتا ئەم دووانە ناکرێ لێك جیابکرێنەوە. بەپێی ئەم پێناسە، دەکرێ بڵێین پیشەسازی، تێروانینێکی نوێیە بۆ جیهان و پەیدابوونی ڕێبازێکی ژیانی نوێیە لە جیهاندا کە خۆی دەرئەنجامی پرۆژەیەکی مۆدێرنە. هونەر هەمیشە لەهەموو سەردەمەکاندا هەبووە، وەلێ پیشەسازی لەتەك تەکنەلۆژیاو زانستدا بووە. لە جیهانی کۆندا لە کۆمەڵگا سوننەتیەکاندا بەمشێوەیە نەبووە، لەڕاستیدا شتێکمان بەناوی تەکنەلۆژیای مۆدێرنەوە نەبوو، تاوەکو پیشەسازییەکەشمان وابەستەی بێت. تۆ ئەمڕۆ ناتوانیت مەسەلەی پیشەسازی یاخود کۆمەڵگای پیشەسازی بخەیتەڕوو بەبێ ئامادەگی تەکنەلۆژیا. مەسەلەی تەکنەلۆژیا بەهەمانشێوەی کە (هایدگەر)ی فەیلەسوفی مۆدێرنیش دەربارەی دواوە، تەنها یەك ڕێباز نییە بەڵکو دیدێکە. جۆرە شێوەیەکی تێڕوانینە بۆ جیهان. کاتێك کە فەیلەسوفێکی وەك (دیکارت) دەڵێت: مرۆڤ پێویستە خاوەن و سەروەری سروشت بێت، ناکرێ بگەینە ئەو ئەنجامەی کە پیشەسازیی

مۆدێرن لەسەر ئەوەیە کە پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ سروشتدا بگۆڕێت.

لەکاتێکدا کە لەسەردەمی کۆندا هونەر بە ناچارییەوە مەبەستی لە گۆڕینی پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ سروشتدا نەبوو. هونەر لەڕاستیدا درێژەپێدەری ئەم پەیوەندیە بووە. پیشەسازی مۆدێرن بەشێوەیەکی گشتی پەیوەندی مرۆڤی لەگەڵ سروشتدا گۆڕیوە و من پێموانییە کارەساتە ژینگەییەکانی سەدەی بیستەم و بیست و یەکەم دەرئەنجامی ئەم گۆڕانی پەیوەندییەی نێوان مرۆڤە لەگەڵ سروشتدا.

*** مۆدێرنێتە لەم دیدەوە چ ڕەوتێکی لەئێراندا تەی کردووە؟**

– لەڕاستیدا پرۆژەی مۆدێرنێتە دوو خەسڵەتی گرنگی هەیە کە نزیکەی دوای ڕێنسانس تا ئەمڕۆ لە ڕۆژئاوادا ئامادەگی هەبووەو هەیە.

لەم دوو خەسڵەتە یەکێکیان عەقڵە کە ئامرازێکە خۆی بەرهەمی گەشەی زانست و تەکنەلۆژیا و پیشەسازییە لە جیهانی مۆدێرندا و دەرئەنجامەکەشی بۆتە مایەی دەرکەوتنی کۆمەڵگا پیشەسازی و پۆست پیشەسازییەکان. خەسڵەتێکی تریش هزر یاخود عەقڵی ڕەخنەییە کە تۆ لە بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی و سیاسیو فکریدا دەیبینی. ڕووداوێك کە بەتایبەتی لە سەدەی بیستەمدا لەڕێگەی ڕووبەڕووبوونەوەی وەك ئێران لەگەڵ خۆرئاوادا رووی دا ئەوەبوو کە کۆمەڵگاکانی نمونەی کۆمەڵگای ئێمە زیاتر بەرەو عەقڵئامێری ڕۆیشتن تا عەقڵی ڕەخنەیی، واتا ئەو شتگەلانەی کە لە ڕۆژئاوا وەریان گرت و وەك مۆدە و ڕەنگە بەبێ هیچ ناسینێك لە کۆمەڵگادا بەکاریان هێنا، زیاتر ڕەهەندە تەکنەلۆژیەکەی واتا عەقڵئامێری بوو کە لەتەك ئەودا، هزر و فکر لەمەڕ ئەو عەقڵئامێریە چالاك نەبوون. واتا ئێمە بەرهەمە پیشەسازییەکان یاخود ووردتر بڵێین بەرهەمە تەکنەلۆژییەکان و هاوردە تەکنەلۆژییەکانمان هەبوو بەڵام ئەو مەعریفەیەی لەسەر تەکنەلۆژیایە لە ئێمەدا بێدار نەبۆوە. بەم پێیە لە کۆمەڵگاکانی نمونەی کۆمەڵگای ئێمەدا بۆشاییەك لەنێوان عەقڵئامێری و عەقڵی ڕەخنەییدا دەرکەوتووە. بۆ نمونە، ئەمڕۆ ئۆتۆمبێلێکی زۆر لە ئێراندا بەرهەم دەهێنرێت، بەڵام ئەوەی کە بۆ نمونە (*DVD*) یاخود ڤیدیۆ یا هەرشتێکی تر چۆن بەکاردەهێنرێت و چ مانایەکی کلتوری لەژیانی ڕۆژانەی خۆیدا پێبدەین، دەردەستمان نەکردووە. ئەمە خۆی کارەساتە. دروست وەك دەربەندێکە کە ئێمە پیایدا تێنەپەڕیوین.

لەڕاستیدا مەسەلەی پیشەسازی مۆدێرنمان بۆخۆمان خستۆتەڕوو بەبێ ئەوەی کە مەسەلەی مەعریفە لەسەر پیشەسازی مۆدێرن بۆخۆمان بخەینەڕوو. ئەگەر بمانەوێت لەڕستەیەکدا بڵێین: ئەوەی پێی دەوترێت ڕۆشنگەری، لەڕاستیدا هەمان باسی مەعریفەناسیی نێوان خەسڵەتی ئامرازی و خەسڵەتی ئابوریی پیشەسازییە. لێرەدایە کە ڕۆڵی مرۆڤ وەك بکەرێکی هۆشیار یاخود هۆشمەند لەژیان و کاردا ڕۆشن دەبێتەوە.

*** دەتوانیت دەربارەی ئەو فاکتەرانەی ئەم بۆشاییەی دروست کردووە ڕوونکردنەوەی زیاتر بدەیت؟**

– دەکرێ ئاماژە بۆ سێ جۆر فاکتەری سیاسی، کۆمەڵایەتی و کلتوری بکرێت. بەهەڵە بەکارهێنانی پیشەسازی و تەکنەلۆژیا، بەبێ مەعریفە و پرۆژەی ڕۆشنگەری بۆتە مایەی

دەرکەوتنی کارەساتی تەکنەلۆژی بۆ ئێمە. بنۆڕە بە لەناوبردنی جەنگەڵەکان، ئەوانەی درەختەکان دەبڕنەوە بەبوونی مەعریفە لەسەر دەرئەنجامەکانی لە بیست ساڵی داهاتوودا و یاخود بڵاوبوونەوەی شارنشینی بەبێ پرۆژەی مەدەنیەتی شاریی (وەك ترافیك)، لە بەرامبەردا ئێمەش لەبری ئەوەی دووری نێوان عەقڵئامێری و ڕەخنەیی کەم بکەینەوە، ئەم دوورییەمان زیاترکردووە. مەسەلەی بنچینەیش ئەمەیە کە لەڕێگەی ئاوێتەبوونی ئابوریی بازاڕ لەگەڵ تەکنەلۆژیای مۆدێرن، جۆرە ڕەوتێکی بەکاربەری بێ وێنەمان لەتەواوی ئامڕازە پیشەسازییەکانماندا کۆکردۆتەوە.

ئەمڕۆ خەڵکی ئێمە تەواوی ئامرازە مۆدێرنەکانی پیشەسازی بەکاردەهێنن، بەبێ ئەوەی بزانن چەمکی پیشەسازی واتای چییە؟ من لەو باوەڕەدام پیشەسازی چەمکێکی کلتورییە تۆ ناتوانیت لەمەڕ پیشەسازی وەك چەمکێکی جیا لە تەواوی ئەو ڕەوتانە بدوێیت کە نەوەیەك بۆ نەوەیەکی تر دەیگوازێتەوە، پاشان باسی بنچینەییو گرنگ رۆشنکردنەوەی پەیوەندی ئێمەیە لەگەڵ پیشەسازی و گەشەی ئابوری. لەگەڵ کلتوریشدا لەڕێگەی فێرکردنەوە پەیوەندی بەرقەرار دەکەین.

دەکرێ بڵێین کە پیشەسازی خۆی پرۆژەیەکی کلتورییە.

گەشەی ئابوری بەبێ گەشەی کلتوریی بەدینایەت. ئەگەر بتەوێت گەشەی ئابوری بەدیبهێنیت، پێویستە سەرەتا تاکەکەس لەپرۆژەی رۆشنگەریدا لەدایك ببێت کە لەڕاستیدا بەوتەی (کانت) لە دۆخی بچوکی خۆی بێتەدەرەوەو ببێتە تاکێکی بەرپرسیار. من زۆر جەخت لەسەر (بەرپرسیاربوون) دەکەمەوە، هەمیشە لە نوسینەکانمدا ئاماژەم بۆکردووە. پیشەسازی و تەکنەلۆژیای مۆدێرن جۆرە بەرپرسیارییەتییەکی مۆدێرن دروست دەکات و پرەنسیپەکەشی بوونی بەرپرسیارییەتییەکی مۆدێرنە. کۆمەڵگاکانی نمونەی ئێران، پیشەسازی و تەکنەلۆژیای مۆدێرنیان بەبێ بەرپرسیارێتی مۆدێرن و بەبێ شێوازی ژیانی مۆدێرن وەدەستهێناوە. پێویستە کاتێك شێوە ژیانێکی بەکاربەرت هەیە" تێڕوانینی مۆدێرنیشت هەبێت. خەڵکت هەیە کە مارسیدسی بەنزین دەکڕێت و سواری دەبێت، بەڵام بیروباوەڕەکەی سوننەتیە. بەهەر شێوەیەکیش بێت، کاریگەرییەکەی ئەوەندە زیادە ناکرێ لەبەرچاوی نەگریت. بۆنمونە هەمان مەسەلەی ژینگە خۆی بەرپرسیارییەتییەکی گەورەیە. ئێمە وێڕای ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ چەمکی پیشەسازیی مۆدێرن مەسەلەی تێکشکان دەبێ بخەینەڕوو. ئەوەی کە ژینگە چەند شکێنەر دەبێت؟ ئەوەی کە مرۆڤ دەچێتە بەرامبەر پیشەسازیی مۆدێرن تاچەند بشکێت؟ ئەوانە هەموو بەرپرسیارێتی نوێ دەهێننەدی. لەڕاستیدا چۆن پێویستە سروشت لەبەرامبەر ئەو زیانانەی کە ڕەنگە لە پیشەسازی و تەکنەلۆژیای مۆدێرنەوە پێیبگات" بپارێزێت؟ و ئەوەش کە چلۆن دەبێ مرۆڤەکان ئامادەبکەیت تا هۆشیارانە پیشەسازی و تەکنەلۆژیا بەکاربهێنن نەك بەشێوەیەی کۆیلایەتی و بەکاربەری. ئەم خاڵە ناکرێ لەبەرچاو نەگیردرێت.

سەرەڕای ئەمە، سوننەتییەکان لەگەڵ هونەری تایبەتی خۆیاندا دەگونجێن. ئەو هونەرەی کە ئیتر بوونی نییەو تەکنەلۆژیای مۆدێرن بۆتە ئەلتەرناتیڤی. تەنانەت هەمان ئەو هونەرەش نەبۆتە

مۆدێرن. ئەمەش بەو مانایەیە کە کارایی ئەوان لەدەست دەرچووە. لەسەر ئەم بنەمایە تۆ لەبەرامبەر هیولایەکی نوێدایت چونکە مەعریفەت لەسەر ئەم هیولایە نییە، ئەم هیولایە تەنها وێرانکاری دەکات.

*** بابەتێکی تر کە لەبەرامبەر ئێمەدایە، جیهانگیرییە. بەڕای تۆ کاریگەری جیهانگیری لە پەیوەندی لەگەڵ کلتورو پیشەسازیدا چۆن دەکرێ شیکار بکرێت؟**

– بەتێڕوانینی من ئەمڕۆ جیهانگیری کارێکی زەروورییە. وەلێ چلۆن پێویستە بەجیهانی ببێت؟ بەتێڕوانینی من جیهانگیری بەبێ بەجیهانیبوون بەدینایەت. واتا ئەوەی کە تۆ ناتوانیت هزری پەراوێزکەوتووت هەبێت و بتەوێت لە جیهانی ئەمڕۆدا فاکتەرێکی گرنگ و کاریگەر دانەر بیت. ئەو ڕووداوانەی کە لە ئێران ڕوویان داوە ئەمەیە کە ئێمە فکری جیهانیمان نیە، وەلێ دەمانەوێت بەجیهانی ببین. لەسەر ئەم بنەمایە ئێمە لە گەشەی جیهانی ئەمڕۆدا تەنها ڕۆڵێکی (*Passire*)مان هەیە. ڕۆڵێکی کارتێکراومان هەیە. ناکرێ ڕۆڵێکی کارامان هەبێت، بەتایبەتی لە بواری ئابوریدا چونکە مەعریفەی ئابوری و پیشەسازی و تەکنەلۆژی مۆدێرن لە وڵاتی ئێمەدا بوونی نییە، ئێمە لەڕاستیدا نێرەرین.

*** فاکتەری ئەم کارتێکراوییە لەچیدایە؟**

– گرنگترین فاکتەری ئەمەیە کە لەماوەی (150)ساڵی ڕابردوودا کە ئێمە لەگەڵ ڕۆژئاوادا ڕووبەڕووبووینەوەو زیاتر لە ڕێگەی دەستەبژێر (نوخبە)، ڕووناکبیران و سیاسەتمەدارانەوە نۆڕیومانەتە خۆرئاوا. لە کۆمەڵگایەکی وەك ئێراندا مەسەلەی مۆدێرنێتە زیاتر لە ڕێگەی مۆدەوە هاتۆتەئارا تا لەڕێگەی مەعریفەی مۆدێرنەوە. واتا لەبری ئەوەی مەسەلەی پرۆژەی ڕۆشنگەری بهێنرێتە ئارا و یاخود چۆن دەتوانین لە دۆخی بچوکییەتی بچینەدەرەوە و مەعریفەمان لەسەر ژیانی مۆدێرن دەستەبەر بکەین؟ بەدوای مۆدەدا گەڕاوین. لەڕاستیدا ئێمە هەمیشە بەدوای مۆدەدا گەڕاوین و مۆدەش بەکاربەریی دەهێنێتە ئارا. بۆ نمونە دەڵێیت من پێویستە بەوشێوەیە بەرگ بپۆشم، سواری فلان ئۆتۆمبێل ببم. من ئەمەم دەوێت و ئەوەم دەوێت. وەلێ دەزانێت چی دەوێت؟ بۆچی دەبێ بەو شێوەیە بێت، ئەوەش کە مرۆڤ دەبێ مۆدێرن بێت، ئەمە مەسەلەیەکە.

بۆئەوەش کە ئێمە دەمانەوێت لە جیهانی مۆدێرندا بژین، وەلێ مۆدێرنبوونی ئێمە خۆی پێویستە فکرێکی مۆدێرنیشمان هەبێت. تۆ ناتوانیت بڵێیت من دەمەوێ مۆدێرن بم وەلێ بەرۆژ سواری مارسیدسی بەنزین ببیت و شەویش فاڵی (حافز) بگریتەوەو لەفاڵی (حافز)دا بەدوای تەواوی چارەنووسی ژیانتاندا بگەڕێیت.

ئەم دوو لایەنە هزرو ڕووی جۆراوجۆرە بۆ ژیان کە دەبێتە مایەی ئەوەی لەگەڵ یەکتردا بخوێندرێتەوە. من ناڵێم نابێت مەعنەوییەت لە کۆمەڵگادا هەبێت، من دەڵێم کە لەو کۆمەڵگایەدا هەموو شتێ دەبێ بچێتە جێگای خۆی و دیاربێت کە ئێمە وەك مرۆڤە مۆدێرنەکان ئەو پەیوەندیە چییە کە بە تێڕوانینی مۆدێرنمان بۆ تەکنەلۆژیا و پیشەسازی دەیهێننە دی، ئێمە ئەگەر بڕیار بێت بە تێڕوانینێکی تەواو سوننەتیانە بنۆڕینە دیاردەیەکی تەواو مۆدێرنانە، ناتوانین لێی تێبگەین. تەنها پەیوەندییەك کە دەمێنێتەوە پەیوەندی ئامرازە. بەتێڕوانینی من ئەمەش پەیوەندییەکی نیگەتیڤە. ئێمە پێویستە ئەم

پەیوەندییە نیگەتیڤە بۆ پەیوەندییەکی پۆزەتیڤ بگۆڕین. بێگومان لە تێڕوانینی زۆرێك لە فەیلەسوفان و بیرمەندانی مۆدێرن، پەیوەندی لەگەڵ تەکنەلۆژیادا بەشێوەیەکی گشتی پەیوەندییەکی سروشتی نییەو دەستکردەو مرۆڤ دەبێتە جۆرە کۆیلەیەکی تەکنەلۆژی، وەلێ مرۆڤ دەتوانێت لە کۆیلەیەتییەکەی کەم بکاتەوە.

پێویستە چۆن ئەم کارە بکەین، بەهەمان ئەو مەعریفەو زانستەی کە لەمەڕ تەکنەلۆژیا پەیدا دەکرێت. ئەم مەعریفەیە بۆ تەکنەلۆژیا پێویستە لەسەر ئاستی کۆمەڵدا هەبێت. لە پیشەسازی و تەکنەلۆژیادا ناکرێ تەنها لە زانکۆی سەنعەتی شەریفدا هەبێت. ئەمڕۆ لە کۆمەڵگای ئێراندا تەنها لە ناوەندێکی فیزیکی تیۆریی زانکۆی سەنعەتی ئەسفەهان و سەنعەتی شەریفدا هەیەو خەڵکە حەفتامیلیۆنی یا شەست وحەوت میلیۆنییەکەی ئێران کە لەگەڵ بەرهەمە تەکنەلۆژیە خۆرئاوایی و مۆدێرنەکاندا مامەڵە دەکەن، پەیوەندییەکەیان پەیوەندییەکی تەواو بێئاگایانە و نیگەتیڤانەیە کارەساتەکەش لەوەدایە.

بەهۆی ئەوەی کە هەر لە بنەڕەتەوە نازانن ئەم ئامرازانەی لەبەردەستیاندایە، هەندێ ئامرازییان مەرگهێنەرن. تەنها هەڵەیەك بەسە کە ببێتە مایەی مەرگ. پێویستە یاسایەکی تایبەتیان بۆ دابندرێت. دەبێ سەبارەت بەئەوە، بەرپرسیاریەتییەکی کۆمەڵایەتی بێتەئارا. پێویستە تەواوی سنورەکانی دەستنیشان بکرێت.

بەتێڕوانینی من فەزای پیشەسازی و تەکنەلۆژی فەزایەکە یاساو بەرپرسیارێتی تایبەتی خۆی هەیە. تۆ ڕێگەت پێنەدراوە سواری پژۆی (206)بیت و بەخێرایی (160کم) بەشەقامەکانی تاراندا بسوڕێیتەوە، ئەمە کارەسات دروست دەکات. بەم پێیەش بەرپرسیارێتی خۆتت هەیەو هەم پێویستە یاسایەك هەبێت کە دەستنیشانی ئەوەبکات کە پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ پیشەسازی و دەزگای تەکنەلۆژیدا چییە؟.

***ئایا خوێندنگەیەك لەجۆری ئێرانی مانای هەیە؟**

–بەتێڕوانینی من مۆدێرنێتە لە جۆری ئێرانی هەر لە بنەڕەتەوە مانای نییە. لەبەرئەوەی مۆدێرنیزم شێوە تێڕوانینێکە بۆ جیهان و لەڕاستیدا پرۆژەیەکە کە ئەمڕۆ بۆتە جیهانی.

***ئایا دەکرێ تایبەتمەندییەکانی کلتوری میللەتە جۆراوجۆرەکان لەم پرۆژەیەدا بمێنێتەوەو لەناونەچن؟**

–بەڵێ، دەتوانن لەناونەچن و ئەو دەستورانەی کە میللەتە جۆراوجۆرەکان هەیانە، وادابنێ کە ئەو دەستورانەی بودایی یاخود کۆنفۆشیوس کە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هەن، مەگەر بوونەتە لەمپەر لەبەردەم کلتوری مۆدێرندا؟ بێگومان لەوێدا بەشێوەیەکی گشتی پراگماتیزین.

وەلێ بۆ نمونە کۆنفۆشیوس ڕەوتێکی پراگماتیزمییە. بەئاسانتر دەتوانرێ لەگەڵ ئەودا بەرەو دیموکراسیو پیشەسازی یاخود تەکنەلۆژیای مۆدێرن بڕۆین. وەلێ بەهەرحاڵ من پێموایە نەتەوە جۆراوجۆرەکان دەتوانن تائەندازەیەکی زۆر دەستورەکانی خۆیان بپارێزن و شێوازی تێڕوانینیان لە ڕەهەندە تایبەتییەکانی ژیانیاندا بپارێزن، بەڵام لەناو ئەوەشدا ژیانە گشتییەکەیان بکەن بە ژیانێکی مۆدێرن. لەسەرئەوەی کە هەیانە، ببنە مۆدێرن و بەرپرسیارێتییەکان و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکەیان لەسەر بنەمای پرۆژەی مۆدێرن

دابنێن. لەگەڵ تەواوی ئەو کێشانەی کە لە مۆدێرنێتەدا هەن و لەگەڵ ئەو ڕاستکردنەوانەی کە پێویستە لە مۆدێرنێتەدا هەیان بێ پێویستە خۆشیان ڕاست بکەنەوە.

*** ئایا ئەم ڕەوەندە پێویستی بە عەلمانییەت هەیە؟**

– عەلمانییەت یەکێك لە ڕەهەندەکانی ئەم پرۆژەیەی مۆدێرنێتە بوو کە دوو ڕووخسارە گرنگەکەی واتا عەقڵئامێری و ڕەخنەیی کە عەلمانییەت دەچێتە لێکۆڵینەوەی عەقڵی ڕەخنەییەوە، بەڵام ئێمە هەروەك چۆن دەمانەوێت دەربارەی پیشەسازی و کلتوریی بدوێین ئەو بەشە ئامرازییەی کە زۆر گرنگ بووە کە لەودا تەکنەلۆژیای مۆدێرن هاتۆتەکایەوە و تێڕوانینی ئامێرییانە و تێڕوانینی مۆدێرنانە بۆ جیهان کە ئێمە ئەمڕۆ بۆئەوەی بگەینە پیشەسازییەکان و پێشکەوتنە تەکنەلۆژییەکان، پێویستمان بەوەیە کە زنجیرە تێڕوانینێکی سوننەتیانە کە لەوانەیە ڕێگە لە گەشەی ئەم پیشەسازی و تەکنەلۆژیانە بگرێت، لە ڕەهەندەکان و فەزای تایبەتی ژیانتاندا هەتان بێت. ئەمە هەڵبژاردنە. یاخود میللەتێك کە دەیەوێت گەشەی ئابوری و سیاسی بکات، دەیەوێت لە ڕەهەندە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانیشی بخاتە هەمان فەزا سوننەتییەکانییەوە و دەسەڵاتی ئەوەشی نییە کە ئەم ستاندارد و پێوەرانە بخاتە ژیانی تایبەتییەوەو لەڕاستیدا ژیانە کۆمەڵایەتییەکەشی بەجیهانیتر بکات و بەپێی پێوەرەکانی ئەمڕۆی جیهان پراکتیزەی بکات.

***ئەم هەڵبژاردنە ئەنجام دراوە؟**

–کۆمەڵگای ئێمە لەئاستی جیاوازدایە، من پێموایە ڕەنگە دەستەبژێرەکانی ئێمە ئەم هەڵبژاردنەیان کردبێت. بەڵام بەپێی پێویست بۆ نمونە سیاسەتمەدارانی ئێمە ئەم هەڵبژاردنەیان نەکردووە. یاخود ئەوەی کە لەوانەیە ئەم هەڵبژاردنە زیاتر لەسەرئاستی خوێندن تەواوکردووەکانی ئێمەدا کراوە، وەلێ لە سەرجەم ئاستەکانی کۆمەڵگادا بەرفرەنەبووە. ئەمەش بە هەمان شێوەی کە وتم پرۆژەیەکی کۆمەڵایەتییە کە تۆ دەبێت لەسەر ئاستەکانی کۆمەڵدا فێریان بکەیت. وەك بە هەمان شێوەی کە پێویستە مەسەلەی پیشەسازی و تەکنەلۆژیایان فێربکەیت. بەهەمان شێوەش کە لەڕابردوودا هونەریان فێردەکردن، هەموو کەسێك پیشەیەکی هەیەو بەهەرحاڵ دارتاشی یاخود هەر هونەرێکی تر کە دەیەویست قوچەکێکی گرنگتر دروست بکات، پێویستە بیهێنێتەوە یاد کە چۆن دەبێ ئەم کارە بکات. لایەنی کەم ئەندازیار پێویستە فێرببێت، بەڵێ زۆر مۆدێرن بووە، لە سەردەمی خۆیدا نوێ بووە. بەڵام نابێ وشەی مۆدێرن بەکاربهێنین. ئێمە مەسەلەکەمان ئەمڕۆ تەنها نوێگەرایی نییە، مەسەلەکەمان ئەوەیە کە لەبەرامبەر پرۆژەیەکی کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئابوریداین. پرۆژەیەك کە بەجیهانی بووە، مەسەلەی مۆدێرنێتە لێرەدایە. هیچ شتێك وەك نوێبوون نییە کە تۆ بڵێیت من وێڵی دوای مۆدم و تەنها دەمەوێت خۆم لەنوێوە پۆشتە بکەمەوە، ئۆتۆمبێلەکەم نوێ بکەمەوەو.. بکرم و ئەمە بەس نییە.

***ئایا مۆدێرنیزمی ئەمڕۆ پەیوەندی لەگەڵ شارستانێتیە مەزنەکانی دنیادا هەیە؟**

– هەر لە بنەڕەتەوە سستییەکی تەواو هاتۆتە ئارا، من ناڵێم کە لەو سەردەمەدا بیرکردنەوە نەبووە. یەکەم تۆ ڕێبازێکی ژیانی دابونەریتیت

هەیە کە لە کۆمەڵگا سوننەتییەکاندا زۆر گرنگ بووە. پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ گەردووندا بووەو تێڕوانینی گەردوونی کە لەگەڵ جیهاندا بووە بۆتە مایەی ئەوەی کە شتێك وەك هەرەمێکی سێ گۆشەیی دروست ببێت یاخود پەرستگا دێرینەکان و ئەو پەیوەندیانەی کە لەکۆمەڵگاکان لەنێوان خۆیاندا هەیانبووە، مۆدێرنێتە تەواوی ئەوانەی گۆڕیوە. بۆنمونە یەکێك لە گرنگترین ئەو شتانەی کە لەگەڵ خۆیدا لەتەك عەقڵئامێری و مەسەلەی تەکنەلۆژیو پیشەسازیدا هێناویەتی، مەسەلەی تاك و تاکگەراییە. کۆمەڵگا مۆدێرنەکان کۆمەڵگای تاکگەران، کۆمەڵگایەکن کە تیایدا کەسەکان بەدوای هیوای خودی خۆیاندان و فەزا تایبەتییەکەشیان لە فەزا گشتییەکەیان گرنگترە. بەمپێیە بەو هۆیەوەیە کە دەبنە بەکاربەر. لە کۆمەڵگا سوننەتییەکانی وەکو رۆما، یۆنان یاخود ئێرانی کۆندا کەسانی بەکاربەر نەبوون، کەسانێك بوون کە هەنوکە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ سروشتدا زۆر نزیکە. ئێمە لەسروشتەوەمان وەرگرتووە، بووینەتە کۆمەڵگایەکی بەکاربەرو بەمشێوەیە مەسەلەی پیشەسازیو تەکنەلۆژیا بەسروشتی بەلای ئێمەوە زۆر گرنگتربووە. پەیوەندی لەگەڵ سروشتدا لەڕاستیدا پەیوەندییەکی زۆر دوورە و ئێمە لەگەڵ سروشتەکەی تردا بەشێوەی ڕۆژانە ناژین، بەڵکو بەڕێککەوت لەگەڵ تەکنەلۆژیاو پیشەسازیو شتە دەستکردەکانی تر کە بەشێوەی ڕۆژانەیی هەمانە، دەژین. کاتێك دەمانەوێت لێیان ڕابکەین، لەوانەیە بەرەو سروشت بڕۆین. بۆ نمونە لە ئێران هەینییەکان هەڵدەستین بڕۆین بۆ شاخ‌وداخ، چونکە پێویستمان بەسروشت هەیە، پێویستیشە سروشت ببینین. وەلێ سروشت ڕۆیشتووەو پەنای بۆ گۆشەیەك بردووە و ئەمە ئێمە وەك فەزایەکی بچوك پاراستومانەو کاتێك دەمانەوێت لە پیشەسازی ڕابکەین، بەرەو ئەو دەڕۆین. واتا تۆ دەبینیت بەشێوەیەکی گشتی تێڕوانینێکی تر بۆ جیهان هەیە کە نابێ ئەم تێڕوانینە بەکەم دابنرێت. ئەم تێڕوانینە لەگەڵ خودی دابێکی گرنگی سەدەی بیستەمدا هاتووە، لەگەڵ خودی سیاسەتگوزارییە نێودەوڵەتییەکاندا هاتووە، لەگەڵ خودی ئابوریی بازاڕدایەو من پێموایە لەگەڵ خودی یاسادانانیشدایە. من کاتێك بەتۆ دەڵێم مەسەلەی بەرپرسیارێتییەکان و مەسەلەی ئەوەی کە تۆ سنورەکان چۆن دەستنیشان دەکەیت، یەکێك لە کارەکانی کلتور بۆ تەکنەلۆژیا ئەوەیە کە سنورەکان و بەرپرسیارێتییەکان بۆ پیشەسازی دەستنیشان دەکات.

### سەرچاوە

سایتی جەهانبەگلو

# نمونەی شیعری بیانی

لە ئەڵمانییەوە: سیروان رەحیم

## بۆ سەردارێك لە زێڕ

ئێلزە لاسکەر - شویلەر

## *An den Ritter aus Gold*

*Du Bist alles was aus Gold ist*
*In der Grosse Welt.*

*Ich suche deine Sterne*
*Und will nicht schlafen.*

*Wir Wollen uns hinter Hecken legen,*
*Und niemehr aufrichten.*

*Aus unseren Handen*
*SuBe Traumerei Kussen.*

*Mein Herz Holt Sich*
*Von deinem Munde Rosen.*

*Meine Augen lieben dich an,*
*Du haschst nach ihren Falten.*

*Was sol lich tun,*
*Wenn du nicht da bist.*

*Von meinen Lidern*
*Tropft schwarzer Schnee;*

*Wenn ich tot bin,*
*Spieled u mit meiner Seele.*

**تۆ هەموو ئەو شتانەی کە لە زێڕن، لە جیهانێکی گەورەدا**
**بە دوای ئەستێرەکانتدا وێڵم، و ناخوازم بخەوم**
**ئێمە دەمانەوێ خۆمان لە پەنای پەرژینەکاندا پاڵبخەین، و هەرگیز ڕاستنەبینەوە**
**لەناو دەستەکانماندا، خەونە شیرینەکان یەکتر ماچ دەکەن**
**لەناو دەمی تۆوە، دڵم گوڵ بە کێش دەکات.**
**چاوەکانم خۆشەویستیت ئاراستە دەکەن، و تۆیش سەرمەستی لۆچەکانی**
**بەرچاوانمی**
**من دەشێ چ بکەم، ئەگەر تۆ لێرە نەبیت**

له برۆكانم، بەفری ڕەش دەچۆڕێن
ئەگەر من مردم، تۆ یاری لەگەڵ ڕۆحم بكە..

★ ★ ★

## من ناتوانم جیهان بخەمە بەرپێت

هاینەر مویلەر

## *Ich Kann dir die Welt Nicht zu FuBe legen*

*Ich Kann dir die Welt nicht zu FuBe legen*
*Sie gehort mir nicht. Ich werde dir keinen Stern Pflucken:*
*Ich habe kein Geld fur Blumen und keine Zeit*
*Verse zu machen nur fur dich: mein Leben*
*Wird so und so zu knapp sein fur ein ganzes.*
*Wenn ich dir sage: fur dich werd ich alles tun*
*Werde ich dir eine Luge sagen. (Du weiBt es)*
*Ich liebe dich mit meiner ganzen Liebe.*

من ناتوانم جیهان بخەمە بەرپێت
جیهان موڵكی من نییە.
من دێ* ئەستێرەت بۆ لێنەكەمەوە:
من پارەم نییە بۆ گوڵ و كاتیشم نییە
كۆپلە شیعر بە تەنها بۆ تۆ بنوسم
دێ ژیانم ئاوەها و ئاوەهایش تەنگ بێت بۆ بەركۆیەك.
ئەگەر پێت بڵێم: بۆ تۆ هەموو شت دەكەم
دەبێ من درۆت لەگەڵ بكەم.
تۆ ئەمە دەزانی
من تۆم خۆشدەوێ بە هەموو خۆشەویستی خۆمەوە.

### پەراوێز

*دێ: بە دڵنیایی، واتا بەڵێندان بۆ بەجێهێنانی شتێك لە داهاتوو. بۆ نمونە دێ بكەم (بە واتای بە دڵنیایی دەیكەم، دێ بێم: بە واتای بە دڵنیایی دێم و هەروەها) ئەم پێشگری (دێ)یە لە زاراوەی كرمانجی ناوەڕاست (سۆرانی)دا نییە، بەڵام ئێمە ئەگەر سودی لێوەربگرین و بەكاری بهێنین باش دەبێ. وا لێرەدا بەكاری دەهێنین هەر كەسێك باری سەرنجی هەبێت و بینوسێت خۆشحاڵمان دەكات.

### سەرچاوە

www.eurokurd.com

# پیاسەیەکی دوور و درێژ بۆ هەتا هەتا

**کورت ڤۆنێگات ( *Kurt Vonnegut* )**

**لە فارسییەوە: عەبدولخالق یەعقووبی**

پێکەوە دراوسێ بوون و پێکەوەش گەورە ببوون، لە سووچێکی شارەکەیان، نیزیك کێڵگە و دارستان و باخەکانی میوە، نیزیك دیمەنی بورجی کەڵەزەنگێکی جوان کە ئی قوتابخانەی مناڵە کوێرەکان بوو.

ئێستا ئەوان بوونەتە بیست ساڵ و ئەوە بۆ ساڵەوەختێك دەچێت چاویان بە یەکدی نەکەوتووە. هەمیشە لەگەڵ یەك تەباو رەبا بوون و بە گاڵتە و پێکەنین رایاندەبوارد، بەڵام هیچ کات باسی عیشق و ئەڤین لە نێوانیاندا نەهاتبووە گۆڕێ.

ناوی کوڕەکە نوت (*Newt*) و ناوی کچەکە کاترین (*cathrine*) بوو. ڕۆژێك دوا نیوەڕۆ نوت لە زەنگی ماڵی کاترینی دا.

کاترین دەرگای کردەوە. بە تەماشای گۆڤارێکی مۆدەوە سەرقاڵ بوو. گۆڤارێکی تایبەت بە تازە بووکەکان. کاترین گوتی: "نوت!" لەوەی چاوی بە نوت دەکەوێ واقی وڕمابوو.

نوت گوتی: " دێی پیاسەیەك بکەین؟" نوت کوڕێکی شەرمن بوو، تەنانەت لای کاترین و شەرمنییەکەشی لە ژێر پەردەی هەڵیت و پڵیت بێژیدا دەشاردەوە. وەك بڵێی زۆر دوور لەو شتەی کە لە راستیدا کەڵکەڵەی ئەو بوو راوەستابوو. وێدەچوو مەئموورێکی نهێنی کار بوو کە بۆ چەند چرکەیەك لە مەڕ مەئمووریيەتی خۆی بۆ شوێنی جوان و دوور یان ناحەزی دنیا دڕدۆنگ مابێتەوە. بەم شێوە قسەکردنە خووخدەی هەمیشەیی ئەو بوو، تەنانەت لەو کاتانەی کە پێوەندی بە هیوابڕاوی و ناهومێدی ئەوەوە بوو.

کاترین گوتی: "پیاسە بکەین؟"

نوت گوتی: "هەنگاوێك پێشتر لە خەڵکانی تر، لە نێو گەلاَ و بەرگی درەختان، لەسەر پردەکان..."

کاترین گوتی: " پێموانەبوو لە نێو شار بی."

–تازەگەیشتم.

–وا دیارە هێشتاش سەربازییەکەت تەواو نەبووە.

نوت وەڵامی دایەوە: "نیزیکەی حەوت مانگم ماوە." ئەو سەربازی تۆپخانە بوو.

یونیفۆرمەکەی گنجی تێکەوتبوو و پۆتینەکانی تەپ و تۆزیان لەسەر نیشتبوو. ڕیشی پێویست بوو بتاشرێ. دەستی بۆ وەرگرتنی گۆڤارەکە درێژ کرد: "دەکرێ چاوێك لەم گۆڤارە جوانەت بکەم؟"

کاترین گۆڤارەکەی پێدا: "نوت! من بڕیارە شوو بکەم."

—دەزانم . وەرە با بچین پیاسە بکەین.

کاترین گوتی: "نوت من زۆر سەرقاڵم.. زەماوەندەکەم حەوتووەکەی دیکەیە."

نوت گوتی: "ئەگەر بچین پیاسە بکەین، کەیفت ساز دەبێ. پیاسە دەتکاتە بووکێکی نەشمیلانە."

نوت لاپەڕەکانی گۆڤارەکەی هەڵدەداوە: "بووکێکی جوان وەك ئەمە.. وەك ئەمە.. وەك ئەمە." ئەو تازە بووکە جوانەکانی نێو گۆڤارەکەی نیشانی کاترین دا.

کاترین نوقمی نیگاکردن لە تازەبووکەکان بوو و بیری لێدەکردنەوە. نوت گوتی: "ئەمە خەڵاتی منە بۆ هێنری ستوارت چارزێن. تۆ دەبەم بۆ پیاسە کردن و ئینجا بووکێکی کەیف خۆشم خەڵاتی ئەو کردووە."

کاترین پرسی: "تۆ ناوەکەی دەزانی؟"

نوت گوتی: "دایکم نامەی بۆ نووسیم. خەڵکی پیتس بورگە؟"

—ئەرێ، تۆ شێوەی ئەو دەدەی.

—لەوانەیە.

—نوت، پێت دەکرێ، پێت دەکرێ بێی بۆ زەماوەند؟

—پێموا نییە.

—مەرەخەسییەکەت زۆر نییە؟

نوت وەڵامی دایەوە: "مەرەخەسی؟" خەریکبوو پڕوپاگەندەیەکی دوو لاپەڕەیی لە بابەت قاپ و کەوچکێکی زیوین دەخوێندەوە.

—من مەرەخەسیم وەرنەگرتووە.

کاترین گوتی: "شتی چاك بڵێ."

—من کارێکم کردووە کە ئەوان پێی دەڵێن "غەیبەتی بێ ئیجازە"

کاترین گوتی: "شتی چاك بڵێ نوت! تۆ خۆ ئەو کەسە نیت ئەوان باسی دەکەن."

نوت وەڵامی دایەوە: "دڵنیام کە هەر ئەو کەسەم." هەروا بە هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی گۆڤارەکەوە سەرقاڵ بوو.

کاترین گوتی: "بۆچی نوت؟"

"من دەبێ بزانم زیوی دڵخوازی تۆ چییە؟" جۆری زیوەکانی نێو گۆڤارەکەی خوێندەوە: "ئالبێمارل، هیتێر، لیجێند، یان رەمبلێر رۆز؟"

نوت لێی ڕوانی و پێکەنی: "من بە نیازم کەوچکێك بدەم بە تۆ و هاوسەرەکەت."

کاترین گوتی: "نوت.. نوت، راستییەکەیم پێبڵێ."

—پێمخۆشە بچین پیاسە بکەین.

کاترین پەنجەی دەستەکانی خۆی بە دڵتەنگییەکی خوشکانەوە لە نێو یەکدا گوشی: "ئەرێ نوت، دەزانی تۆ سەبارەت بەوەی غەیبەتی بێ ئیجازەت کردووە من بە گەمژە دەزانی."

نوت وەك پاسەوانێکی میهرەبان برۆی هەڵتەکاند.

کاترین گوتی: کوێ، لە کوێوە؟

—قەڵای براگ

—کارۆلینای باکوور؟

نوت گوتی: "ئەرێ، نیزیك فایت ویل، ئەو جێیەی سکارلا ئۆهارا دەچوو بۆ قوتابخانە.

–چۆن گەیشتیتە ئێرە، نوت؟

نوت قامکە کەڵەی هەڵێناو بە نیشانەی ڕاگرتنی تاکسی رایوەشاند:

–دوو ڕۆژ

کاترین گوتی: "دایکیشت پێ دەزانێ؟"

وەڵامی دایەوە: "من نەهاتووم چاوم بە دایکم بکەوێت."

کاترین پرسی:"هاتووی چاوت بەکێ بکەوێ؟"

–تۆ

–بۆچی من؟

"چونکی خۆشم دەوێی. ئێستا دەکرێ بچین پیاسە بکەین؟ هەنگاوێك پێشتر لە خەڵکانی تر، لە نێو گەڵا و بەرگی درەختان، لەسەر پردەکان."

هەنووکە ئەوان پیاسەیان دەکرد، لە دارستانێکی پڕ لە گەڵا و بەرگی قاوەیی.

کاترین رقی هەستا بوو و زۆری لەسەر دەرۆیشت.

کوڵی گریانی هەستابوو. "نوت، ئەم کارە کارێکی تەواو گەمژانەیە."

–چ شتێك گەمژانەیە؟

"بۆچی لە کاتێکی وا تێکەڵ و پێکەڵدا پێمدەڵێی خۆشم دەوێی؟" بۆ ساتێك راوەستا:

تۆ پێشتر لەم بارەیەوە هیچت پێنەگوتبووم.

نوت وەڵامی دایەوە: "باشتر وایە لەسەر پیاسەکردنی خۆمان بەردەوام بین."

–نا! هەر تاکوو ئێرە، زیاتر نا. من هەر نەدەبوو لەگەڵ تۆ هاتبایەم.

–بەڵام ئێستاکە هاتووی.

–هاتم تا بەر درگای ماڵێ بەڕێت بکەم. ئەگەر کەسێك بێرە دابێت و گوێی لێبێت تۆ باسی چی دەکەی، ئەویش حەوتوویەك بەر لە زەماوەند..

نوت گوتی: "ئەوان فیکریان بۆچی دەچێ؟"

–ئەوان پێیان وا دەبێت تۆ شێت بووی.

نوت گوتی: "بۆچی؟"

کاترین هەناسەیەکی قووڵی دا: "با پێت بڵێم من زۆر زۆر، بۆ ئەو گەمژەیێتییەی کردووتە ڕێز دادەنێم. من پێموانییە تۆ بە راستی غەیبەتی بێ ئیجازەت کردووە، هەرچەند لەوانەیە کردبێتت. من ناتوانم باوەڕ بەوە بکەم کە تۆ بەڕاستی منت خۆش دەوێ، گەرچی لەوانەیە منت خۆش بوێ، بەڵام..."

–من خۆشم دەوێی.

"باشە، من زۆر زۆر ڕێزم هەیە بۆت، پێمخۆشە ببمە هەڤاڵت، من زۆرم پێخۆشە.. بەڵام، لە مێژە وەختی بەسەر چووە." کاترین هەنگاوێکی بەرەو لای نوت هەڵێنا: " تۆ هەرگیز تەنانەت ماچت نەکردووم." و هاوسەنگی لەشی بە دەستەکانی پاراست: "هەڵبەت مەبەستم ئەوە نییە ئێستا ئەم کارە بکەی. تەنیا نیازم ئەوەیە بڵێم شتەکان هەموو بۆ من چاوەڕواننەکراو بوون. من هیچ بۆچوونێکم، هەرچەندەش دوورە زەین، سەبارەت بەوەی چۆن جوابت بدەمەوە لە مێشکدا نییە.

نوت گوتی: "هەر تۆزێك پیاسەی زیاتر.. رابواردنێکی خۆش."

دیسان پیاسەیان دەستپێکردەوە.

کاترین گوتی:"چاوەڕێی چیت جوابیدەمەوە؟"

نوت گوتی: "چۆن بزانم چاوەڕێی چیم؟ من پێشتر هیچ کات لە بارودۆخێکی وادا گیرم نەخواردووە.

کاترین گوتی: "باشە تۆ پێتوایە من خۆم دەخەمە ئامێزتەوە؟"

–لەوانەیە

–بۆت بە داخم کە ناهومێدت دەکەم.

نوت گوتی: "من ناهومێد نیم و هەر بیریشی لێناکەمەوە. ئەوەی زۆرم بە دڵە تەنیا پیاسەکردنە.

کاترین دیسان راوەستا: "تۆ دەزانی قەرارە چی ڕوویدا؟"

—نا

—"ئێمە دەست دەدەینەوە و دەبینە هەڤاڵی یەکتر، ئەمە ئەو شتەیە قەرارە روو بدات."

نوت سەری راوەشاند: "وایە، جارجارە وەبیر خۆتم بێنەوە چەندەم خۆش دەویستی."

کاترین بێ ئەوەی بە دەست خۆی بێت دەستی کرد بە گریان. پشتی لە نوت کرد و لە فەزای بەربڵاوی نێو درەختەکانی دارستانی رووانی.

نوت گوتی: "ئەم کارەت مانای چییە؟"

کاترین گوتی: "شێتە!" پەنجەکانی مشت کرد: "تۆ هەقت نییە.."

—من دەبوایە بەم شتەم بزانیبایە.

کاترین گوتی: "ئەگەر من تۆم خۆش ویستبا، تا ئێستا ئیجازەی ئەوەم پێدەدای.

—تۆ ئەو ئیجازەیەت پێدام.

کاترین گوتی: "ئەرێ" رووی لە نوت کردەوە و لێی رووانی. دەموچاوی تەواو سوور ببۆوە: "تۆ دەبوایە ئەمەت بزانیبایە."

—چۆناو چۆن؟

ئەو گوتی: "تۆ دەبوایە بەم بابەتەت بزانیبایە. ژنان لە شاردنەوەیدا هێندە زیرەك نین."

نوت هەنووکە نوقمی چاوبڕین لە سیمای کاترین ببوو. کاترین بە حاڵەتێکی سەرسووڕمانەوە زانی کە ئەو شتەی گوتبووی راستە، ئەوەی کە ژن ناتوانێ عیشقی خۆی بشارێتەوە.

نوت ئێستا لە عیشق دەگەیشت و ئەو کارەی دەیویست بیکات کردی: کاترینی ماچ کرد.

"تۆ ئەوەندە هیچ و پووچی کە بۆم ناکرێ لەگەڵت هەڵبکەم." کاترین ئەمەی ئەو کاتە گوت کە نوت بەریدابوو.

نوت وەڵامی دایەوە: "من هەر ئەوەم کە باسی دەکەی."

—تۆ نەدەبوو ئەم کارە بکەی.

—تۆ ئەم کارەت پێخۆش نەبوو؟

—چاوەڕێی چی؟ شێتانە خۆم بخەمە بەردەستت؟

نوت گوتی: "دیسان با پێتبڵێمەوە، من هەرگیز نازانم قەرارە لە داهاتوودا چی روویدا."

کاترین لە وەڵامدا گوتی: "ئێمە ماڵئاوایی لە یەك دەکەین."

نوت تۆزێك تێکچوو و گوتی: "باشە."

کاترین قسەکەی گۆڕی: "من قەت لەوەی یەکتریمان ماچ کرد ناڕەحەت نیم. ئێمە دەبوایە یەکتریمان ماچ بکردایە. ئێمە زۆر لەیەك نیزیك بووین. من هەمیشە بە یادی تۆم، نوت. خۆشت بێ."

—تۆیش هەروەتر

—سوپاس بۆ تۆ، نوت.

نوت گوتی: "سی ڕۆژ."

—چی؟

—سی ڕۆژ زیندان. ئەمە ئەو شتەیە کە قیمەتی ماچێك دێنێ.

کاترین گوتی: "من.. من پێمناخۆشە. بەڵام خۆ من داوام لە تۆ نەکرد بێ ئیجازە غەیبەت بکەی."

—دەزانم

—تۆ بە راستی شایان هیچ خەڵاتێکی قارەمانی بە خاتری ئەم کارە گەمژانەیەت نیت.

نوت گوتی: "بۆ قارەمانێتی دەشێت باش بیت. ئەرێ هێنری ستوارت چازێن قارەمانێکی باشە؟"

"لەوانەیە، ئەگەر بەختی ئەوەی هەبێت." کاترین لەوەی دیسان پیاسەیان دەسپێکردبۆوە هەستی بە خۆشی نەدەکرد. ماڵئاواییان لەبیرچوو بۆوە.

نوت گوتی: "تۆ بەڕاستی خۆشت دەوێ؟"

ئەو بە تووڕەییەوە وەڵامی دایەوە: "بە دڵنیاییەوە خۆشم دەوێ. ئەگەر خۆشم نەویستبا، نەدەبوومە ژنی."

نوت پرسی: "چاکەی ئەو لەچیدایە؟"

کاترین گوڕاندی: "ڕاستی و پاکی" و دیسان راوەستا: "ئەرێ دەزانی قسەکانت بۆنی جنێو دەدەن؟ هێنری زۆر زۆر چاکەی تێدایە، بەڵێ، لەوانەشە زۆر زۆر زۆر خراپەی تێدا بێت. بەڵام خۆ هیچ کام لەمانە پێوەندییان بە تۆوە نییە. من هێنریم خۆش دەوێ، و نامەوێ سەبارەت بە چاکە و شایستەییەکانی هیچ قسەیە لەگەڵ تۆدا بکەم."

نوت گوتی: "ببوورە."

"بەڕاستتە؟"

نوت دیسان ماچی کردەوە.. نوت دیسان ماچی کردەوە چونکی کاترین خۆشی دەویست. ئەوان ئێستا لە باغە میوەیەکی گەورەدا بوون.

کاترین گوتی: "ئەرێ نوت، چەندە لە ماڵ دوور کەوتووینەتەوە؟"

نوت وەڵامی دایەوە: "هەنگاوێك پێشتر لە خەڵکانی تر.. لە نێو گەڵا و بەرگی درەختەکان، لەسەر پردەکان."

کاترین گوتی: "ئەوان ڕێگای خۆیان دەدۆزنەوە.. هەنگاوەکان."

لەو نیزیکانە، دەنگی کەڵە زەنگی بورجی قوتابخانەی مناڵە کوێرەکان بەرز ببۆوە.

نوت گوتی: "قوتابخانەی مناڵە کوێرەکان."

کاترین گوتی: "قوتابخانەی مناڵە کوێرەکان."

ئەو بە حاڵەتی گێژییەکی سەیر و سەمەرەوە سەری ڕاوەشاند:

—هەر ئا ئێستا دەمەوێ بگەڕێمەوە.

نوت گوتی: "ماڵئاواییم لێبکە."

—هەر کاتێك ویستم دەیکەم. وێدەچێ بۆ ماچکردن بشێم.

نوت لەسەر کۆمایەك وێنجەی ژێر دارسێوێك دانیشت و گوتی: "دانیشە."

کاترین وەڵامی دایەوە: "نا".

نوت گوتی: "کارم پێت نەداوە."

—باوەڕ بە قسەت ناکەم.

کاترین لە ژێر درەختێکی تر بیست هەنگاو دوورتر لەو دانیشت و چاوی لەسەر یەك دانا.

نوت گوتی: "بیر لە هێنری ستوارت چازێن دەکەیتەوە؟"

—چی؟

—لەبیری مێردە هەرە باشەکەی داهاتووت دای؟

کاترین گوتی: "ئەرێ، بیر لەو دەکەمەوە."

چاوی توندتر لەسەر یەك دانا و مێردەکەی هێنایە بەرچاوی.

نوت باوێشکی دا.

مێش هەنگینەکان لە نێو درەختەکاندا ویزە ویزیان دەهات و کاترین کەموزۆر خەوی لێکەوتبوو. کاتێك چاوی کردەوە دیتی نوت بەڕاستی خەوی لێکەوتووە.

نوت بە هێمنی پرخە پرخی دەکرد.

کاترین لێگەڕا نوت سەعاتێك بخەوێ و لەو ماوەیەی ئەو خەوتبوو بە دڵ بیری لەو دەکردەوە.

سێبەری درەختەکان رووە و رۆژهەڵات کشابوون. دەنگی کەڵەزەنگی بورجی قوتابخانەی مناڵە کوێرەکان دیسان بەرز ببۆوە. "چیك —چیك —

چیك–چیك." عەرابەیەك لەوێوە تێپەڕی. لە شوێنێکی دوورترەوە، دەنگی هەڵکردنی ترۆمبێلێك، بە ترە تر و شیرە شیرەوە دەبیسترا کە پاش چەند ساتێك بڕایەوە.

کاترین ژێر درەختەکەی جێهێشت و بەرەو لای نوت چوو و لەوێ هەڵترووشکا و گوتی:

–نوت!

نوت وەڵامی دایەوە: "ها؟" و چاوەکانی کردەوە.

–درەنگە.

–سڵاو کاترین.

–سڵاو نوت.

نوت گوتی: "خۆشم دەوێی."

–دەزانم.

–زۆر درەنگە.

–زۆر درەنگە.

نوت هەستایە سەر پێ، بە ئاخ و ئۆخەوە تۆزێك لەشی ئەم بارەو بار کرد و گوتی:

–پیاسەیەکی تێر و تەسەل.

کاترین گوتی: "منیش هەر پێموایە وا بوو."

–لێرەوە ئیتر ئێمە پێکەوە نابین.

–بڕیارە بۆ کوێ بچیت؟

–ڕێی جادە دەگرمە بەر تا دەگەمە شار.

کاترین گوتی: "خۆشت بێ."

نوت لە وەڵامدا گوتی: "تۆیش هەر وەتر. شووم پێبکە، کاترین."

–نا.

نوت بزەیەکی هاتێ. بۆ ساتێك بە وردی لێی ڕووانی و دوایی بە خێرایی ملی ڕێگای گرتە بەر.

کاترین چاوی لە نوت بڕی کە لە نێو دیمەنێکی پڕ لە سێبەر و درەخت، جار بە جار بچوکتر و بچوکتر دەبۆوە، ئەو دەیزانی کە ئەگەر نوت هەر ئا ئێستا ڕادەوەستا و ئاوڕی لێدەداوە و بۆ لای خۆی بانگی دەکرد، بەرەو لای هەڵدەهات. ئەو هیچ ڕێگایەکی بۆ هەڵبژاردن نەمابوو.

نوت ڕاوەستا. ئاوڕی دایەوە و بانگی کرد: "کاترین."

کاترین بەرەو لای نوت هەڵات و باسکەکانی لە باڵای ئاڵاند.

قسەی بۆ نەدەهات.

## سەرچاوە

1/پیکاك، کورت وونەگات، داستان کوتاه، ترجمەی پرویز براتی، رضا نوحی، نشر کتاب نادر، تهران، 1381، ص 83-71.

# دۆك مارلۆ

جەیمس سێربەر
لە ئینگلیزییەوە: ئەدیب نادر

## کورتە بەیۆگرافیەك

لە ساڵی 1894دا لە کۆلۆمبۆس، ئۆهایۆ لەدایك بووە، لەوێدا، کە وەکو خۆی کەرەتێك ووتوویەتی، کۆمەڵێك شتی زۆر ترسناکی بەسەرداهاتبوو. پاش تەواوکردنی دانیشگای (ویلایەتی ئۆهایۆ) لە بالوێزخانەی ئەمەریکیدا لە پاریس هەر لە ساڵی 1919وە هەتا 1920 دەستبەکار بووە، دوای ئەوسا بەرەو ڕۆژنامەگەری ڕووی وەرگێرا. لە ساڵی 1927 بە دواوە بوو بە کارمەندی نیویۆرکەر و، لە سەرەتاوە زۆربەی بەرهەمەکانی خۆی تیادا بلاوکردەوە.

هونەری سێربەر سانا بوو بناسرێتەوە بەڵام سەخت بوو پێناسە بکرێت. جیهانێکی ماتەمبارانەی ژێری ئافراند کە جێپێی ئەو شەبەنگەی سەرسەری پیاوە بچکۆلە تۆقیووەکان هەڵدەگرێت کە بە ناچاری تەقەلا دەدەن کێشەکانی ژیان دەستەبەر بکەن.

نیگار و پەخشانەکانی چوونیەك بە ئابووریئامێز، گاڵتەجاری نائاسایی و، ئاوێتەیەکی بێهاوتای ووردەکاری و فانتازیاوە بەنێوبانگن. لە دوا دواکانی ژیانیدا جەیمس سێربەر بەشێوەیەکی فرەزیاتر نابینا بوو. لە ساڵی 1961یشدا لە نیویۆرك کۆچی دوایی کرد.

لەقەدر لێنانێکی ئۆبزێرڤەردا، پۆل جێنینگس ئەوەی نووسی کە "ئەو بەشێوەیەك هەستی ئیلهامبەخشیی پێداین.. ئەو ژانرێکی ئافراند و خۆی لە نێویدا عیملاقێك بوو."

## دۆك مارلۆ

گەلێك جحێڵتر بووم لەوەی لە سڵکردنەوە و سەرسامبوون بە دۆك مارلۆ شتێکی ترم هەبێت کاتێك کە ناسیم. تەنها شازدە ساڵ بووم کاتێك کە مرد. ئەو شەست و حەوت ساڵ بوو. جیاوازیەکی هێندە بێپایان لە نێو تەمەنماندا هەبوو ئاوایش جیاوازیەکی بێپایانتر لە نێو باکگراوندەکانماندا هەبوو.

دۆك مارلۆ حەکیمی – نومایشگەر بوو. کۆمەڵێك شتی تریش بوو، هەروەها، پیاوی سێرك،

خاوەنی کۆشکی خواردەمەنی لە دوورگەی کۆنیی، خودانی مەیخانە، وەلێ لە پەنجاکانیا لەگەڵ خێوەتی – نومایشی تاقمێکدا کە پێکهاتبوو لە مەکسیکیەك بە ناوی چیکالیللییەوە کە چەقۆی داوێشت و، پیاوێکیش کە بە پرۆفیسۆر جۆنز نێودەبرا، کە بانژۆی دەژەند، گەشتی دیارانی کردبوو. دۆك مارلۆ پاش شایلۆغان و گوتاربێژی بۆ حەشاماتەکە دەهاتە دەرێ و شووشەی داوودەرمانی هەموو چەشنە بیماریەکی دەفرۆشت. ڕوو لە ئاخر و ئۆخرو، پاش ئەوەی کە مرد، پەیتا پەیتا سەرجەمی ئەمانەم لە بارەیەوە بۆ دەرکەوت. کاتێك کە یەکەمجار ناسیم، ئەو بۆ من بوو بە نوێنەری ڕۆژاوای بێئاوەدانی و، لەویش بەولاوە هیچ کەسێکی تر نەبوو کە من ئا ئەمەندە بە ستایش بم بۆی.

من لە پانسیۆنی دێرزەمانەی خاتوو ویلۆوبیدا دیداری دۆك مارلۆم کرد. لە نێو خزموکەسی ئێمەدا سستەر بوو، منیش هەندێك جار وەکو عادەت لە پشووی ئۆخری هەفتەکاندا دەچوومە سەردانی، چونکە گەلێك گرەویدەی بووم. ئەو دەمە من تەمەنم لە دەوروبەری یازدەسالان بوو. دۆك مارلۆ دەرەلینگانەی چەرمی نیشانەداری دەبەردەکرد، یەلەگێکی ڕەنگ – کاڵی مووروویی کە خۆی ووتی لە هیندیە سوورەکان دەستی کەوتبوو، هەروەها شەپقەیەکی دە – گالۆنیی کە تەڵە شقارتەی چێشتخانە لە تەوقەکەیەوە چەسپیبوو، لەم سەرەوە تا ئەوسەری. درێژی لە دەوروبەری شەش پێ و چوار ئینج بوو، بە شەپیلکی پانوپۆڕ و، سمێڵێکی درێژی شۆڕەوە بووەوە. لێی گەڕابوو قژەکەی درێژ بێت، هەروەکو هینەکەی ژەنەڕاڵ کاستەر. دەستە بژێرێکی نایابی یادگاری هیندیە سوورەکان و هەندێك شەش تیریشی هەبوون، وەکو خوویش سەرگوروشتەی موغامەراتەکانی نێو ڕۆژاوای بێئاوەدانیی خۆیشی بۆ دەگێڕامەوە. پەسەندترین گوزارشتەکانی ئەو "هێی، کوڕە!" و "هێی کوڕە– چی!" بوون، کە بەشێوەیەك بە کاری دێنان کە هەندێك مەردوومی ئەوڕۆکە "هۆت – دۆگ!" یانێ خۆ "دۆگگۆن!" بەکاردەبەن. جارێك ئەوەی پێ ووتم کە لە دوئێلی تۆماهۆکدا سەرخێڵێکی هیندیە سوورەکانی بەناوی "یەلۆهاند"ەوە لەسەر پشتی ئەسپدا کوشتبوو. وای بۆچووم کە ئەو مەزنترین پیاو بووبێت کە هەتاکو ئێستاکێ دیتبێتم. هەتا ئەو کاتەی ئەمرد و کوڕەکەی لە نیوجێرسیەوە بۆ گۆڕەو شاردانی نەهات بۆم دەرنەکەوت کە هەرگیز لە ژیانیا لە ڕۆژئاوای دووردا نەببوو. لە بڕۆکلیندا لەدایك ببوو.

دۆك مارلۆ دەستبەرداری گەشتوڕێوبان ببوو کاتێك ناسیم، بەڵام هێشتایش مامڵەتی لەگەڵ ئەوەدا دەکرد کە بە "داوودەرمان" نێوی دەبرد. دەستمایەکەی ئەو هەتوانە بوو کە پێی دەووت ڕۆنەمار کاتێك کە بە دیارەکاندا گەشتی دەکرد. کاتێك کە لە کۆلۆمبۆس سەقامگیر بوو نێوەکەی گۆڕی بۆ هەتوانی بلاك هۆك. دۆك هەمیشە هێندەی لێ نەدەفرۆشت هەتاکو کرێی پانسیۆنەکەی خۆی پێبدات، خاتوو ویلۆوبی بەساڵداچوویش دەبوایە هەندێك جاروبار بۆ ماوەی چەندین حەوتوو "متمانەی" پێبکات.

گوێی بەوە نەدەدا، چونکە مەرهەمەکەی ئەو ئەو قولنجەبەدەی قۆڵی ڕاستی وەدەرنابووە دەرێ کە بۆ سی ساڵ دەستەویەخەی ببۆوە. ڕاهاتبووم ئەو خەڵکانەم دەبینی کە دۆك بە هەتوانی بلاك هۆك شێلابوونی و شانوپیل و ئەو لاقانەیان دەبزواند کە بەرلەوەی ئەو "چارەسەر" یان بکات نەیانتوانیبوو بیجووڵێننەوە. نەخۆشەکانی ئەو ڕەنجدەری ڕۆژانە،

ژنی کۆنترۆڵچییەکانی ترام و مەردوومی لەو بابەتە بوون. جاروبار دەیانقیژاند و دەگریان پاش ئەوەی کە دۆك دەیشێلان، چەندێکیش لەوانە کە نەیانتوانیبوو پێشتر هاموشۆ بکەن بەرزەپێ ببوون و بەملا و ئەولادا هاموشۆیان کردبوو. پیاوێك بۆ حەوت ساڵ بەرلەوەی دۆك بە هەتوانی بلاك هۆك مەستی بکات سەری خۆی بە هیچ لایەکدا وەرنەگێڕابوو. لە نیو سەعاتدا دەیتوانی سەری خۆی بەو ساناییە بجوولێنێتەوە کە من هینەکەی خۆمم پێ دەجوولاندەوە. هاواری لێ هەستا "شکۆداریی بۆ خوداوەند!" دۆك مارلۆ بە نەزاکەتەوە پێی ووت: دۆستەکەم، ئەوە چۆنێتییە نهێنیئامێزەکانی نێو مەرهەمەکەیە". ئەو هەمیشە هەتوانەکەی بە مەرهەم ناوزەد دەکرد.

هەواڵی مۆجیزەکانی بە گوتەی زاران لە میان چینە هەژارترەکانی شارۆچکەکەدا بڵاو بووەوە — لە توانایدا نەبوو بگاتە مەردوومە چێترەکە (کە ئەو بە "تۆنی فۆکس" ناوی دەبردن) وەلێ هەرگیز هێندە ئاڵووێرێکی گەورەی نەبوو کە بە دۆك داهاتێکی سەقامگیر بدات. هەوەڵین، خەڵکەکە وای بۆ چوون کە دەستماڵینی دۆك پتر ئەفسوونئامێز بوو وەك لەوەی نێو هەتوانەکەی، هەروەها، بۆ دووهەمین، پێکهاتەکانی (بلاك هۆك) نرخی هێندەی تێدەچوو کە قازانجەکەی فرەمەزن نەبێت. دەزانم، لەبەرئەوەی خۆم عادەتەن هەرچەند وەخت جارێك دەچوومە کۆمپانیای کیمیکاڵی جوملە فرۆشی و پێداویستیەکانیم بۆی دەکڕی. هەموو ئەو شتانەی کە دەچوونە نێو هەتوانەکەوە ستاندارد و گرانبەها بوون (هەروەها گەلێك بە شۆرەت بوون، پەنامەك نەبوو). پیاوێك لە کۆمپانیاکەدا پێی ووتم کە نازانێت شووشەی لە سیوپێنج سێنت چۆن چۆنی دۆك دەتوانێت هەندێك پارەی پێ قازانج بکات.

بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا کە کاتێك بودجەی فرەنزم دەبووەوە کەچی دۆك هەرگیز لە هیچ یەکێك لە پێکهاتووەکانی کەم نەدەکرد یاخود هی هەرزانبەهاتری نەدەکرد بەیەدەك. خاتوو ویلۆوبی کەرەتێك پێشنیاری ئەوەی بۆ کرد بوو، خۆی پێی ووتم، کاتێك کە لە "ئامادەکردنی تێکەڵەیەك"دا هاریکاری دەکرد، ئەویش شێتگیر ببوو. ووتی "کەڵەکەیەك زەخیرە ڕۆدەکاتە نێو ئەو هەتوانەوە هەتا بەڕێکو ڕەوانیی بگاتە ئاستی دەستنیشانکراو".

دۆك ئەو پارەیەی کە بە قومار دەستگیری دەبوو، بۆم دەرکەوت، دەیخستەوە سەر چکەداهاتەکەی خۆی. شەوانی یەکشەممە لە مەیخانەی فرێکسدا عادەتەن دۆلارێکی زۆر و زەوەندی دەبردەوە، یاری پۆکەری لەگەڵ پیاوانی بازاڕ و ئەو کارگەرانەی هێڵی ئاسندا دەکرد کە لەوێدا دەهاتنە ژوورەوە. هەتا بۆ ماوەی چەند ساڵێك نەبوو پەییم بەوە نەبرد کە وا دۆك گزی دەکرد. هەرگیز هیچم سەبارەت بە کارتی نیشانەکراو نەبیستبوو. هەتا خۆی دەربارەیان پێی ووتم و هینەکانی خۆی نیشاندام. ئەو دەم دوا نیوەڕۆیەکی بارانباربوو، پاش ئەوەی لەگەڵ خاتوو ویلۆوبی و خاتوو پێیففەردا کە کرێچییەکی دیکەی خۆی بوو، یاری سێڤن —ئاپی کرد. لەسەر نەختەدراوێك یاریان کرد (چونکە دۆك یاری کارتی نەدەکرد گەر لانیکەم هەندێك پارە لە گۆڕێدا نەبایە، خاتوو ویلووبیش یاری نەدەکرد ئەگەر فرەزەوەند لە ئارادا بووایە). لە ئاکامدا تەنها بیست یاخود سی سێنت ئەمدەست و ئەو دەستی دەکرد. دۆك هەر هەمووی بردەوە. سەرگەشتەیی و غەزەبی خۆمم دێتەوە یاد کاتێك ئەوەم بۆ ڕوون بووەوە کە دۆك کارتە نیشانەکراوەکانی لە یاریدا بەرامبەر بە

پیرەژن و پیرەمێرددا بەکاری هێنابوون. "تۆ گزیت لێ نەکردن، کردت؟ "لێم پرسی. "جێمی، کوڕەکەم، "پێی ووتم، "ئەو پیاوەی کە داوای نۆرە دەکات پارەکە دەباتەوە". دیدەکانی درەوشانەوە و وێدەچوو کە چێژ لە تووڕەییەکەی من بەرێت. کەللەیی ببووم. دەمزانی هەرگیز ناتوانم دەربارەی ئەوە بە خاتوو ویلۆوبی بڵێم کە چلۆن دۆك لە یاری سێڤن ئاپدا گزی لێکردبوو. خۆشم دەویست، بەڵام ئەویشم هەروەها خۆش دەویست. جارێك لە چواری تەمووزدا دۆلارێکی خشتی پێدابووم هەتاکو تەرەقە و ئاگربازی پێبکڕم.

لە یادمە کەڕەتێك، کە من لەلای خاتوو ویلۆوبیدا مابوومەوە، دۆك مارلۆ بە سایەی ئافرەتێکی هەژارەوە کە لە سۆنگەی نەخۆش کەوتنی کیژۆڵە بچکۆلەکەیەوە شێتوهار ببوو لە نێو نیوەشەودا بە بێدارکراوی لە جێوبالینگەوە هێنرابووە دەرێ. ئەم ژنە سیاتیکای (ئازاری عەسەبی وەرکی —و—) بە هۆی هەتوانەکەی ئەوەوە لێی وەدەرنرا بوو، وەبیر دۆکی هێنایەوە، ئەوسا ئەویش دەستبەجێ ناسییەوە. هەرگیز لە توانایدا نەبووبوو هەتا یەك سێنتیشی بداتێ بەرامبەر بە هەتوانەکەی یاخود "چارەسەر" کردنەکەی و، گەلێکیش زۆری پێبەخشیبوو. هەستا و جلوبەرگی پۆشییە بەر و، بەرەو ماڵەکەی ڕۆیشت. وەك من بۆی چووم منداڵەکە پێچی کۆلۆنیی هەبوو. دۆك هیچ جۆرە ئایدیایەکی نەبوو کە گرفتەکە چی بوو. بەڵام کەوتە ماڵینی هەتوانەکە، شووشەیەکی ڕەبەقی لێوە وەردا. کاتێك کە گەڕایەوە ماڵێ، دوو سەعات پاشتر، ووتی کەوا "مەینەتیەکەی لە کۆڵکردۆتەوە". کیژۆڵە بچکۆلانەکە خەوبردبوویەوە و ڕۆژی دواتر ساغو سلامەت بوو، ئایا بەبۆنەی دۆك مارلۆ خۆیەوە بوو یان سەرەڕای بوونی ئەو بوو نازانم. "دەمەوێ سوپاست بکەم، دکتۆر"، دایکەکە بە هەڵلەرزینەوە ووتی، کاتێك کە بۆ دیداری وی هاتبوو ئەو دوانیوەڕۆیە. شووشەیەکی دیکە هەتوانی پێبەخشی و، بۆ ئەوە و بۆ ئەو سەردانیە پیشەکارانەیەیشی هەروەها پارەی لێوەرنەگرت. عادەتەن ئەوانەی کە دەیشێلان و، هەتوانی پێدەبەخشین، بڕێکی زۆر بوون لەو ئازارکێشانەی کە فرە هەژارتر بوون لەوەی بتوانن پارە بدەن. خاتوو ویلۆوبی جارێك پێی ووت کە گەلێك سەخاوەتە گەلێکیش سانا بە فریو دەچێت. دۆك پێکەنی و چاوی لێ قرپاندم، لەگەڵ ئەو درەوشەیەی لە نێو چاویدا هەبوو کە کاتێ پێی ڕاگەیاندم کە چلۆن لە یاری کارتدا گزی لە پیرێژن کردبوو. جارێك لە دوا نیوەڕۆیەکی شەممەدا بۆ پیاسەکردن لە شەقامی شارۆچکەکە لەگەڵیدا چوومە دەرەوە. ڕۆژێکی گەرم بوو، پاش قەدەرێك ووتم پێویستم بە سۆدا هەیە. ووتی، باشە، ئەو خۆی گوێ نادا ئەگەر بۆ خۆیشی شتێکی بوێت.

چوینە نێو ئەجزاخانەیەکەوەو، من چوکلێت سۆدایەکم پەیجۆرکرد و ئەویش لیمۆن فۆسفەیتی داواکرد. کاتێك کە تەواومان کرد، ووتی، "جێمی، کوڕەکەم!" پێشبڕکێت لەگەڵدا دەکەم هەتا بزانین کێ پارەی نۆشەمەنیەکان دەدات". چارەکێکی بۆ درێژکردم و پێی ووتم تا چارەکەکە هەڵبدەم و ئەو نۆبەتی خۆی جاڕبدات. ئەو خەتی ویست و بردیەوە. من پارەی نۆشەمەنیەکانم وا سڵ کرد. ئەمە بە یەك تاقەدایم "دەسێنتی —و—" منی هێشتەوە.

من پازدەسالان بووم کاتێك دۆك نامیلکەکانی هەروەکو خۆی نێوی دەبردن، هێنایەدی. مەینەتیەکانی خێزانی چاپچیەکی بچکۆلەی سەردەمی هێور کردبووەو پیاوەی شوکرانباریش

نرخێکی تایبەتی بۆ دوو هەزار دانە نامیلکەی ئەدڤێرتی"ئیعلانات" پێدابوو. زۆر کەمیان دەربارەی هەتوانی بلاك هۆك تێدا بوو. زۆری سەبارەت بە دۆك خۆی و "ژیانی خۆیەوە بوو لە ڕۆژاوای دووردا". ڕۆژێك لەگەڵ وێنەگرێکدا — کە یەکێکی دی بوو لە ئاواڵە بێشوومارەکانی خۆی — چوو بوونە دەرەوە بۆ پارکی فرانکلین، لەوێدا وێنەگرەکە چەند دەرزەنە وێنەیەکی دۆکی گرت، هەوسار لە یەك دەست و، شەش — تیرێکیش لەوەی تردا. منیش لەگەڵیاندا چووبووم. کاتێك کە نامیلکەکە کەوتە بەردەست، وێنەکانی دۆك بوون، ئەبڵەق بوو لە دەوروبەری درەختەکاندا، کرۆشکەکرد و لە پاڵ گژوگیاکاندا، هەوسار لوولکردوو، بە تفەنگ سێرەگرتوو.

"دکتۆر هـ —م— مارڵۆ بە دوای دزانی — ئەسپەوە" یەکێکی دیکە بوو. زۆر شانازی بە نامیلکەکەوە دەکرد و هەمیشەش دەستەیەکی پێبوو. بەسەرمەردوومی سەرجادەکاندا بڵاوی دەکردنەوە.

دوو ساڵ بەر لە مردنی دۆك کادیلاکێکی کەونینەی، خەڕەکەشکاوی لە شوێنێکەوە دەستگیربیوو. مەبەستی ئەوە بوو کە سەر لە نوێ بکەوێتەوە گەشتی دیاران، وای ووت، بەڵام بە هیچ کلۆجێك نەیبردەسەر، چونکێ ئۆتۆمبێلە دێرینەکە هێندە شەکەت ببوو کە بۆ یەك میل یاخود لەو دەوروبەرەی زیاتر بڕی نەدەکرد. ئا لەم کاتەدا بوو کە پیاوێك بە ناوی هاردمانەوە لەگەڵ ژنەکەیدا هاتن بۆ ئەوەی لەلای خاتوو ویلۆوبی بمێننەوە. خەڵکی مەزرابوون لە دەوروبەری لانکاستەردا کە شوێنەکەی خۆیان فرۆشتبوو. دەبوایە دۆکیان بە دڵ بێت چونکە گەلەك شادومان بوو، ووتیان، بە سەرگوزشتەکانیشی هەروا خۆشحاڵ بوون. خاتوو هاردمانی بۆ کەونە نارەحەتیەکی تەنگەی سەرپشتی چارەسەر کرد و هیچ پارەیەکیشی بۆ ئەوە وەرنەگرت. وای بۆچوون کە جوامێرێکی خاسە. ئەوسا ئەو ڕۆژە هات کە ئەوان ڕایانگەیاند کە دەڕۆن بۆ سانت لویس، لەوێدا کە کوڕێکیان هەیە. هەندێك دەربارەی سەقامگیر بوون لە سانت لویس دا ئاخاوتن. دۆك مارڵۆ پێی ووتن کە پێویستە ئۆتۆمۆبێلێکی قەشەنگ و هەرزان بکڕن و باژۆنەدەرێ. لەبری ئەوەی بە شەمەندەفەر بڕۆن — هێندەیش ناکەوێت و دەتوانن دیدەنیی دەرەوەی شاریش بکەن، میوانداریەك بە خۆیان ببەخشن. ئێستاکێ، ئەو دەیزانی کە لە کوێندەرێ پێیاندەکرێت ماشێنێکی ئەئاوا وەگیر بهێنن.

بێگومان، لە ئاکامدا کادیلاکە شڕەکەی بەسەریاندا ساغکردەوە — لە شوێنێکی دووردا لە پشتی گەراجێکدا هەڵگیرابوو کە خاوەنەکەی بە خۆڕایی لەوێدا گلیدابووە وە چونکە دۆك دایکی ئەوی لە ئەشکەنجەی نێو بێخی ڕانەکان قوتار کردبوو، هەروەکو دۆك شیکردەوە. لە ڕاستیدا نازانم پیاوی گەراجەکە چۆن نەشتەرگەریی ماشێنەکەی کردبوو، وەلێ کردبووی.

لە ڕاستیدا هەتا ڕادەیەك بێلێبڕ و سەرلەبەر تەقوتوقی لێوەهات ئەو دەمەی کە دۆك هاردمانەکانی بۆ خولێکی تاقیکردنەوەیی بردە دەرەوە. پێی ووتن قینی لەوەیە کە لێی دابڕێت، وەلێ لە کۆتاییدا لێیان گەڕا بەسەد دۆلار بیبەن. ئەوەم دەزانی، بێگومان، دۆکیش هەر بە هەمان شێوە، کە چەند میلێك بەولاوە بڕی نەدەکرد.

دە ڕۆژ پاشتر دۆك نامەیەکی لەلایەن هاردمانەکانەوە لە سانت لویسەوە بەدەست گەیشت. دەبوایە ماشێنەکە لە کەڵەکە سیکراپێکی کەونارای ڕۆژئاوای ژێفەرسۆندا بەجێ بهێڵن،

نزیکەی پازدە میل لە دەرەوەی کۆلۆمبۆسدا. دۆك نامەکەی بە دەنگی بەرز بۆ خوێندمەوە، لە سەرووی چاویلکەکەیەوە تێڕامابوو، چاوەکانی دەدرەوشانەوە، تاوناتاوێك بە "هێی، کوڕە!" و هێی، کوڕەچی!" نوختە نیگاری دەخستە نێو دێڕەکانەوە." من تەنها دەمەوێ تۆ بزانیت، دکتۆر مارڵۆ، "خوێندیەوە،" چی تێدەفکرم سەبارەت بە ژیان هیچێکی تەفرەدەری وەکو تۆ (هێی، کوڕە!) و بۆیە ڕۆژگارێکی دوور و درێژم پێدەوێ بەر لەوەی متمانەی خۆم بە دووڕوویەکی درۆزن و ساختەچیەکی وەکو تۆ بهێنم (هێی، کوڕەچی!". پیاوی گەراچەکەی ڕۆژئاوای ژێفەرسۆن پێی ووتین کە کەونە تەڵەی تەقوتوقەکەت تەنها بۆ ئەوەنە نەشتەرگەریی کرابوو کە ئێمە لە خشتەبەرێت. ئا ئەوە نزمە فریووێکی گەندەڵ و بێئاستی ئەوتۆ بوو کە هیچ بەرازێك لەگەڵ مرۆیەکی سپیدا ئاوەها ڕەفتار ناکات (هێی، کوڕە!) دوور بوو لەوەی بە نامەکە پەشۆکا بێت، دۆك مارڵۆ سادە و ساکارانە سەرسامببوو. چاویلکەکەی خۆی وەلاناو دووری خستەوە، دوای ئەوەی کە تەواوی کرد ودای لە خەندە، دەستی برد بۆ سەر تەوێڵی و چاوەکانیشی نووقاند. بێڕادەشێتگیر ببووم، چونکە هاردمانەکانم لاپەسەند بوون و، چونکە ئەوانیش ئەویان خۆش دەویست. دۆك مارڵۆ بە کاوەخۆ نامەکەی خستەوە نێو زەرفەکەی خۆیەوە و دەنێوبەڕکی ناوەوەی پاڵتۆکەی خۆی ئاخنی، هەروەکو ئەوەی شتێکی دانسقە بووبێت. ئەوساکە دەستەیەك کارتی یاری قۆزتەوەو کەوتە بەربڵاوکردنەوەی دەستێکی تاککەسیی.

"دەتەوێ یاریەکی بچکۆلەی سێڤن —ئاپ دەست پێبکەیت، جێمی؟" لێی پرسیم. منیش کەللەیی ببووم. "نەك لەگەڵ گزیکەرێکی وەکو تۆ!" هاوارم کرد و، بەپێ کوتین چوومە دەرەوەی ژوورەکە، دەرگاکەیشم بە توندی داخست. گوێم لێی بوو لە پاشملەم بۆ خۆی قریوەی دەهاتێ. تەنها چەند ڕۆژێك بەر لە مردنی بوو کە بۆ دواجار دۆك مارڵۆم بینی. هیچ شتێکم سەبارەت بە مەرگ نەدەزانی، وەلێ هەر کە بینیم زانیم کە لە سەرەمەرگدایە. دەنگی فرەکز و ڕووخساریشی ژاکاو بوو، پێیان ووتم ژان و ئازارێکی فرەی هەیە. دەنگی فرە کز و ڕووخساریشی ژاکاو بوو، پێیان ووتم ژان و ئازارێکی فرەی هەیە. کاتێك کە خۆم ئامادەی بەجێ هێشتنی ژوورەکە کرد، داوای لێکردم کە ئەو سنووقە تەنەکەیەی بۆ بهێنم کە لەسەر کۆمەدینەکەیدا بوو. هێنام و دامە دەستی. قەدەرێك بە قامکە لەرزۆکەکانی لە نێویدا سەنگوسووژی کرد و لە ئاکامدا ئەوەی کە دەیویست وەگیری خست. بۆی درێژ کردم و وێیدام. چارەکێك بوو، یان دروستتر بە چارەکێك دەچوو، وەلێ لەسەر هەردوو ڕووەکەیدا خەت هەبوو. "هەرگیز مەهێڵە زەلامەکەی دیکە نۆرە بەرێتەوە، جێمی، کوڕەکەم، "دۆك هاوکات لەگەڵ شەبەنگی کەونە درەوشەکەیی و سەدای قریوەکەی جارانیدا گووتی. هەتا ئێستایش چارەکە دوو ڕووخەتیەکەم هەر لەلایە. بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ حەزم نەدەکرد کە دەربارەی ئەوەو، دەربارەی دۆك مارڵۆ تێفکرم، بەڵان ئێستاکانە دەیکەم.

## سەرچاوە

*The Thurber carnival*

*James Thurber*

*Penguin books pp86-91*

*With out year of publication*

# ستڕانی نووسەر

**جۆسی ولز**

لە ئینگلیزییەوە: شێرزاد حەسەن

که گەورە بووم، یەکێك بووم لەوانەی کە تەواو فەرامۆش کراو بووم. زۆر خراپ لێیان دەدام و دەیانشکاندم و سووکایەتیان پێ دەکردم، چ لە ڕووی سۆزدارییەوە و چ لە ڕووی سێکسییەوە — جنسی–یەوە منیان وێران کرد. بۆ ماوەی پتر لە دە ساڵ باوکم ژیانی منی داگیر کرد، هەروەك دڕك پێمەوە نووسابوو، گەرچی من ئەوم نەدەویست و لێی دەترسام. ئەو ناوو ناتۆرەو قسە سووکانەی کە باوکە تێمی دەگرتن شکۆو فیزی ئادەمیانەی منی بریندار دەکرد و لە ڕێزی خودی منی کەم دەکردەوە. پێیان دەوتم "ئەو کچەی کە دەم و زاری نییە". من زۆر بە دەگمەن قسەم دەکرد و وەڵامی کەسێکم نەدەدایەوە. لە نێوان من و باوکمدا دایکە هەبوو، ئەویش خامۆش و بێدەنگ جووڵەی نەدەکرد. هەر دەتوت من کەوتوومەتە ژێر سێبەری ڕەش و قەبەی "ئەبو هەول". لە ژێر کراسەکەمەوە هەر هەموو ئازای جەستەم شین و مۆر ببۆوە، هەر هەمووی جێ نقورچ و مستەکۆڵە و شەپازللەی دایکە بوو. من "سندرێلا"ی ناو خانەوادەکەی خۆمان بووم کە لە هەر هەموو هەست و سۆز و پەیوەندییەکی جوان دابڕابووم.

بۆ چەندین ساڵ دەتوت لە قوماتێکەوە پێچراوم و لەسەد لاوە توند شەتەك دراوم، دەتوت هەموو گیانم برینە و قەتیش خوێنم ناوەستێت. من سەرگەرمی خوێندنەوەی کتێبان بووم و چەندین باس و لێکۆڵینەوەم لەسەر مامەڵەی خراپ و سووکایەتی و شکاندنی شکۆی مرۆڤ دەخوێندەوە، بەڵام لە ناخی خۆمدا نهێنییەکانی خۆم تەقەت کردبوو؛ خۆم لەسەر خۆم داخستبوو. نەمدەوێرا بە کەس بڵێم باوکی خۆم بۆ سێکس پەلاماری داوم و هاتۆتە گژم. لە تەمەنی (چل و سێ) ساڵیدا بوو کە پەیوەندیم کرد بە دەستە و تاقمێك کە بۆ پشتگیری دەچوون بە هانای خەڵکەوە و ئەو گرووپە سەر بە کڵێسایەك بوون بە ناوی "کەسانی بێ ناو و زیندووماوی پاش ئەتك"؛ دیارە ئەو دەست درێژی کردنە بۆ سەر کچ و ژن و ئەتککردنیان، لە ڕووی

جنسییەوە، یان باوك دەرهەق بە کچ، یان برا دەرهەق بە خوشك، یان کوڕان دەرهەق بە دایکی خۆیان کردبوویان..! ئەو ئازار و دەرد و ئەشکەنجەیەی لەو کچ و ژنانە بیستمن وەك تاڵاوی ژەهر بە دەمارەکانما دەگەڕا. ئا ئەو کاتە من لە نرخ و بەهای نووسینی خۆم گەیشتم. ئێمە کۆمەڵێك کەس بووین و داوامان لێ کرا کە هەریەکە و پەرەگرافێك لەسەر ئەو دەست درێژی و ئەتککردنە بنووسێت. جا لەبری ئەو پەرەگرافە من ئەو نامەیەم لەبەرچاوی هەمووان خوێندەوە کە بۆ باوکم نووسیبووم. بە زمانێکی زۆر ڕوون و ئاشکرا، هەوڵم دەدا کە هەر هێمن و هێور بیخوێنمەوە، هەرچییەکم نووسیبوو خوێندمەوە. کە تەواو بووم و سەرم هەڵبڕی ئەوەی کە بینیم دەریایەك بوو لە چاوانی پڕ فرمێسك و رووخساری غەمگین بە گریان، هەر هەموویان لە من ڕادەمان — بە هەست و سۆز و بەزەییەوە، بە ڕۆحێکی پڕ لە تێگەیشتنەوە. نووسینی ئەو نامەیە بە تەنها سەعاتێکی ویست لە من. بەڵام هەموو ژیانمی خوارد تاوەکو بتوانم وشەکانی دابتاشم.

دوای ئەو دیدەنییە، کچان و ژنان منیان بە گیرو گاز هێناو قسەیان بۆ دەکردم. یەکێکیان وتی:

"نامەکەت قەشەنگ و سەرسوڕهێنەر بوو..!"

یەکێکی دیکەیان دەیوت:

"خۆزگە من وەك تۆ ئازا بوومایە و نامەیەکی ئاواهیم بنووسیایە!"

من هێز و سیحری وشەکانم بیرچووبۆوە: کە چۆن چۆنی دەچنە دڵەوە و ڕۆح پاك دەکەنەوە. من سوپاسی یەکەیەکەی ژنەکانم کرد و تێم تەقاند. چەند مانگێك دواتر.. بۆ یەکەمین جار توانیم چاوم بە پزیشکێکی دەروونناس بکەوێت. لە پرسگەکەدا و بەسەر دیوارەکانەوە چەند تابلۆیەکم بینی کە وێنەی چەند درەختێکی ناوچەی کەمەرەیی — ئیستوائی— بوون و سێبەری پیرۆزەیی و مێخەکی مەیلە و زەردی خۆیان بە ماتی و بەمتی پەخش و بڵاوکردبوو. لەسەر مێزێکی بچکۆلە (ڕۆژژمێرێك)م بینی کە بەرواری دوێنێم لەسەر خوێندەوە. هیچ بەلامەوە گرنگ نەبوو چ سەعاتێکە و چ ڕۆژێکە، چونکە دواجار چل و سێ ساڵی تەمەنی من بە فیڕۆ چوو بوو تاوەکو لە (نا شوێن)ەوە گەیشتبوومە ئەوێندەرێ. ئیدی خۆ من چارەنووسم نادیار و تەم و مژاوی بوو، وەك پاپۆڕێکم لێ هاتبوو کە هەڕەمەکی و کوێرانە هەر جارێك و گەرداوێك لێم بخوڕێت و خۆم دابووە دەست ژیانێك کە پتر لە زەریایەکی سەرشێت دەچوو، هەر ڕۆژە و بەسەر شەپۆلێکەوە بووم.

لە ژووری ژنە دەروونناسەکە وەك هەر نەخۆشێك فۆرمێکم پڕکردەوە کە لەمەڕ مێژووی نەخۆشییەکەم و خۆم پرسیاری زۆری تیابوو، دوای خوێندنەوەیەکی ورد پزیشکەکە وتی:

"تۆ وەك دەروونناسێك وەڵامی هەموو پرسیارەکانت داوەتەوە. چ شتێك ڕێگەی لێگرتیت کە تا هەنووکە لە هاتنت دوا بکەویت؟ لەوە دەچێت کە تۆ خۆت بە تەنیا توانیوتە زۆر چاك ژیانی خۆت بگوزەرێنیت."

لە ڕاستیدا وا نەبوو.. من نەمتوانیبوو بژیم. من لە بۆردێکی بازنەیی دەچووم کە وەك بێژنگ کون کون کرابێت، هەر کونێك و ترسێك و خەمێك و دڵەڕاوکێیەك بووبێت. من ئەوەندە ڕیزپەڕ بووم کە خۆم لە بەردەمی خۆمدا نامۆ و نا ئاشنا بووم. ئاخر من یەکێك بووم لەوانەی کە زیندوو مابوومەوە لە دوای ئەتك و دەستدرێژییەکانی باوکە کە سەدەها جار بە زۆر پەلاماری دام و هاتبووە گژم، هەگبەی خەم و دەردی من ئەوەندە قورس ببوو کە چیدیکە

بە تەنیا دەرەقەت نەدەهاتم هەڵیبگرم. پزیشکەکە بردمییە دەرەوە و جار و بار لە پاکەتێکی کلینیکسەوە پارچە پارچە کلینکسی دەردەکێشا و دەیدامێ. منیش بەدەم قسەکردنەوە کلینیسەکانم لوول دەکردن و جار و باریش لەت و پەتم دەکردن.

کە بینی تەریق بوومەتەوەو ڕووخسارم یەکپارچە شەرمە؛ لە ژێر لێوەوە پێی وتم:

"دەی.. گریان شتێکی چاکە.. بگری..!"

لەسەرخۆ و هێدی هێدی چەند جارێکی دیکەش من و پزیشکەکەم دانیشتینەوە. پاشان.. ڕۆژێکیان لێی پرسیم:

"گەر تۆ بتوانیت شتێك بکەیت کە خۆت ویستووتە، دەتوانیت پێم بڵێی ئەو شتە چییە کە بۆتە خولیات؟

بێ دوو دڵی وەڵامم دایەوە:

"ئا.. دەمەوێ بنووسم."

پزیشکەکەم وتی:

"دەی کەواتە با دەست پێبکەین. با هەوڵبدەین کە تۆ ئەو نووسەرە بیت."

ئەو جارە بوو کە داوای لێکردم لە ماڵەوە ئەرکێك بۆ خۆم و بۆ ئەو جێبەجێ بکەم، داوای کرد کە نامەیەکی دوو لاپەڕە بۆ باوکم بنووسم کە دیسانەوە چیرۆکی ئەو پەلامار و دەستدرێژییانەی باوکم دەرهەق بە خۆم بگێڕمەوە، پێی وتم کە بڕوبیانوو نەهێنمەوە و بەڵکو گەرەکە بینووسم.

من بە نامەیەکی شەش لاپەڕەیی گەڕامەوە، پتر لەوەی کە ئەو خانمە داوای لێ کردبووم.

بە دەستێك لاپەڕەکانی هەڵبڕی و وتی:

"ئەو هەمووەت نووسی؟"

پاشان زۆر بە هێمنی بەسەر کورسییەکەی خۆیدا پشتی دادایەوە و سەرگەرمی خوێندنەوەی نامەکەم بوو — هیچ پەلەی نەدەکرد — قووڵ و بە دڵ. کە تەواو بوو چاویلکەکەی داگرت و سەیرێکی منی کرد، چاوەکانی پڕ ببوون لە فرمێسك.. پاشان وتی:

"نووسینێکی زۆر بەهێزە.."، پاشان لێی پرسیمەوە:

"تۆ حەز دەکەیت چی بنووسیت؟"

پێم وت:

"شتێك کە یارمەتی خەڵکانی وەکو خۆم بدات."

پاشان وتم:

"کتێبێك." بەڵام چونکە دڵنیا نەبووم، بە گومانەوە ئەم دوا قسەیەم کرد.

پێی وتم:

"من حەز دەکەم ئەو کتێبە بخوێنمەوە؛ ئەو کاتەی کە تەواوت کرد."

کەواتە پزیشکەکەم وتی (ئەو کاتەی تەواوت کرد)؛ نەك (ئەگەر تەواوت کرد).

پاشان تێهەڵچۆوە و وتی:

"تاکە کەسێك و شتێك کە ڕێگر بێت لەبەردەمتا هەر تەنها خۆتیت. هەوڵبدە بڕوات بە خۆت بێت!"

من هەموو وشەکانی ئەوم لە یادە. من گۆرانی سەردەمی مناڵی خۆمم لە یادە. ئەو ڕۆحە بەهێزەی کە لە ناوەوەڕا بانگی دەکردم وشەکان بخەمە سەر کاغەز. نا–نەخێر بە تەنها وشەکان نەبوون — بەڵکو من ڕۆح و دڵی خۆم دەخستە سەر کاغەز. ئەو کاتەی مناڵەکان لە قوتابخانەدا سکاڵا و هاواریان بوو بە دەست نووسینەوەی دەرسەکان و ڕاپۆرت و داڕشتن، من هەمیشە لەو دەرس و دەورانە فریایان دەکەوتم. خەیاڵم لەودیو ئەو هێڵە باریکانەی کە لە مەرەکەبەکەوە دەڕژایە سەر کاغەزەکە هەمیشە ڕۆشن و جوان دادەگیرسا.

که خوێندنم تەواو کرد دەبوو وتەیەکی خۆم پێشکەش بکەم، من وەك ڕەوانبێژی قوتابخانەکە قسەیەکی خۆم هەبوو کە لە نووسینێکدا ڕازاندبوومەوە. ئێستاش کپی و خامۆشبوونی ئەو خەڵکەم لە یادە، پاشان هاڕە و تەقینەوەی چەپڵە ڕێزانی هەر هەموو میوانەکان.

دایکە و باوکە لە هەموو بەهرە و جوانییەك منیان بەتاڵ کردبۆوە. سووکایەتی ئەوان بە من و دەستدرێژی و شکاندنی ڕۆح و شکۆی من تەواوێك منیان شکستە باڵ کرد و خنکابووم، وازم لە نووسین هێنابوو، کە لە قوتابخانە بووم تەنها لە پۆلدا نووسینەکانی خۆم دەخوێندەوە. پێیان وتبووم:

"کە نووسەرەکان نابن بە هیچ.. دواجار تۆ دەبیت بە مامۆستا."

بەڵام لە ناخی مندا پشکۆکان گەش گەش دەسووتان.

ئێستاکە من هەم نووسەرم و هەم شاعیرم. شیعرەکانی من لە ناو سێ بەرگی دیوانە شیعری شاعیراندا بڵاو بوونەتەوە. بە پێوانەی شیعر: شیعری (–ستاندارد– *standard*) نین، بەڵکو شیعری من ژەنینی ئاوازێکی جیایە. وشەکانم بارگاوین بەو هەموو شتانەی کە ژینی منی پڕ کرد لە سووکایەتی و شکاندن و ئەتکبوون، من لە قووڵایی دڵمەوە دەنووسم – ئاراستەی دڵی ئەو کەسانەی دەکەم کە دوای ئەو ئەتککردن و سووکایەتی و پەلامارانە ماونەتەوەو زیندوون: جا لە هەر شوێنێکدا بن. دەنگی من سەراپاگیر و جیهانگیرە. من گوێم لە دڵی خۆم گرت و لێی گەڕام گۆرانی خۆی بچڕێ.

هەندێك جار شتی پڕوپووچ دەنووسم. بۆ ماوەی دوو ساڵ سەرگەرمی نووسینی ستوونێك بووم لە ڕۆژنامەیەکی تایبەت بە هەواڵ کە ناوی (فرۆگ پۆند) بوو. ئەو ڕۆژنامەیە ڕووی لەو کەسانە کە وەك حەزیان لە بۆق کۆکردنەوە بوو. جگە لەوەش چەندین باس و خواسم لە گۆڤاری (فلۆریدا گاردننگ) بڵاوکردەوە. لە ڕابردوودا هەواڵ و ڕاپۆرت و دەنگ و باسم بۆ سێ ڕادیۆ دەنووسییەوە.

بەڵام هەمیشە دەگەڕامەوە سەر نووسینی کتێبەکەم. چونکە ئەو کتێبە ناسنامەی من بوو. سیمفۆنیای من بوو. بۆ ئەم مناڵەم دەنووسی کە هەرگیز خۆشەویستی تام نەکردو نەیبینی. بۆ هەموو مناڵەکانی دوێنێیەکانمان: مناڵانی ڕۆژگاری ڕابردوو. بۆ منداڵەکانی سبەینێیەکانمان لە ڕۆژانی ئایندەدا. من گوێم لێیە کە بانگم دەکەن. من زۆر باش ئاگام لە قۆناغە جیاکانی ژیانیانە: هەر هەموو وێستگەکان. ڕووباری ئەو فرمێسکانەی کە ئەوان دەکەونە دوای. لە خۆمدا – لەواندا – من توانیم وەڵامێکم بۆ پرسیارەکەی دەروونناسەکە بدۆزمەوە:

"تۆ بەتەمای چی بنووسیت؟"

من دەبێت ئەو وشانە بنووسمەوە کە ئەو سەرگوزشتە و حەکایەتانە دەگێڕنەوە. من دەبێت ئەو یاسا و ڕەمز و هێما و شفرە بێدەنگانە ورد و خاش بکەم کە کۆت و بەندمان دەکەن، دەنووسم تاوەکو کەسانی دیکەی وەکو من بزانن کە لەم دونیایەدا تەنیا نین، جگە لەوەش، هەرچەندە تاریکە ئەم جیهانە، بەڵام (وەکو من) لەوانەیە بتوانن گۆرانی خۆیان بچڕن.. دیسانەوە!

## سەرچاوە

*Chicken Soup For the Writers Soul*

*Jack Canfield, Mark Victor & Bud Gardner*

*Pages (27-30)*

# پەروانە

هیلینا ماریا ڤیرامۆنتس
و. لە ئینگلیزییەوە: سەدرەدین عارف

کاتێك کە نەنکم داوای یارمەتی لێکردم تەمەنم چواردە ساڵان بوو. نەنکم لە ئاگری گرانەتا رزگاری کردبووم لە ڕێگەی دانانو لابردنو گۆڕینی قاشی پەتاتە لەسەر تەوێڵم؛ زۆر شتی دیکەشی لێ بینیبووم، وەکو لێدانم بە قامچی، شکانی قۆڵم بەهۆی بازدانمەوە لەسەر دوکانی تیرئینریکەوە، باڵقبوونمو یەکەم درۆ کردنم. بە دایکم وت: زۆر ڕەوایە کە داوای یارمەتیم لێ بکات.

لەبەرئەوە نەبوو کە کچەزایەکی پەسەندم، یان لەبەر هەر هۆیەکی تر. تەنانەت، وەکو خوشکە گەورەکانم، کچێکی جوانو باشیش نەبووم. ئەو شتە کچانەشم پێنەدەکرا کە ئەوان دەیانتوانی بیکەن. دەستەکانم ئەوەندە زلبوون کە نەمدەتوانی مامەڵە لەگەڵ وردەکاریی ئیشی دەرزیو چنینو نەخشاندندا بکەمو هەمیشە دەزووە ڕەنگاورەنگەکان بە دەستمەوە دەئالۆسکانو خوشکەکانم پێم پێدەکەنینو بە دەنگی ناسك پێیان دەگوتم: گا دەست. بۆیە هەمیشە لەتێك خشتی تیژم لە گۆرەوییەکەمدا شاردبووەوە بۆ لێدانی ئەو کەسەی ئەو ناتۆرەیەی لێدەنام. جارێکیان لە ژووری نوستن دانیشتبووین کە لەتە خشتەکەم کێشا بە تەوێڵی تێریزادا. حەپەساو، بە دەمی داچەقاوەوە، دەستی گرت بە ناوچەوانییەوەو رایکرد بۆ لای دایکم. خوێن لە نێوان پەنجەکانییەوە دەهاتە خوارێ. لەو ڕۆژەوە راهاتم بە دارکاریو جەڵدە لێدان.

زۆر ڕێزداریش نەبووم. ئەوەندەش بێ ئابڕووبووم کە خەریك بوو گومان بخەمە سەر ئەو قاشە پەتاتانەی کە نەنکم دەیخستنە سەر تەوێڵمو دەیگوت کە تایەکەم دادەبەزێنێت."هێشتا زیندوویت، وانییە؟" نەنکم لەپڕ لێی پرسیمو چاوە خۆڵەمێشییەکەی تێبڕیمو کەلێنێکی خستە ناو گومانەکانمەوە. ڕووم نەدەهات سەیری چاوەکانی بکەم چونکە پەشیمان بووم لەوەی کە هێشتم پرسیاری نهێنی لە زارم بترازێت. دەستەکانم کەوتنە لەرزینو وەکو لووتی درۆزن درێژبوون. ئینجا وەکو

دوو شتی قورس بە تەنیشتما شۆڕبوونەوە. نەنکم مەرهەمێکی لەڤیکس‌و باڵی پەروانە بۆ دروستکردم‌و دەستەکانمی پێ چەورکرد. دەستەکانم گەڕانەوە بۆ دۆخی جاران‌و ئەمەش هەستێکی سەیری پێ بەخشیم. دەتگووت ئێسقانەکان دەتوێنەوە، دەتگوت هەتاوەو لەناو تاریکایی پێڵوەکانتدا هەڵدێت. لەو ڕۆژەوە ئیتر پێم ناخۆش نەبوو کە یارمەتی نەنکم بدەم ، لەبەر ئەوە دایکم هەمیشە دەیناردم بۆلای نەنکم.

پاش نیوە ڕۆژێك، دایکم قژی لە پشتی سەریدا بەست‌و بلووزو پێڵاوەکانی دایە دەستم‌و داوای لێکردم کە بچم بۆ لای دایە (لوونا). دەمزانی کە ئەم ناردنە بۆ ئەوەیە کە دوورم بخاتەوە لە فەلاقەکردنێکی دیکە. هەموو جارێك دوا زەبرم لە قۆڵی ماریسێلا دەگەیاندو بازێکم دەدا بۆ دەرەوەی ماڵ. داخستنی دەرگا پەردەییەکە قیژ تووڕەکەی ماریسێلای کپ دەکرد. پێم خۆش بوو کە یارمەتیی نەنکم بدەم بۆ ڕواندنی گوڵی یاسەمەن‌و سەوسەن‌و گوڵی کێویی تر لەناو قوتوی قاوەدا. نەنکم لە پلیکانەی سەرەوەی بەرهەیوانەکەدا چەکوشێك‌و بزمارێك‌و هەندێك قوتوی بەتاڵی بەدەستەوە دەگرت‌و چاوەڕوانی دەکردم. هەرچەند بە دەگمەن پێکەوە قسەمان دەکرد یان سەیری یەکتریمان دەکرد لەکاتی ڕواندنی نەمامەکاندا، بەڵام هەمیشە هەستم بەچاوە خۆڵەمێشییەکانی دەکرد کە چاودێریم دەکەن، ئەمەش هەستێکی سەیری پێ دەبەخشیم. هەستم دەکرد کە سەلامەت‌و پارێزراوم‌و تەنیا نیم. وەکو ئەو هەستەی کە دەڵێن بوونی خودا پێتدەبەخشێت.

لەبەر هەیوانەکەی نەنکمدا، لەبنی قوتوەکاندا، بە بزمارو لێدانێکی وردی چەکوشدا، کونم دروستدەکردو کە لەمەش دەبوومەوە، بە گڵی سوور پڕم دەکردن‌و بە چوار پەنجە کونی ڕێکم لە گڵەکە دروستدەکرد بۆ ئەوەی ڕووەکی تازەی ئەڤۆکادۆو پەتاتەی شیرینی ریشاڵداری تێدا بڕوێنم کە نەنکم یەك بەیەك بە چوکڵی دانپاکردنەوەو بە ئاودانی ڕۆژانە لە گۆزەی مایۆنێزدا ڕواندبوونی، یان ڕواندنی ڕووەکی دڕکاویی چایۆتس کە وەکو مێو بە کۆڵەکەکانی بەر هەیوانەکەیدا هەڵدەگەڕا هەتا دەگەیشتنە بنمیچەکەو ئینجا بەودیودا شۆڕ دەبوونەوەو ماڵە خشتە بچووکەکەی نەنکم لە بێشکەیەك لەناو مێوەکاندا، کە بەرەکەی لە هەرمێ دەچوو و پێیدا شۆڕدەبوونەوەو ئامادە بوون بۆ لێکردنەوەو بۆئەوەی لەگەڵ پیازو کەرەو پەنیردا بەهەڵم لێ بنرێت. ڕەگەکان پاشان لە کونی قوتوەکانەوە دەردەپەڕین‌و بۆ شوێنێك دەگەڕان بۆ ئەوەی پەیوەندی پێوە بکەن. پاشان هەڵدەسام بە ئاودانی ئەو نەمامانە. نەنکم وتی ئەمجارە یارمەتیدانەکە جیاوازە، چونکە نەنکم لەسەرە مەرگدا بوو. پزیشکەکە سەیرێکی چاوە خۆڵەمێشییەکەی کردو وتی تەنها چەند ڕۆژێکی ماوە. لەبەرئەوە زۆر ڕەوابوو ئەم دەستانەم، کە توانەوەو پاشان چاکبوونەوە، سوودی ئەوەیا هەبێت کە جەستە قوپاوەکەی بە کهول‌و ماریگوانا چەور بکەم‌و قاچ‌و قۆڵی بشێلم‌و ڕووی وەرگێرم بەرەو پەنجەرەکە بۆ ئەوەی چاودێریی گەشەکردنی باڵندەی (مەلی بەهەشت)، یان بۆنی سیر لە هەواکەدا بکات. قژە بۆرە خۆڵەمێشییە لوولەکەی بەسەر دۆشەکەکەدا بڵاوببوونەوە. لەوەتەی من لەبیرمە نەنکم قژی لە پرچی درێژدا دەهۆنییەوە. چەند جارێك دەموچاویم بە خاولی سڕییەوەو بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ دەستەکانیم گرت. کە لە نزیکەوە سەیرت بکردایە چاوە خۆڵەمێشییەکانت دەبینی کە لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەیان دەکرد. سەرنجی تیژیان دەدا، دەتگوت دەیەوێت هەموو شتێکی بیر بکەوێتەوە.

ماچم نەکرد. کە چووم بۆ بازار پەنجەرەکەم بە کراوەیی بەجێهێشت.

لەوبەری شەقامەکە، لە بەرامبەر بازاڕی (جەی)دا کەنیسەیەکی بچووك هەبوو. نەمدەزانی کێ بەڕێوەی دەبات، لەگەڵ ئەوەشدا چوومە ژوورەوە بۆ گەڕان بە شوێن مۆمێکدا. مۆمم بەدەستنەکەوت و لەسەر کورسییەکی درێژ دانیشتم. دوای پاککردنەوەی نینۆکەکانم سەرم هەڵبڕیو سەیری بنمیچە بەرزەکەم کرد، فراوانیی ئەم جۆرە شوێنانەو ساردیی ستوونە مەڕمەڕەکان و پەیکەرە تەزیوەکان و چاوە بۆشەکانیانم بیرچووبووەوە. بەتەنیا بووم و دەمزانی بۆ نامەوێت بگەڕێمەوە.

ئەمە یەکێك بوو لە گلەییە گەورەکانی باوکم. باوکم مشتی ئەکێشا بە مێزەکەداو قاپی شەکردانەکەی دەلەرزاندو شیرەکەی دەڕشت و دەیقیژاند بەسەرمدا کە ئەگەر رۆژانی شەممە نەچم بۆ کەنیسە بۆ رزگارکردنی گیانە گوناهبارەکەم، ئیتر پێویست ناکات لەماڵ دەربچم. خاڵی کۆتایی رستە. دەستی دەگرتم و نینۆکەکانی لە دەستم دەچەقاند بۆ دڵنیابوون لەوەی کە لە قسەکانی تێدەگەم. لە قسەکانم تێگەیشتیت؟ ئینجا تووڕەییەکەی ئاراستەی دایکم دەکرد بەهۆی خراپی شێوازی پەروەردەکردنی کچە بێ باوەڕو بێ حورمەتەکانی. خوشکە گەورەکەم قۆڵی دەگرتم و رایدەکێشام بۆ لایەك و پێی دەگوتم ئەگەر هەر ئێستا نەچم بۆ کەنیسە بۆ نوێژکردن بەهەر هەموویان تێهەڵدانی باشم دەکەن. بۆ ئەوەندە خۆپەرستیت؟ نابینی چی بەسەر دایەدا دێت بەهۆی تۆوە، گەمژە؟ منیش پێم دەشت و دەمخستنە پێڵاوە رەشەکەی جەژنەوە کە بە وازەنی بریسکەدارم کردبوو، کتێبی نوێژەکەم هەڵدەگرت و بەدەست خواحافیزیم لە دایکم دەکرد.

بە هێواشی بەرێگاکەدا دەرۆیشتم و درزەکانی چیمەنتۆکەم دەژمارد هەتا دەگەیشتمە (ئێڤەگرین)، لەوێوە بەلای چەپدا وەردەگەڕام و دەچوومە ماڵی نەنکم. حەزم لەبەرهەیوانەکەی نەنکم دەکرد چونکە بە گەڵای درەختی چایۆتس داپۆشرابوو و لەوێوە دەمتوانی بە ئارەزووی خۆم سەیری خەڵك و سەیارەکانی سەر شەقامی (ئێڤەگرین) بکەم بێ ئەوەی کەس پێم بزانێت. بەسەر پلیکانەکانی بەر هەیوانەکەدا بەباز هەڵدەگەڕام و قاچم دەسڕی و لە دەرگا پەردەییەکەم دەداو بانگی دایکم دەکرد. نەنە گیان؟ کاتێك کە دەرگاکەم دەکردەوەو سەرم دەبردە ژوورەوە، لە ژووری میوانەوە بۆنی قێزەوەندی سوورکردنەوەی بیبەری تیژم دەهات بە لووتدا. کە دەگەیشتمە ژووری میوان نەنکم لە مووبەقەکەوە دەهات بەپیرمەوەو دەستی بە بەروانکەکەی دەسڕی. بۆنی بیبەرەکە کاری لە چاوەکانم کردو فرمێسکیان پێدا هاتە خوارێ. دەگریم؟ نەخێر، نەنە لوونا، ناگریم. من حەزناکەم بچم بۆ کەنیسە بۆ نوێژکردن. بەهەر حاڵ، فرمێسك وەکو مۆمی تواوە بە چاوەکانما دێتە خوارێ. نەنکم بیبەرە تیژەکانی لەسەر ئاگرەکە داگرت و کەوتە ئاوپرژێن کردنیان هەتا چەرمەکەیان داماڵران. لەبەردەمم دایناو خۆی چوو بۆ بەسەرکردنەوەی شۆربای گەدەکە. منیش دەستمکرد بە داماڵینی پێستی بیبەرە تیژەکان و، بیبەرە سەوزو زەرد چرچ و ناسکەکانم دەخستە ناو هاوەنەکەوە. دەستم بە هاڕین و تێکدانیان کردو بۆنی سیرو بیبەرە دەبەنگەکان دیسانەوە تووشی گریانیان کردم. ئەوەندەم هاڕین هەتا لە ژێر دەسکە هاوەنەکەدا بوو بە شلەیەك. بە کەوچکێکی دار زۆر بە توندی تێکمدەدان بۆ ئەوەی ئەو هەستکردنەم بە تاوان کە لە دەروونمدا پەنگی خواردبوو لاببەم. فرمێسکەکانم نەمان. بیبەرەکەم لە دەفرێکدا لە گوڵدانێکدا دانا کە پڕکرابوو لە گوڵی تازە لێکراوە.

نەنکم دەستێکی لە دەستم داو ئیشارەتی بۆ ئەو دەفری شۆربایە کرد کە لەبەردەمم دانابوو و هەڵمی لێ هەڵدەستا. بە کەوچکێك هەندێك بیبەرم خستە ناو شۆرباکەو چۆرەکێکی گەنمەشامیم بەدەستەوە گرت. لە کاتی نانخواردندا شەماڵێکی خۆش هاتە موبەقەکەوەو پەڕەی گوڵێك بە هێواشی وەکو پەڕ لەسەر مێزەکە نیشتەوە.

بەپەلە کەنیسە بچووکەکەم بەجێهێشت بێئەوەی خۆم پیرۆز بکەمو چووم بۆ دوکانەکەی (جەی). زۆربەی کات لە دوکانەکەدا شتی ئەوتۆ بەدەست نەدەکەوت. تەماتەکان بڵ ببوون‌و قوتوی خواردەمەنییەکان پەڵەی ژەنگاوییان پێوەبوو. پاکەتی دانەوێڵەکانیش تۆزو خۆڵ داییپۆشیبوون. پێویستییەکانم هەڵگرت کە بریتیبوون لە کهوولی چەورکردن‌و پێنج قوتوی شۆربای مریشك‌و شووشەیەکی گەورەی شیلەی سەرو. لە پێشدا (جەی) زۆر تووڕە بوو چونکە وای دەزانی کە پارەم پێ نییە. بەڵام پارەکە لە گیرفانمدا بوو. کە لەبازاڕ گەڕامەوە، گوێم لە دایکم بوو کە لە مووبەقەکەی نەنکمدا دەگریا. بە چاوێکی ئاوساوەوە سەیرێکی کردم. کیسەی ئەو شتانەی کە لە بازاڕ کڕیبوونم لەسەر مێزێك داناو قوتوەکانم هەڵگرت. دایکم بە ئارامی هەنسکی دەدا. ماچم نەکرد. پاش ماوەیەك دەستم لە پشتی‌دا بۆ دڵدانەوەی. دایکم بە چرپە پرسی"ئەی دایکم؟"دایکم هەناسەی سوار بوو و بەروانکەکەی نا بە دەموچاوییەوەو دەستیکردەوە بە گریان. وتم: نەنکم، دوێنێ، دوو کەڕەت لە جێگەکەی کەوتە خوارەوە. دەمزانی کە نەدەبوو ئەمەم بووتایە، بەڵام نازانم بۆچی وتم. ئەمە وایکرد کە دایکم زیاتر بگری. لاموایە لەبەر ئەوە بوو کە تووڕەو وەڕسبووم لە شەڕو لێدان‌و نەهاتنەدیی ئاوات‌و پاڕانەوەکانم. قۆڵەکانم، بەبێ هیوا، بە تەنیشتما شۆڕببوونەوە. دایکم جارێکی تر سەیری کردم. تووڕەو شڵەژاو و چاوەکانی پڕ لە خەفەت بوون. چوومە دەرەوەو لەسەر جۆلانەکەی بەرهەیوانەکە دانیشتم‌و کەوتمە چاودێریی ئەو کەسانەی کە بەوێدا تێدەپەڕین. لەوێ مامەوە هەتا دایکم ڕۆیشت. وەنەوز گرتمی‌و وەکو نوێژی تەزبیحکردن لەبەر خۆمەوە دووبارەم دەکردەوە: کاتێك کە دەست بە بەخشین دەکەیت کەی لەو بەخششە دەوەستیت، کاتێك کە... لەبەر هەردوو دەستم کەوتنە کۆشم‌و لەخەو ڕاپەڕیم. ڕۆژ ڕەنگێکی پرتەقاڵیی وەرگرتبوو و لە ئاوابووندا بوو. دەمزانی کە ئێستا نەنکم برسییەتی .

کاتی ئەوتۆ هەیە کە هەتاو یاخی دەبێت. ئەو کاتەی کە باری دەروون دەگۆڕێت و دەمی دیاریکراوی ڕۆژ، لە کاتی گۆڕانی ڕەنگێك بۆ ڕەنگێکی دیکە، ئەو سەعاتەی، یان ئەو چرکەیەی کە هەتاو بە تەواوی دەبەزێت‌و لە ئاکامدا نوقم دەبێت‌و بۆی دەردەکەوێت کە لەگەڵ ئەو هەموو هێزەی کە هەیەتی، ئیتر ناتوانێت بسوتێنێت‌و چارەسەر بکات، یان هەتا هەتایە بمێنێتەوە، ئەوسا لە ئەنجامی گەیشتنی زەوی‌و هەتاو بەیەك، ڕوناککردنەوەیەك دەردەکەوێت. ئەو دوا تەقینەوەیە پرتەقاڵییە سوورباوە شێتگیرە، ئەوەمان بیردەخاتەوە کە هەرچەند کۆتاییەکان دیاریکراون، بەڵام پێویستن بۆ دووبارە لەدایکبوونەوە. کە ئەو کاتە هات‌و هەر کە گڵۆپی مووبەقەکەم داگیرساند بۆ ئەوەی قوتویەکی شۆربای بۆ هەڵبچڕم، لەوانەیە هەر لەو کاتەدا بووبێت کە نەنکم مرد.

ژوورەکە بۆنی شیلەی سەرو و ڕژانەوەو گەدە نەخۆشەکەی نەنکمی لێدەهات. ڕووی بەرەو پەنجەرەکە وەرگێڕابوو و هەوڵی دابوو کە قسە بکات، بەڵام دەمی بە کراوەیی مابووەوەو بێ قسە بوو. دەستم بە ڕومەتیدا هێناو وتم:"گوێم لێتبوو، نەنە" پەنجەرەی ماڵەکەم هەموو کردەوە بۆ ئەوەی

شۆربای سەر تەباخەکە باش بکولێت. ئینجا تەباخەکەم کوژاندەوەو شۆرباکەم رشتە ناو سنکەکە. لە دۆلابەکە تەشتێکی تەنەکەم دەرکردو پڕم کرد لە ئاوی شلەتێن‌و بە وریاییەوە بردم بۆ ژوورەکە. لە دۆلابێکدا هەندێك خاولیی سپیم دەرهێنا. چۆن قەشەیەك بە پیرۆزییەوە جلەکانی ئامادە دەکات، منیش بە هەمان شێوە خاولییەکانم یەکالاکردەوەو خستمنە سەر شانم، چەرچەف‌و پەتووەکەم لەسەر نەنکم لاداو جلە فانیلەییە ئەستوورەکەیم لەبەر داکەند. روخسارە حەپەساوەکەیم بە خاولی سڕی‌و لۆچەکانی سەر روویم راکێشا بۆ سافکردنی‌و تاڵە قژە لوولەکەیم لەسەر ملی لاداو شان‌و مەمکەکانیم بە خاولی سڕی. ئینجا ئاوەکەم گۆڕی. گەڕامەوەو بە خاولی سکی‌و تووکەبەرو رانە چەماوەکەیم سڕی. هەروەها چڵکی نێوان پەنجەکانی پێیم سڕی‌و تێبینیم کرد کە نیشانەیەك بەسەر سمتییەوە هەیە. ئەو شوێنبرینە باریکانەی کە بە پشتییەوە بوون‌و لە خەتە باریکەکانی ناو لەپی دەچوون بۆیان دەرخستم کە چەند شتی کەم لە بارەی نەنکمەوە دەزانم. بە پەتوویەکی تەنك داپۆشی‌و چووم بۆ حەمامەکە. دەستەکانم شت‌و بەلووعەی حەوزەکەم کردەوەو چاودێری ئاوەکەم دەکرد بەخوڕ دەرژایە ناو حەوزەکەوەو هەڵمی لێ هەڵدەستا . کاتێك کە حەوزەکە پڕ بوو ئاوەکەم گرتەوەو خۆم رووتکردەوە. ئینجا چووم بۆ هێنانی نەنکم.

نەنکم وەکو دامنابوو ئەوەندە قورس نەبوو. کاتێك کە هەڵمگرت لەشی وەکو پیتی (٧) چەمایەوە، زوو ماندوو بووم‌و قاچم کەوتە لەرزین. ئەژنۆکانم تۆزێك نوشتاندەوە بۆ ئەوەی بە ئەسپایی بیخەمە ناو ئاوەکەوە بێ ئەوەی پێستەکەی بڕوشێت. لە کاتێکدا کە دەمخستە ناو ئاوەکەوە دڵم دەدایەوەو دەمگوت: دەی، دەی، نەنە گیان، هیچ نییە. قژەکەی کشایە دواوەو بەسەر ئاوەکەدا وەکو باڵی هەڵۆ بڵاو بووەوە. ئاوی حەوزەکە هەڵڕژایە سەر کاشی زەوییەکە. ئینجا پەروانەکان هاتن. پەروانەی بۆزو بچووك کە لە رۆحییەوە هەڵدەقولان‌و لە دەمییەوە دەردەچوون‌و بەرەو رووناکی بەرز دەبوونەوەو بە دەوری گلۆپی حەمامەکەدا بازنەیان دەبەست. مردن کارێکی تەنیاییەو منیش دەمویست بۆ لای پەروانەکان بڕۆم، دەمویست لەگەڵ نەنکمدا بمێنمەوەو درەختی چەیوتس بڕوێنم، کە لقەکانی بە پەنجەرەکاندا بەرەو هەورەکان دەکشێن، دەمویست سەرم بنێمە سەر سنگی‌و ئەویش دەست بە قژما بهێنێت‌و باسی ئەو پەروانانەم بۆ بکات کە لە گیانیدا دەژین‌و وردە وردە رۆح دەخۆنەوە، دەمویست لەگەڵیدا بگەڕێمەوە بۆ ئاوی منداڵدان بۆ ئەوەی هەرگیز تەنیا نەبین. دەمویست. دەمویست. دایکم دەیویست. هەندێك قەفی قژیم لەسەر رووی لاداو سەرە بچووکە سووکەکەیم خستە بۆشایی ملم. حەمامەکە پڕبوو لە پەروانە. بۆ یەکەمجار لەماوەیەکی زۆردا، گریام‌و هەردووکمانم رائەژەند. دەگریام بۆ خۆم‌و بۆ ئەو و بۆ دایکم. گریانەکەم لە قووڵایی حەسرەتەکانمەوە هەڵدەقولان، لە نائومێدی ئەوەی کە نیوە لەدایکبووم، دەگریام‌و فرمێسکەکانم سەدەها شەپۆلی خەم‌و حەوانەوەم دروستکرد. بە ئەسپایی هەردوکمانم رادەژەندو بە نەنکم دەگوت: دەی، دەی، قەیناکات.

## سەرچاوە

*An introdution to literature*،
*E dited by sylvan Barnet*، *1993.*

# شڵپە لە نێوان شەپۆلی دەریا و جەستەی مرۆڤدا

دانا رەئوف

سەمای: شڵپە *Brus*

کۆریۆگرافیای: یوهان ئینگەر *Johan Inger*

گرۆی: کولباری بالێتن *Cullbergbaletten*

لەماڵی سەما *Dansens Hus*

## سەرەتا

کۆمپانیای "کولباری بالێتن" یەکێکە لە گرنگترین گرۆکانی سەمای سویدیی و دادەنرێت بە یەکێك لە گرنگترین کۆمپانیاکانی سەمای جیهانیش. ساڵانە پرۆژەکانیان، جگە لە سوید، لە زۆربەی وڵاتانی جیهانیش پێشکەش دەکرێت. ئاستەکانی هونەری سەما و کۆریۆگرافی ئەم گرۆیە لە ترۆپکدایە، پێناس و کارەکتەری تایبەتی خۆی هەیە و بە ئاسانی جیادەکرێتەوە لەهەر سەمایەکی تر لە جیهاندا نەمایشبکرێت. ئەم کۆمپانیایە لە ساڵی (1967)دا لە ستۆکهۆڵم دامەزراوە و تا ئێستا لە زیاتر لە چل وڵاتی جیاوازی جیهانیدا تابلۆ ڕازاوەکانیان پێشکەشکردووە. سویدییەکان ئەم گرۆیە دادەنێن بە باڵیۆزێکی کلتوری سویدیی و دەنگێکی گرنگ لە جیهاندا. گەشتەکانی ئەم کۆمپانیا سەمازانە تەنها لە شاری ستۆکهۆڵم و دەرەوەی سنورەکانی ئەم وڵاتەدا سەقامگیر نابێت. بەڵکو وەك پرۆژە و گرۆیەکی نەتەوەیش، بەرهەمە هونەرییەکانیان لە زۆربەی شار و شارۆچکەکانی وڵاتی سویددا پێشکەشدەکەن. ئەم کۆمپانیایە بیست سەمازانی لە چەندین وڵاتی جیاوازەوە لەخۆ کۆکردۆتەوە. لە پاڵ سەمازانە سویدییەکاندا سەمازانی ئینگلیزی، ئیسرائیلی، نەرویژی، ژاپۆنی و هۆڵەندی لە خۆدەگرێت.

یەکێك لە بەڕێوەبەرە هونەرییە گرنگەکانی ئەم کۆمپانیایە هونەرمەند (ماتس ئێك) *Mats EK* بوو. ئەم هونەرمەندە کوڕی گەورەی دامەزرێنەری

کۆمپانیاکە خاتوو (بیرگیت کولباری) *Birgit Cullberg* یەو لە ساڵی (1945)دا لە ستۆکهۆڵم لەدایکبووە. ماتس ئێک لە سەرەتادا وەک ریژیسۆر هاتۆتە بوارە هونەرییەکەوە. لە ساڵی (1973)دا وەک سەمازان دەبێتە ئەندامی کۆمپانیاکەی دایکی، بەلام لە ساڵی (1976)دا وەک کۆریۆگرافێکی بە توانا دەکەوێتە کارکردن. لە نێوان ساڵانی (1981–1993)دا دەبێتە بەرپرسیار و بەڕێوەبەری هونەری ئەم کۆمپانیایە و خێرا ناوبانگێکی جیهانی بۆ خۆی و کۆمپانیاکە بەدەست دەهێنێ. ئەم هونەرمەندە نەفەسێکی قوڵی شانۆیی سیمای بەرهەمەکانی دەگرێتەوە و زۆرجار دەگەڕێتەوە سەر پیەسە کلاسیکیەکانی شانۆی جیهانی، لەوانە: ئۆپێرای کارمن، شانۆنامەی یەهودی ماڵتە، دکتۆر ڤاوست، ئەندرۆماك و ماڵی بێرناردا، ئەمە جگە لەوەی ئەفسانە و داستانە کۆنەکانی سوید و ولاتانی تری دنیا دەکاتە بنەمایەکی دەوڵەمەند بۆ بەسەماکردنی پرۆژەکانی. لە ساڵی (1993) وە (ماتس ئێک) بە تەواوەتی دەستی لەم کۆمپانیا گرنگەی سەما کێشاوەتەوە و ئێستا وەک هونەرمەندێکی جیهانی پرۆژە ڕەنگینەکانی بۆ گرنگترین گرۆ و کۆمپانیاکانی جیهان ئامادە دەکات. هەروەها ساڵانە پرۆژەیەکی شانۆی سەمائامێزیش بۆ شانۆی پادشایەتی لە ستۆکهۆڵم پێشکەش دەکات. لە ناوەڕاستی ساڵی (2003)وە هونەرمەند (یوهان ئینگەر) لەبری (ماتس ئێک) بۆتە بەرپرسیار و بەڕێوەبەری هونەری ئەم کۆمپانیا سەما ئامێزە.

- **تەکنیکی سەما لەم کۆمپانیایەدا**

لەماوەی زیاتی لە هەشت ساڵدا، بە بەردەوامی ئاگاداری بەرهەمە یەك لە دوای یەکەکانی ئەم کۆمپانیایە بووم. تێڕوانینێکی گشتی و زانیارییەکی باشم سەبارەت بە تەکنیك و شێوازەکانی کار و پڕۆژەکانیان کۆکردۆتەوە. هەر لەم ڕووەوە دەتوانم بڵێم کە هونەری سەما لەلای (کولباری باڵیتن) جگە لە فۆرمێکی دەوڵەمەندی دەربڕین، فەلسەفە و پەیامێکی گرنگیشی هەیە. سەما تەقەلایەکە بۆ گێڕانەوەی چیرۆکێك بە زمانی جەستە. لەم بوارەوە تەکنیك و هەستی مرۆڤایەتی لە هاوکێشەیەکی یەکگرتوودا، ڕووبەڕووبوونەوەیەکی چڕ لەگەڵ بینەراندا دروست دەکات. لەم لایەنەشەوە سەمازانەکانی ئەم کۆمپانیایە ناسراون بە دەستەبەرکردنێکی بالا تەکنیکی سەما، هەروەها ڕۆچونە خوارەوە و بەرجەستەکردنێکی قوڵی دروستکردنی کارەکتەری هونەری. ئەم کارەکتەرانەش لە نێوەندی پڕۆسە سەماییەکەدا مەودایەکی دەوڵەمەندی سایکۆلۆژی لەخۆگرتووە.

ئەم مەسەلەیەش هەردوو بوارەکەی سەما لەلای ئەم کۆمپانیایە دەگرێتەوە، یەکەم: کۆریۆگرافیا چەمکێکی پڕ لە بزۆزی گێڕانەوە لەخۆدەگرێت؛ بە تایبەتی ئەو نەمایشە سەمایانەی کە پشت بە داستان و ئەفسانە کۆنە سویدی و جیهانیەکان دەبەستێ. دووەم: ئەم سەمایانەی کە زیاتر فۆرم و شێوازە ئەپستراکەکان دەستەبالان. جولانەوەی جەستەش لە نێوان ئەم دوو بوارەدا، بەشێوەیەکی بەرچاو ڕۆڵێکی گەورە و پانتاییەکی قوڵ دەبەخشێتە سترکتوری سەماکان. زۆرجار تابلۆکان لە نێوان ئەم دوو بوارەدا لە کۆمەڵێ جولانەوەی خێرا و ئێستاتیکیدا کۆدەبێتەوە. خودی بەسەرهاتەکەش دەبێتە پاڵپشتێکی گرنگ بۆ سەمازانەکان، تا وەك هێزێکی ناوەکی زەمینە فیکرییەکە بخوڵقێنێ. جولانەوە ئەبستراکیەکانیش

لەم نێوەندەدا دەبێتە فۆرمێکی ئێستاتیکی و تەواوکەری دیدی کۆریۆگراڤیاکە. ئەمە جگە لەوەی ئەو فۆرمە ئێستاتیکیە توانای دروستکردنی حاڵەتێکی پڕ لە هەست و سۆزی هەیە کە پاڵ بە سەمازانەکانەوە دەنێت بەردەوام لەو چرکەساتانەدا ببنە ئەفرێنەری جوڵانەوەکان و بونیاتنانی ئەو جوڵانەوانەش لەیەکەی سەماکەدا.

- **یوهان ئینگەر**

یوهان ئینگەر لە ناوەڕاستی ساڵی (2003)وە بە تەواوەتی بۆتە بەرپرسیاری هونەری ئەم کۆمپانیایەو یەکێك لە ئامانجەکانیشی نوێکردنەوە و بەرەوپێشەوە بردنێکی جیاوازی ئەم کۆمپانیایەیە لەسەر ئاستی سوید و جیهان. ئەم هونەرمەندە لە ساڵی (1966)ەوە سەمازانێکی ئەم کۆمپانیایەیە و ناوێکی دیاریشە لە بواری سەمای هاوچەرخ و هونەری سەما و بالیەدا. سەرەتای هەوڵەکانیشی لە خودی سەماوە دەست پێدەکات.

یوهان ئینگەر لە سوید و لە بەشێك لە وڵاتە ئەوروپیەکاندا، وەك سەمازانێکی بە توانا ئاماژەی بۆ دەکرێت و خاوەنی ڕابردوویەکی دێرین و جۆراوجۆری سەمایە. بۆ نمونە یوهان ئینگەر ماوەیەکی درێژ لە ژێر دەستی هونەرمەندێکی تری بەسەلیقەی وەك (یری شیلیەن) دا لە گرۆی سەمای شانۆیی هۆڵەندی لە (هاگ) کاریکردووە. ئەمەش زەمینەیەکی تری جۆراوجۆری و گۆڕینەوەی بیروڕاو کاریگەری کلتوری جیاوازی بۆ خوڵقاندووە.

ئەم هونەرمەندە لەم چەند ساڵەی دوایدا بە تەواوەتی لە سەما دورکەوتۆتەوە و لەبری ئەوە، بەهەمان وزە و توناناوە خەریکی کاری کۆریۆگراڤی و خوڵقاندنی پڕۆژەی سەمایە. پڕۆژەکانی یوهان ئینگەر نەفەسێکی شانۆیی و هەستێکی قوڵی سایکۆلۆژی و تەکنیکێکی نوێی سەما لەخۆدەگرێت. یەکێك لە سیما گرنگەکانی پڕۆژە سەمائامێزەکانی ئەم هونەرمەندە ئەوەیە کە توانیویەتی کۆریۆگراڤیایەکی خێرا و ئاسان بکاتە سترکتوری جوڵانەوە و هەڵوێستە دراماتۆرگییەکانی سەماکە. هەر لەم دەروازەیەشەوە دەکرێت ئاماژەی یەکێك لە میتۆدە گرنگەکانی یوهان ئینگەر لەگەڵ سەمازانەکانی بدەین. ئەم هونەرمەندە ڕاستەوخۆ یارمەتی سەمازانەکانی ئەدات بۆ زیاتر لەیەکتر نزیکبوونەوە، سنگفراوانی و هاندانێکی بەردەوام. لەم پرۆسەیەدا خوڵقاندن و بەرهەمهێنانی جوڵانەوەیەکی بەردەوام و دروستکردنی زەمینەیەکی لەبار بۆ ڕاگوزاری سەمایەکی زیاتر جەستە ئامێز. هەروەها شانەکانی هونەری کۆریۆگراڤی لەلای (یوهان ئینگەر) هەست و سۆزێکی بەهێزە. ئەم هەست و سۆزەش لە کۆمەڵێ جوڵانەوەی شەپۆل ئاسای چڕی ئەبستراکدا بەرجەستە دەبێت و فۆرمی جیاواز لەخۆ دەگرێت.

- **شڵپە و پڕۆسەیەکی نوێی سەما**

(پنیۆمە) و (لە ئێستەدا) دوو پارچە سەمای نوێی هونەرمەند یوهان ئینگەرە و هەردوو پارچەکەش لەژێر ناوی (شڵپە)دا کۆدەبێتەوە. ئەم بەرهەمانەش لە سەرەتادا و ساڵی پار (یوهان ئینگەر) بۆ گرۆی شانۆی سەمائامێزی هۆڵەندی *Nederlands Dans Theater* بەرهەمیهێناوە. نمایشەکە لە هۆڵەند پێشوازییەکی گەورەی لێدەکرێت. ئێستە دوای ساڵێك تێپەڕبوون بەسەر ئەو پڕۆژەیەدا، یوهان ئینگەر سەرلەنوێ هەمان نمایش بۆ کۆمپانیای کولباری بالێتن و لەگەڵ کۆمەڵێ سەمازانی تردا بەرهەمدەهێنێتەوە. پڕۆژەکە دووهەم تەقەلای ئەم هونەرمەندەیە لەگەڵ

کۆمپانیای کولباری و هەنگاوێکی نوێشە بۆ نوێکردنەوەو بەرەو پێشەوەچوونی پرۆسەی هونەری سەما لە سوید.

• پنیۆمە

ڕۆح چەمکێکی نادیارە و زاراوەیەکی هەمیشە ئامادەی بوون و ژیانیشە. ڕۆح ئەمجارە دەبێتە حاڵەتێکی بینراو و لە جوڵانەوەیەکی بەردەوامدا گەمەی بوون و نەبوون دەکات. "پنیۆمە" دوا بەرهەمی (یوهان ئینگەر)ە و وشەکەش (*Pneuma*) وشەیەکی کۆنی گریکیە و مانای "ڕۆح" دەگەیەنێ. سەمای پنیۆمە نزیکبوونەوەیە لە ڕۆچوونە خوارەوەیەکی چەمکەکانی ڕۆح و حاڵەتە تەنهاییەکانی مرۆڤدا. بەنێو خودی تەنهایی و کاردانەوەکانماندا. لەم هاوکێشەیەدا مەرگیش مەسەلەیەکی سەرەکی و ئامادە و گرنگە. سەماکە لە دەوری تەوەرەکانی مەرگ و مەرجەکانی ژیاندا دەسوڕێتەوە و دوو پیاو و چوار ئافرەت سەمای ئەو ڕۆحە دەکەن. سەماکە باسی یاد و پەژارەی کۆچی کەسێکی نزیك دەکات. هەروەها چەمکەکانی (کات) لە دەروازەی مەرگ و گۆڕانکاریەکان و کاریگەریان بەسەر کەسی دووەم و دەوروبەرەکەوە. ئەم مەسەلەیەش خاڵێکی گرنگی دیدی خوڵقاندنی ئەم کۆریۆگرافیاییە و بۆتە ناوەندێکی گرنگی ئەفراندن و بەرەوپێشەوەچوونی سترکتوری سەماکە.

لە پنیۆمەدا جوڵانەوەکانی جەستە جیهانێکی بێسنور دروست دەکات و هەندێ جار پانتاییەکانی سەماکەش تەسك دەکاتەوە. گەمە لەگەڵ ڕەنگەکان دەکات و سێبەر و تاریکی فڕێدەداتە نێوەندەکانی تیشك و ڕووناکیەوە. سەمازانەکان گەمە لەگەڵ کۆدەکانی ژیان و مەرگدا دەکەن.

پیاو و ژنێك وەك دوو لێبوك لە دەستێك جلوبەرگی ڕەش و سپیدا دەجوڵێنەوە. ئەم دوو سەمازانە، لە دیدێکی سوریالیزمەوە دەبنە سمبولێکی حاڵەتەکانی ڕابردوو، لە هەمانکاتدا دەبنە خاوەنی میراتیەکی بەجێماو. بە بنمیچەکەشەوە چرایەکی شێوە ئەندازەیی هەڵواسراوە. چراکە لەو فۆرمەدا دەبێتە ئامرازێکی گرنگی دەربڕینی ڕۆحێکی فڕیو، سێبەرێکی بەرجەستەکراوی هەمیشە زیندوو.

پیاو و ژنە لێبوك ئاساکە لە پانتاییەکی فراوانی شانۆکەدا دەجوڵێنەوە. لەولاشەوە و لە پانتاییەکی تەسك و دیاریکراودا کۆمەڵێ سەمازانی ژن و پیاو و لە جلوبەرگێکی لێکچوی ڕەنگ پرتەقاڵیدا، وەك هوروژمێکی بەهێزی ئاو لە پێکداچوونێکی چڕ و خێرادان.

نمایشەکە تەقەلایەکی ڕاستەوخۆی وروژاندنی بیرەوەرییەکانە، سمبولی ئێستە و ئایندە خانەیەکی گرنگی جوڵەکانی جەستە و هەستی دەربڕینی دەموچاوە. تەختەی شانۆکە دابەشکراوە بەسەر دوو بوار و دوو ڕووبەر و دوو دنیای جیاوازدا: ڕووبەرێکی فراوان، پانتاییەکی تەسك و دیاریکراو. کۆمەڵێ خەڵکی زۆر لە پانتاییە تەسکەکەو، تەنها دوو کەس لە پانتاییە فراوانەکەدا بەرجەستەی ئەو دوو گەردوونە دەکەن. ئەم دوو جیهانەش حاڵەتێکی ڕەها و بارێکی وەستاو و جێگیری ئەو گەردوونە پێکداچووە نییە. بەڵکو لە چاوتروکاندنێکی ئەفسونیدا گۆڕانکارییەکی خێرا ئەو دوو گەردوونە پێکەوە دەبەستێتەوە. مەرزەکانی سەما، هێڵە وەهمیەکانی جەستە و هەنگاوەکانی ناوەوە و دەرەوەی مرۆڤ دەبەزێنێ و هەردوو پانتاییەکەش (تەسك/ فراوان) دەبێتە یەکەیەکی فراوان و یەکگرتوو. هەر لە

چاوتروکاندنێکی تری ئەفسونیدا، ئەو پانتاییە فراوانە سەرلەنوێ دابەش دەبێتەوە. ئەمجارەیان هەموو شتەکان پێچەوانە دەبنەوە، دوو سەمازانەکە (پیاو/ ژن) دەکەونە خانە تەسکەکەوە، گرۆ سەمازانەکانی تریش فڕێدەدرێنە خانە فراوانەکەی گەردوون و ژیانەوە.

گەمەی مەرگ و ژیان دەبێتە کۆمەڵێ جوڵانەوەی جەستە و سەمایەکی دەربڕ لە ژیان بە هەموو ماناکانیەوە، مەرگیش بە هەموو پەژارە و مەترسیەکانیەوە. ژیان وەك رووبەرێکی ئاشکرا و مەرگیش وەك کیشوەرێکی نادیار و نەدۆزراوە. گرنگی سەماکەش لەوەدایە فەلسەفەیەکی ئاشکرا و چیرۆکێکی سایکۆلۆژی و کۆمەڵێ کارەکتەری ئەو چیرۆکە سەقامگیری جوڵانەوەکانی جەستە و ریتمی هەناسە و مۆسیقایەکی ئەبەدی دەبێت.

- **له ئێستەدا**

ڕەنگەکان لە ئێستەدا، هەروەها لە ڕابردوو و ئایندەدا بەهاکانی بیرەوەرییەکانمان زیندوو دەکاتەوە. لە"ئێستە"دا تابلۆی دووەمی سەمای شڵپە، سەمای ڕەنگەکانە: ڕەنگی ڕەش، ڕەساسی و سپی دەبێتە سمبولەکانی دوێنێ و ئەمڕۆ و دنیابینی ئایندە. لەو پانتاییە ڕەشەدا کۆمەڵێ دیواری ڕەساسی شێوە قۆقزی، وەك ئەوەی خۆیان دانەواندبێت، بەشێوازی جیاواز سنور و دیوارێکی بەرز لە نێوان سەمازانەکاندا دروست دەکات. دیوارەکانیش هەریەکە بە جیا دەرگایەکی ڕەشی باریکی لە ناوەڕاستدا پێوەیە. دەرگاکان بەشێوەیەکی کتوپڕی و لە کاتی پێویستدا دەکرێنەوە. بەو شێوەیەش کۆمەڵێ ژووری جیاواز لە نێو ژوورە گەورەکەدا دروست دەبێت. سەمازانەکان لە نێوان ئەو ژوورانەدا، پانتاییە ڕەشەکە و دەرگاکاندا گەمە دەکەن. هەندێ جار یەکێك لە دەرگاکان بە تەنها و لە بەشی پێشەوەی لای شانۆکەوە دەکرێتەوە. تیشکێکی بەهێزی سپی دێتە دەرەوە و یەکێك لە سەمازانەکانیش پەلکێشی ئەو پانتاییە سپیە ڕەها و نادیارە دەکرێت. مەرگە و ژیان، ئامادەبوون و نائامادەیی، بەختیاری و پەژارە، لە دەروازەکانی ئەو دەرگایانەوە، لە بوارەکانی ئەو دیوارە چەماوانەوە، بەردەوام جێگاکانیان دەگۆڕن. لەم دووریانەدا سەمازانەکان وێنەیەکی پڕ لە ژان و ئازاری ژیان دەچنن. جوڵانەوە بازینیە خێرا و بەردەوامەکانیان ریتواڵێکی هەمیشەیی بۆ سەماکە، تابلۆکان و سەمازانەکان دەخوڵقێنن. لەم ریتواڵەدا دۆزەخێکی گرگرتوو دەبێتە هێز و وزەیەکی گەورە و سەمازان و بینەرانیش پێکەوە کۆدەکاتەوە. بەشێوەیەکی گشتی هەموو دەربڕینەکانی زمانی جوڵە و جەستەی سەمازانەکان دەبێتە سمبولێکی زیندووی یادوەرییەکانمان، نامۆبوونمان و غەریبیکردنی کەسانێکی نزیك لێمانەوە. لەم پانتاییە ڕەشەدا جوڵانەوەی قۆڵ و باڵی سەمازانەکان، لە کۆمەڵێ هەڵوێستەی دووبارەبووەوەدا، باوەش کردنێکی پڕ لە سۆزە بە ئەبەدییەتدا، یان دەربڕینی رۆحێکی بێئارامە لە بارێکی هەڵچوی پڕ لە بزواندندا. ڕۆحێك گەرەکیەتی بفڕێت و هێزێکی ئەبەدی وەك بەردەکەی سیزیف لەگەڵ هەموو تەقەلایەکی فڕیندا، بەرەو زەوی دەکشێتەوە.

سێبەرێك دەبێتە فۆرمێکی بەرجەستەکراوی ئەو رۆحە بێئارامە و هەمیشە ئەوە دێنێتەوە یادمان: لە کاتێکدا کە دەمانەوێت بفڕین، دەگەڕێن بە دوای سەربەستی جیهانێکدا کە تەنها لە ناوەوەی خۆماندا بوونی هەیە. سەربەستیەکی ڕەها کە تەنها لە رۆحێکی بریندااردا لە جوڵانەوەیەکی

بێئارامدایە. سەماکە لەم دەروازە قوڵەی ژیانەوە گەڕانێکی سۆفیزمە لە پانتاییەکی زۆر ئەبستراکدا. لەم پانتاییە ئەبستراکەشدا جیهانێکی سوریالیزم دەبێتە هاوکێشەی حاڵەتە سۆڤیەکانی سەماکە و سەمازانەکان.

لە نێوان دیوارە بەرز و دەرگا بچوکەکاندا ڕووبەڕووی حاڵەتێکی پڕ لە تێڕامان، گێژاو، تورەبوون، گەڕان بە دووی خود و ونبوونێکی تەواوەتیدا دەبینەوە. دیدی کۆریۆگرافیاکەش هەڵکۆڵینێکی بەردەوامە بە نێو خانەکانی ڕۆحدا، بەنێو ئازارەکانی دابڕان و ویژدانێکی بریندار‌دا. لە هەمانکاتدا تەقەلایەکیشە بۆ زاڵ بوون بەسەر بازنە بۆشەکانی ژیاندا. بازنە پڕ لە ژان و ئازارەکاندا. لەم گێژاوەشدا سترکتوری سەماکە بەربڵاوە و هەموو ئەگەرەکانی وەستان و بەقاڵب بوون هەڵدەوەشێتەوە. بەربڵاوی و فراوانی پانتایی سەماکە و بەرزبوونەوەی دیوارەکانیش ئاماژەیەکی ئەو جیهانە بێسنورەیە کە هەموو بەهاو مۆرکەکانی کات و شوێن نامێنێ.

# دەروازەیەک بۆ کۆمەڵگەی مەدەنی

-بەڕێوەبەری نووسین-

ماوەیەکە چەمکی کۆمەڵگەی مەدەنی، وەك هەموو چەمکە هاوردەکانی دیکە، بەشێوەیەکی بەرفراوان و بێ وردبوونەوەو هەڵوەستەکردن بەکاردەبرێ. لێرەدا دەشێت بپرسین: ئایا ئەو بەکارهێنانە فراوانەی چەمکەکە لەلایەن خەڵکانی خاوەن ئاقاری سیاسی و کۆمەڵایەتیەوە، هەر لەمسەری ڕاست و کۆنپارێزەوە بیگرە تا دەگاتە ئەوپەڕی چەپی سەرچڵ، نیشانەی بوونێکی واقیعیە یاخود خواستێکی کۆمەڵایەتی؟ بەواتایەکی دیکە، ئایا بەکارهێنانی چەمکەکە بەو جۆرە نیشانەی ئەوەیە لەواقیعدا بەشێوەی ڕێکخراوگەلی جۆربەجۆری کارا هاتۆتەئاراوەو کاریگەری لەسەر کۆمەڵگەی سیاسی (فەرمانڕەوایی) هەیە، یاخود بانگەوازە بۆ هێنانەدیی خواستێك، ئەویش جێگیرکردنی کۆمەڵگەی مەدەنییە لەلای خۆمان؟ بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە، سەرەتا دەبێت وەڵامی چەند پرسیارێکی دیکە بدەینەوە، لەوانە: کۆمەڵگەی مەدەنی چییە؟ چۆن سەریهەڵداوەو لەچ ژینگەیەکدا هاتۆتە ئاراوە؟ چۆن گەشەیکردوەو بەدرێژایی مێژوو چ گۆڕانکارییەکی بەسەردا هاتوە؟ گوێزانەوەکەی لە شوێنی لەدایکبوونیەوە (خۆرئاوا) بۆ لای خۆمان کۆپییئاسابوە یاخود داهێنەرانە؟ هاوکات دەبێت بڕوانینە ئەو ڕێکخراو و گروپانەی لەسەر کۆمەڵگەی مەدەنی حسێبکراون تاکو حەقیقەتی ئەوە دەرکەوێت داخۆ ئەوانە بەشێکن لە کۆمەڵگەی سیاسی یاخود بەڕاستی کۆمەڵگەی مەدەنین؟ ئەم تەوەرە تایبەتە بە کۆمەڵگەی مەدەنی ئامانجی ئەوە بوو وەڵامی ئەو پرسیارانەو دەیانی دیکەش بداتەوە، بەڵام بەداخەوە بەهۆی بەشداریکردنی بەرتەسکی وەرگێڕەکانەوە نەکرا ئەو نیشانە بپێکین. بەهەرحاڵ وەك دەروازەیەك بۆ تەوەرەکە پێمان باشە چەند هێمایەکی خێرا بخەینەڕوو:

کۆمەڵگەی مەدەنی چەند بنەمایەکی سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، کولتووری و یاساییە کە لەناویاندا تۆڕێکی ئاڵۆزی پەیوەندی و پراکتیك لەنێوان هێزو پێکهاتە کۆمەڵایەتیەکانی کۆمەڵگەدا ڕێکدەخرێ، ئەمەش بەشێوەیەکی چالاکانەی بەردەوام و لەڕێگەی چەند دامەزراوێکی خۆبەخشەوە کە سەربەخۆ لە دەستێوەردانی کۆمەڵگەی سیاسی لەدایکدەبێ و کاردەکات.

بەو جۆرە كۆمەڵگەی مەدەنی كارێكی بەڕێوەبەریی ئازادە، واتە بەری ویستی ئازادانەی تاكەكانیەتی، نەك بەری پەیوەندیی لەدایكبوون‌و میراتی ناو خێزانەكان یان بەری سەپاندنی ناسنامەو سەروەری‌و یاساكان كە دەوڵەتێك دەیانسەپێنێ بەسەر ئەوانەی لە سنووری جوگرافی ئەودا دەژین. هەروەها كۆمەڵگەی مەدەنی ڕێكخراوگەلی بەكۆمەڵە كە تاكەكان بەویستی خۆیان دەبنە ئەندام تیایانداو سەربەخۆیانە كارەكانی خۆیان ئەنجامدەدەن.

كۆمەڵگەی مەدەنی بەری پڕۆسێسێكی كۆمەڵایەتی دورودرێژەو بە گوێزانەوەی چەمكەكەو باسكردنی زۆرو بانگەشەكردن نایەتە ئاراوە، بەڵكو پێداویستی بابەتی‌و خۆیی گەرەكەو بێ ئامادەبوونی كۆمەڵگەو هاتنەئارای بكەرە كۆمەڵایەتیەكان، كە ڕۆڵیان لە بنیاتنانیدا هەیە، مەحاڵە سروشتی لەدایكبێت.

دەبێت هێما بۆ ئەوە بكەین كە كۆمەڵگەی مەدەنی تەنیا كۆمەڵێك قاوغ‌و پەیكەر نییە، بەڵكو بەر لەهەرشتێك بەهایە. زۆرینەی "دامەزراوە مەدەنیەكان"ی لای خۆمان زیاتر سێبەری حیزب‌و سیاسەتەكانی حیزبن‌و بوونەتە قاوغ نەك دامەزراو. بۆیە بۆ هاتنەئارای كۆمەڵگەیەكی مەدەنی دروست پێویستە جەغت لەسەر بەها شارستانیەكان بكرێتەوە نەك قاوغ‌و پەیكەری ڕێكخراوەیی.

كۆمەڵگەی مەدەنی یەكسان نییە بە ئۆپۆزسیۆن، چونكە ئۆپۆزسیۆنی سیاسی ئامانجی بەدەستهێنانی دەسەڵاتی سیاسی هەیە، كەچی كۆمەڵگەی مەدەنی ئەو مەبەستەی نییە، بەڵكو مەبەستی بەشداریكردنی سیاسی، كولتووری‌و ئابووریی سەربەخۆیانە، چونكە ئەو بەشداریكردنە دەرفەتی چاودێریكردنی گشت بنەما كۆمەڵایەتیەكان بەدەوڵەتیشەوە دەڕەخسێنێ‌و زەمینەی جڵەوكردن‌و ڕاستكردنەوەی ڕێڕەوەكەی دەڕەخسێنێ. لێرەشدا مەرج نییە پەیوەندی نێوان كۆمەڵگەی مەدەنی‌و دەوڵەت دوژمنكارانە بێت، بەڵكو دەشێت شێوازی سازان‌و تەباییش بەخۆوە بگرێت. گرنگترین شتێك لەم پەیوەندییەدا ئەوەیە كە كۆمەڵگەی شارستانی سەربەخۆیی خۆی لەدەست نەدات. هەروەها كۆمەڵگەی مەدەنی یەكسان نییە بە بزووتنەوەی كۆمەڵایەتی، چونكە لەو بزووتنەوەیە فراوانترە" ئەگەر ئامانجی بزووتنەوەی كۆمەڵایەتی پیشەیی ڕووت بێت، ئەوا ئامانجی كۆمەڵگەی مەدەنی تەنیا پیشەیی ڕووت نییە، بەڵكو ئامانجی كۆمەڵگەیی فراوانە.

ناوەڕۆكی كێشەی كۆمەڵگەی مەدەنی لە كوردستان بەربڵاویی دەسەڵاتی كۆمەڵگەی سیاسییە لە هەموو بوارەكانی ژیانی كۆمەڵگەدا. ئەمەش وایكردوە ئەو دەسەڵاتە ئامڕازی چاودێریكردنی بەردەوام‌و ئاستەنگ بێت لەبەردەم ئازادبوونی تاكەكان‌و سەربەخۆیی ڕێكخراوە كۆمەڵایەتیەكان. بەو جۆرە ڕێكخراوە كۆمەڵایەتیەكانی لای ئێمە لەبری ئەوەی ببنە ناوكێك بۆ كۆمەڵگەیەكی مەدەنی دروست، بوونەتە داردەستی كۆمەڵگەی سیاسی بۆ جڵەوكردنی خەڵك‌و دەستەمۆكردنیان. بۆیە یەكەمین هەنگاوی بنیاتنانی كۆمەڵگەی مەدەنی قوتاربوونە لە بازنەی كۆمەڵگەی سیاسی‌و بەدەستهێنانی ئازادیی هەڵبژاردن‌و بڕیاردان‌و سەربەخۆیی كاركردنە.

# کۆمەڵگەی مەدەنی

فرید باسیل ئەلشانی

لە عەرەبییەوە: ڕەووف بێگەرد

**سەرەتا:**

چەمکی کۆمەڵگەی مەدەنی *civil society* مێژوویەکی درێژی هەیە، ئەم چەمکە لە خۆراوادا لەسەر دەستی فەیلەسووفی گەورە ئەرستۆتالیس خەملی، کە بە چەمکە (ناتەواوەکەی) بانگەوازی دروست کردنی کۆمەڵگەیەکی سیاسی (پارلەمان) کرد کە ئازادی ڕادەربڕین تیایدا بالادەست بێت و ئەو یاسایانەی دادوەریی و یەکسانی دەستەبەردەکەن بهێنرێنە دی، بەلام بەشداریکردن لەو کۆمەڵگە سیاسیەدا تەنیا لەسەر کۆمەڵێك لە دەستەبژێرەکان قۆرخە و نە ژن و نە کرێکار و نە غەریبە مافی بەشداری کردن و هاونیشتمانیەتیان تیا نیە.

هەر بە هەمان بیرۆکەوە کە پێویستە کۆمەڵگەیەکی سیاسی وا بێتەدی جون لوك *John Lock* (سەدەی هەڤدە)یش، بە دۆزینەوەی ئەو توانا شاراوەیەی مرۆڤ کە دەتوانێت بەرگری لە خۆی، لە ئازادیەکەی و ماڵ و سامانی بکات بەشداری کرد و دەیشتوانێت ئەوی دی لەناوبەرێت. بۆیە لوك پێشنیازی دروست کردنی کۆمەڵگەیەکی سیاسی کرد کە دەسەلاتی جێبەجێکردنی هەبێت و دەست بەکاربێت لە چارەسەرکردن و ڕێکخستنی ئەو کێشە و ئاڵۆزیانەی کە دەشێت سەرهەڵبدەن و سەقامگیرکردنی حاڵەتە ناجۆرەکان، لوك بەم هەوڵەی ویستی سیغەی موڵکایەتی بگۆڕێتە سەر سیغەیەکی دیموکراتی زیاتر کە کۆمەڵگە سیاسیەکە یاسا و شەریعەتەکانی تیا دەستەبەر بکرێت.

چەمکی کۆمەڵگەی مەدەنی هەروامایەوە تا لە سەدەی نۆزدەدا پیری فەیلەسوفان هیگل *Hegel* هات.

هیگل کۆمەڵگای مەدەنی خستە نێوان دەزگاکانی دەوڵەتی (خاوەن دەسەلات) و کۆمەڵگەی بازرگانی – ئابووری (کە بناغەکەی لەسەر قازانجە) ئەمەیش لە پێناو بەرزڕاگرتنی توانای کۆمەڵگە لە باری سیستماتیکی و هاوسەنگیەوە.

چەند و چوونی هیگل لەسەر کۆمەڵگەی مەدەنی بەرئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی خۆی بوو لەسەر بیری ئادم سمیس *Adam smith* و تیورەکەی "لێگەڕێ کار بکات، لێگەڕێ تێپەڕێ *Laisser – Faire, et Laisser passer*" کە بنەمای بیری ئابووریە لای سروشتیەکان یان فیزیوکراتیەکان، ئەوانەی پێیان وایە خۆش گوزەرانیی دەوڵەت لە ئازادکردنی بازرگانیدایە، هەروەها لە ئازادکردنی تاکەکاندا تا بە پێی توانایان ئامانجە خۆپەرستیە تایبەتیەکانیان بەدی بێنن.

هەر لەسەر هەمان ڕێبازی هیگل بیرمەندی سوسیالستی ئەنتونیو گرامشی *Antonio Gramsci* (1891–1937) پەرەی بەو چەمکە دا، بەوەی کە رووناکبیری ئۆرگانێکی خزاندە ناو پرۆسەی بەرهەم هێنانی ڕاو بەرزکردنەوەی ئاستی کلتوریەوە، گرامشی جەختی لەسەر ئەوە کرد کە دەبێت بۆ بەدیهاتنی ئامانجی کۆمەڵایەتی، ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی پیشەی سەندیکایی و فرە لایەنی حیزبی دروست بێت، تا سەرخانێکی لەگەڵ ژێرخان گونجاودا بێتە دی و ئەمەندەیش کۆك و تەبابن کە بەردەوامبوونیان نکووڵی هەڵنەگرێت.

هەموو ئەمانە بێ فراوان کردنی دیموکراتیەت سەرناکەون و ئەنجام بەدەست ناهێنن، چونکە دیموکراتیەت و کۆمەڵگەی مەدەنی دوو ڕووی یەك پرۆسەی کۆمەڵایەتین. بیرمەندی ئیتالی روبرت پوتنام *Robert Putnam* دەڵێت: "چەندە دەزگاکانی کۆمەڵگەی مەدەنی ڕۆڵی خۆی بگێڕێ دیموکراتیەت بەهێز و چالاکتر دەبێت" پێچەوانەکەیشی ڕاستە.

گرامشی لە یەکێك لە دەقە گرنگەکانی دەفتەری زیندانیەکەیدا دەڵێت: "ئەوەی تا ئەم چرکە ساتە دەتوانین بیکەین، ڕۆنانی دوو بنەمای سەرەکیە، یەکەمیان کۆمەڵگەی سیاسی یان دەوڵەتە، دووەمیان دەشێ ناوزەد بکرێت بە کۆمەڵگەی مەدەنی کە بریتی بێت لە کۆمەڵێك ڕێکخراو"

لای گرامشی کۆمەڵگەی مەدەنی بریتیە لە پەیوەندی نێوان کلتور – ئایدیۆلۆژی، هەروەها چالاکی ڕۆحی – عەقڵی. ئەگەر مارکس ڕاستی کردبێت کە "کۆمەڵگەی مەدەنی سەنتەر و شانۆی مێژوە" کەواتە کۆمەڵگەی مەدەنی چرکەساتی پۆزەتیڤ و کاریگەرە لە بەرەوپێشەوەبردنی مێژودا، نەك دەوڵەت وەك هیگڵ باسی دەکات. بەڵام چرکەساتی پۆزەتیف و کاریگەر لای مارکس واتا کۆمەڵگەیەکی مەدەنی کە نوێنەری ژێرخان بێت، وەلێ لای گرامشی چرکەساتی سەرخانە. گرامشی دوای ئەوەی ماوەیەکی زۆر سەرقاڵی مەسەلەی روناکبیری و قووڵبوونەوە بوو لە چەمکی روناکبیراندا، توانی جیاوازیەکی ناوازە بکات لە نێوان رووناکبیری تەقلیدی و رووناکبیری ئۆرگانیدا و دەوری دوەمیان لە پرۆسەی هەژموونداا (الهیمنة)، لەو دەقەی لە "رابوردوو ئێستا" وەرگیراوە، گرامشی وەك تێگەیشتنی هیگڵ لە کۆمەڵگەی مەدەنی دەدوێت. زوویش ئەوە روون دەکاتەوە کە مەبەستی لەوە "هەژموونی کلتوری و سیاسیە" کاتێك چینی کۆمەڵایەتی هەژموونی خۆی بەسەر گشت کۆمەڵگەدا دەسەپێنێت وەك لەخۆگرتنێکی ئاکاریی بۆ دەوڵەت، گرامشی لەم ڕوانگەیەوە کۆمەڵگەی مەدەنی بە فەزایەك دادەنێت بۆ ململانێی ئایدیۆلۆژی. ئەگەر کۆمەڵگەی سیاسی جێگای دەستەڵات پەیداکردن بێت بە هۆی دەوڵەتەوە، کۆمەڵگەی مەدەنییش فەزایەکە بۆ هەژموونی رووناکبیریی ئایدیۆلۆژی. ئەرکی هەژموونیش *Hegomony* ئەرکێکی ئاراستەییە بۆ دەسەڵاتی ڕەمزی کە بەهۆی ڕێکخراوە تایبەتیەکانی وەك

نەقابە و قوتابخانە و پەرستگا و بنکە رووناکبیرە جیاوازەکانەوە پیادە دەکرێت.

لای گرامشی کۆمەڵگەی مەدەنی بریتیە لە کۆی سەرخانەکانی وەك نەقابە، حیزبەکان، ڕۆژنامە، قوتابخانە، ئەدەب و رێکخراوە ئازادەکانی تر، بیرمەندی هاوچەرخی ئەڵمانی هابرماس دەڵێت: لای گرامشی ئەرکی کۆمەڵگەی مەدەنی واتا ڕای گشتییەکی نارەسمی (ئەوەی سەر بە دەسەڵاتی دەوڵەت نیە) بەم پێیە گرامشی کاریگەریی مارکسی لەسەرە کە باس لە ڕای گشتی دەکات و دەڵێت: "سستمی پارلەمانی لەسەر بنەمای گفتوگۆ دامەزراوە، ئەی چۆن دەبێت قەدەغەی گفتوگۆ بکرێت؟ هەموو بەرژەوەندیەك، هەموو دەزگایەکی کۆمەڵایەتی بەپێی ڕەوتی سەردەم دەبێت بە بیروباوەڕ، دەبێت هەر بەو سیفەتە چارەسەری بکرێت، کەواتە چۆن دەبێت لەبەرخاتری بەرژەوەندیەك، یان دەزگایەك خۆی لە سەروو بیروباوەڕەوە دابنێت، خۆیشی وەك عەقیدەیەك بسەپێنێت کە قابیلی چەندوچوون نەبێت.

## پێناسەی کۆمەڵگەی مەدەنی

کۆمەڵگەی مەدەنی وا پێناسە دەکرێت کە بریتییە لە کۆی دەزگای سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و روناکبیری کە لە بواری جیاوازی خۆیاندا کاردەکەن و سەربەخۆییەکی رێژەییان لە دەسەڵاتی دەوڵەت و قازانجی کۆمپانیاکانی کەرتی تایبەتی هەیە. واتا کۆمەڵگەی مەدەنی بریتییە لە دەزگای مەدەنی کە دەسەڵات پیادە ناکات و ئامانجی قازانجی ئابووری نیە. چونکە لە دەرەوەی دەزگا سیاسیەکانەوە بڕیارەکان دادەڕێژرێ و ئامانجی نەقابیان هەیە، وەك بەرگری لە بەرژەوەندیە ئابووریەکانی و بەرزکردنەوەی ئاستی پیشەو تەعبیر لە بەرژەوەندی ئەندامەکانی. لەوانە مەبەستی رووناکبیری وەك یەکیەتی ئەدیبان و روناکبیران و کۆمەڵەی رووناکبیری یانە کۆمەڵایەتیەکان کە ئامانجیان بڵاوکردنەوەی هوشیاریە بەپێی ئەو دەستنیشانکردنەی لە بەرنامەی کۆمەڵەکەدا هەیە.

کەواتە کۆمەڵگەی مەدەنی بریتییە لە کۆی ئەو ڕێکخراوە خۆبەخشە ئازادانەی بواری گشتی لە نێوان خێزان و دەوڵەتدا فەراهەم دێنن بۆ بەدی هێنانی بەرژەوەندی تاکەکانی، لەم کارەیدا ڕێز لە بەها و پێوانەکان دەگرێ و بە جیاوازیەکان قایلە و گیانی هەڵکردن (تسامح) و بەڕێوەچوونێکی تەندروست پیادە دەکات. بەرئەنجامەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی بریتییە لە: بڕوابوون و هەڵکردن، دیالۆگی ئاشتیانە، رووناکبیریی، نەرمونیانی، بەهەند وەرگرتنی ئەم بەهایانە و پەیڕەوی کردن لەو ڕەفتارانەی لەگەڵیا دەگونجێن دەستەبەریەکی ترە بۆ سەرمایەی کۆمەڵایەتی *Soacil capital*، ئەمەیش وەك ئەنجام چالاکیەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی دەستەبەر دەکات. چونکە ئەم بەهایانە تەعبیر لە جەوهەری دیموکراتیەت دەکەن، هەرگیز کۆمەڵگەی مەدەنی دروست نابێت ئەگەر بەپێی بەرنامەیەکی ئاشتیانەو یاسایەکی بڕیار لەسەردراو لەلایەن هەموو لایەنەکانەوە جیاوازی و ململانێ و کێشەکان چارەسەر نەکرێن. کۆمەڵگەی مەدەنی بێ داننان بە مافە سەرەکیەکانی مرۆڤدا، بە تایبەت مافی ئازادی بیر و ئازادی ڕادەربڕین و کۆبوونەوە و رێکخستن و ڕێزگرتنی ئەو بەهایانەی ئاماژەمان پێدان و هەوڵدان بۆ پێشخستنی ئەزموونی دیموکراتی و بەردەوام بوونی، چ مانایەك ناگەیەنێت. چونکە ساختمانی کۆمەڵگەی مەدەنی کاری سەرومڕ و کاتی درێژی دەوێت بۆ

دامەزراندنی ئەو دەزگا هەرە پێویستانەی بەردی بناغەی ئەزموونی دیموکراتین.

## ئەو رەگەزانەی کۆمەڵگەی مەدەنی پێك دێنن

دەشێت کۆمەڵێك پێناسە بۆ کۆمەڵگەی مەدەنی هەبێت. بەڵام پێویستە چوار رەگەزی سەرەکی لەخۆ بگرێت: رەگەزی یەکەم "خۆبەخشی"یە، یان بەجۆرێکی تر بڵێین بەشداری کردنێکی خۆبەخشانەیە کە بنەمای کاری بەڕێوەبردنێکی ئازادانە یان خۆبەخشانەیە.

بەم شێوازە بنەما و پێکهاتەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی لە پێکهاتە کۆمەڵایەتیە سەپێنراو و میراتیەکان جیادەکرێتەوە.

دووەم رەگەز ئەوەیە کە کۆمەڵگەی مەدەنی کۆمەڵگەیەکی سیستماتیکە: بەم سیفەتە لە کۆمەڵگەی تەقلیدی گشتی بە چەمکە کلاسیکیەکەی جیادەبێتەوە، چونکە ئەم رەگەزە ئاماژەیە بە بیرۆکەی "بە دەزگایی کردن" کە تا رادەیەك پوختەیەکی ژیانی شارستانیە.

رەگەزی سێیەم پەیوەندی بەو "ئامانج" و "رۆڵ"ەوە هەیە کە ئەو سیستمە هەوڵی بۆ دەدات، هەروەها ئەو گرنگییەی ئەیداتە سەربەخۆیی خۆی لە دەسەڵات و هەژموونی دەوڵەت، ئەمەیش لەو روانگەیەوە کە سستەمێکی کۆمەڵایەتیە و لە چوارچێوەی ئەو پەیوەندیانەدا کاردەکات کە هاوکاری و گونجان یان ململانێ و کێشەی کۆمەڵایەتیان تیایە. لەبەرئەوەی کە کۆمەڵگەی مەدەنی کۆمەڵگەیەکی ئاکار و رەفتارە و جیاوازی و جۆراو جۆری لە نێوان خود و ئەوانی تردا قبووڵ دەکات، لەم کۆمەڵگەیەدا ئەوانی دی مافی ئەوەیان هەیە رێکخراوی مەدەنی ساز بکەن کە پارێزگاری لە بەرژەوەندی مادی و مەعنەویان بکات، دەربەستی بەڕێوەبردنی ئاشتیانەی ناکۆکیەکان بێت لە نێوان دەزگاکانی کۆمەڵگەی مەدەنی خۆیان و دەوڵەتدا، ئەمەیش لەبەر روناکی بەهاکانی رێز و لێبوردن و هاریکاری و کێبڕکێی و ململانێیەکی ئاشتیانەدا.

دوا رەگەزی پێکهاتەی کۆمەڵگەی مەدەنی بریتیە لە چاوگێڕانێکی پێویست بە چەمکی کۆمەڵگەی مەدەنیدا لەو روانگەیەوە کە بەشێکە لە کۆمەڵێك چەمکی فراوانتر و ئەم چەمکانەی تریش دەگرێتەوە: تاك گەرایی (الفردیە)، هاونیشتمانیەتی، مافی مرۆڤ، هاوبەشی سیاسی، شەرعیەتی دەستوری و... هتد.

## کۆمەڵگەی مەدەنی و دەوڵەت

گەلێك دید و بۆچوونی جیاواز بۆ دەوڵەت هەیە، بەڵام لە بیری سیاسی نوێدا کە لە هوبزەوە درێژ دەبێتەوە تا هیگڵ سێ دیدی سەرەکی بۆ دەوڵەت هەیە:

1-دەوڵەتی سیاسی وەك رەتکەرەوەیەکی رادیکاڵی کە دەسەڵاتی سروشتی دەداتە دواوەو بە سەریدا سەردەکەوێت، بەم مانایە دەوڵەت ئەگەر بەراورد بکرێت بە قۆناغی گەشەسەندنی مرۆڤ لە پێش بوونی دەوڵەتدا (هۆبز-روسو) تازەیە.

2-دەوڵەت وەك پارێزەر و رێکخەری کۆمەڵگەی مەدەنی، بە پێی ئەم لێکدانەوەیە دەوڵەت تەنیا ئەڵتەرناتیڤی قۆناغی پێش خۆی نییە، بەڵکو پرۆسەیەکی گۆڕان و بە چالاك خستن و کامڵ کردنیەتی (لوك - کانت).

3-دوا دید دەوڵەت بەو ئیعتیبارەی کە پارێزەر و بالاڕۆی کۆمەڵگەی پێش دەوڵەتە (هیگل) ئەمە بەو مانایەی کە دەوڵەت ماوەیەکی تازەیەو تەواوکەری ماوەی پێشتر نییە، لەسەر رەت کردنەوەی رەهاییش دانەمەزراوە. لە کاتێکدا کە

دەوڵەتەکەی هوبز و ڕۆسۆ تا ڕادەیەکی زۆر لە دەوڵەتی سروشتی دوورە، بە مانای ئەو دەسەڵاتەی کۆمەڵگە ڕێك دەخات لە قۆناغی سروشتیدا، بەڵام دەوڵەتەکەی هیگڵ کۆمەڵگەی مەدەنی لە خۆ دەگرێت، بەمە لە دەوڵەتی لوکیش جیا دەبێتەوە کە ئەویش کۆمەڵگەی مەدەنی لە خۆدەگرێت نەك بۆ بالاڕۆیی (تعالی) بەڵکو و بۆ ئەوەی ڕەوایی بە بوون و ئامانجی بدات. بە بەراوردکردنی ئەو سێ ڕەگەزەو ڕەخنە لێگرتنی دەتوانین ڕەگەزە سەرەکیەکانی بیری "مارکس" لە بارەی دەوڵەتەوە لەم خاڵانەدا بەدەست بێنین:

1–دەوڵەت وەك دەزگایەکی سەرکوتکەر (توندوتیژیەکی چڕ و بە بەرنامە لە ناو کۆمەڵگەدا).

2–دەوڵەت وەك هۆکارێکی چینی دەسەڵاتدار بەپێی ئەو قسە باوەی کە دەڵێت: (دەوڵەت ئامرازێکە بۆ دەسەڵاتی چینێك بەسەر چینێکی تردا).

3–دەوڵەت وەك دیاردەیەکی لاوەکی و پلە دوو بۆ پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵگەی مەدەنیدا، بە پێی ئەم دیاردەیە، دەوڵەت دەوری لە ڕاهێنان و ڕێکخستنی کۆمەڵی مەدەنیدا نیە، بەڵکو و ئەوە کۆمەڵگەی مەدەنیە کە دەوڵەت رادێنێ و ڕێکی دەخات. هەر ئەمەیشە کە "گرامشی" ناوی لێناوە. "دەوڵەتی بەرفراوان" واتا ئەو سستمە سیاسیەی لە هەردوو لایەنی مەدەنی و سیاسی پێکدێت. کە کۆمەڵگەی مەدەنی دەشێت پاڵپشتی دەوڵەت بێت یان بەرەنگاری بوەستێت. لە حاڵەتی یەکەمدا کۆمەڵگەی مەدەنی دەبێتە سەرچاوەیەکی ڕەوا لەڕێی بەشداری کردنی ڕێکخراو و دەستە کۆمەڵایەتیە جیاوازەکانیەوە لە دروستکردنی بڕیاردا. بەڵام لە حاڵەتی دوەمدا کە دەوڵەت بە دەزگا و ڕێکخراوە سەرکوت کەرەکانی بەرەنگاری هەموو شێوە گۆڕانێك دەبێتەوە، دەوڵەت وا خۆی نمایش دەکات کە کۆمەڵگە بۆ ئەو دروست بووە نەك بە پێچەوانەوە. بۆیە مەودای گەشەسەندنی کۆمەڵگەی مەدەنی دەبەسترێتەوە بە مەودای گەشەسەندنی سیاسەت و یاساکانی دەوڵەت لە ڕووبەڕووبونەوەی کۆمەڵگەی مەدەنیدا. هەروەها چەندە سەرچاوە یاساییە مەقبووڵەکان فراوان دەبن و دێنە دەست و دەوری دەوڵەتیش لە ئاسانکاری یان بەربەستی کردنی ڕووناکبیری مەدەنیدا. *Civil culture*.

دەمەوێت لێرەدا ئاماژە بە نوختەیەکی زۆر گرنگ بدەم ئەویش ئەوەیە کە بە دەزگایی بوون بەردی بناغەی دروست بوونی کۆمەڵگەی مەدەنیە، دەبێت جیاوازی نێوان کاری مەدەنی وەك دەزگا *institution* و وەك ڕێکخراو *organization* بە هەند بگرین. دەزگا کۆی ئەو یاسا بنەڕەتیانەیە کە بۆ بەرژەوەندی کۆمەڵ دادەنرێت، بریتیشە لەو ڕێکخراوانەی شەرعیەتی دابین کردنی پێویستی خەڵك و بەرگری کردن لە بەرژەوەندیەکانیان بکات. لێرەوەیە کە گەشەسەندنی وابەستەی ئەو گۆڕانانەیە کە بەسەر بونیادی کۆمەڵایەتیدا دێت. پێناسەی ڕێکخراوەکانیش بریتییە لەو یەکە کۆمەڵایەتیانەی ئامانجی تایبەتی و ڕۆڵی دیاریکراویان هەیە لە چوارچێوەی دەزگایەکی فراوانتردا، کەواتە کۆمەڵگەی مەدەنی دەوری کاریگەر دەبینێت لە گۆڕانی کۆمەڵایەتی و سیاسیدا و لە بەرزکردنەوەی ئاستی هوشیاری و وەشاندنی گیانی هەرەوەزی و پێگەیاندنی بەهرەی سیاسیدا، هەروەها لە گەشەپێدانی توانا و ئاڵوگۆڕی ئەزموون لە بواری بەرگریکردن لە مافی گشتی و قازانجە کۆمەڵایەتیەکاندا.

گەشەپێدانی دەزگاکانی کۆمەڵگەی مەدەنی بنەمایەکی سەرەکیە بۆ بەدیهاتنی گۆڕان و کارێگەری دانان لەسەر ئاستی هوشیاری و توانای کاری هەرەوەزی. هەروەها بناغەیەکی پتەویشە بۆ بەردەوامبوونی سستمی دیموکراتی و گەشەکردنی، چونکە دیموکراتیەت ئامانجێکی سیاسی نییە بۆ تاکە جارێك بەدی بێت و پێیبگەیت. بەڵکو پرۆسەیەکی زیندوە دەبێت گەشە بکات و بپارێزرێ و هەوڵی بێوچان بۆ پێشکەوتنی بدرێت.

## سەرچاوە

*www.arabtopics.com*

# کۆمەڵگەی مەدەنی جیهانی

له عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

***International Civil Society Alejandro Colas***
***Polity – Cambridge – 2002***
***P. 219***

"ئەلیخاندرۆ کۆلاس"ی نوسەری ئەم کتێبە، مامۆستای پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکانە لە زانکۆی سوسیکس لە ئنگلستان. لەم کتێبەیدا "کۆلاس" مەسەلەیەکی زۆر گرنگ بۆ ئاینده دەخاتە ڕوو، ئەویش مەسەلەی دروستبونی کۆمەڵگەی مەدەنی جیهانییە لە سەرتاسەری دنیادا.

لە سەدەکانی پێشودا ئامانجی مرۆڤ ئەوە بوو بگاتە دروستکردنی کۆمەڵگەی مەدەنی لەناو چوارچێوەی دەوڵەتی نەتەوەیی نوێدا و بەمجۆرەیش دەوڵەتی نەتەوەیی لە ئەوروپا، وەکو دەوڵەتی فەرەنسی و ئەڵەمانی و ئینگلیزی و.. هتد، دەستی بە دروستبوون کرد. بەڵام هەنوکە و لە سەردەمی بەجیهانیبووندا خواستێکی لەو جۆرە بچوکەو، ئاواتی مرۆڤایەتی لەوەدایە کۆمەڵگەیەکی مەدەنی وەها دروست بکات کە نەتەوەکان و دەوڵەتی نەتەوەیی وەکو ئەوەی لە سەدەی نۆزدەهەمەوە هەیە تێپەڕێنێت و مۆدێلێکی سەرتاسەری تر بهێنێتە جێی.

نوسەر پێی وایە ئەکتیڤیستە سیاسیەکان و لێکۆڵیارە ئەکادیمیستیەکان دوای کۆتایهاتنی جەنگی سارد، کەوتنە ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی سەرهەڵدان و دەرکەوتنی دیاردەیەکی نوێ کە بریتییە لە دروستبوونی ئەو بزوتنەوە کۆمەڵایەتیانەی، بان نەتەوەیین و کیشوەر بڕن و لە پێناو چەوساوەو بێ دەرەتان و پەراوێز کەوتووەکانی تەواوی میللەتان و وڵاتاندا تێدەکۆشن.

هەر لە سەرەتاوە نوسەر دەڵێت: (پێشتر خەباتی کۆمەڵایەتی یاخود چینایەتی هەر وڵاتە و بە تەنها لە چوار چێوەی خۆیدا ڕویدەدا، بۆ نمونە

لە فەرەنسادا حیزبی کۆمۆنیست یان پارتی سۆسیالیست یان سەندیکا کرێکاریەکان یاخود بزوتنەوەکانی ژنان و..هتد، ئەو کارەیان دەکرد و ئامانجی هەوڵ و تێکۆشانی ئەوانیش هاوڵاتی فەرەنسایی بوو. بەڵام ئێستا ئەوە چەند ساڵێکە بزاوت گەلێك هاتونەتە ئارا کە بە تەنها لە خەمی خزمەتکردنی هاوڵاتی فەرەنسای یان ڕوسی یان چینی یاخود ئەفریقایدا نین، بەڵکو ئامانجی ئەوان خزمەتکردنە بە هاوڵاتی جیهانی. بێگومان ئەم دیاردەیەش تازەیە و یەکێکە لەو خەسڵەتانەی کە سەرەتاکانی سەدەی بیست و یەکەمی لە سەدەکانی پێش خۆی پێ جیا دەکرێتەوە).

سەرەتای ئەم دیاردەیەش واتە دیاردەی بەجیهانیبونی خەباتی مرۆڤایەتی دژ بە هەژاری و نەداری و چەوساندنەوە لە کۆنگرەی (ڕۆدی جانیرۆ) دەستی پێکرد. ئەو کۆنگرەیە لە پێناو زەوی و پاراستنی ژینگەدا بوو لە مەترسی پیس بوون و سەرانی وڵاتانی جیهانیش ئامادەی بوون، لەبەرئەوەی زەوی موڵکی هەموانە و تەنها موڵکی ئەمریکاییەکان یان فەرەنساییەکان یاخود ئیتاڵیاییەکان نییە. کەواتە بەرژەوەندی ژینگە و ئاوهەوا بەرژەوەندی هەموو وڵاتانە.

لێرەوە ئیتر خەڵکی درکیان بەوە کرد کە هەمویان لەناو یەك کەشتیدان و چارەنوسیان پێکەوەیە. خراپبونی ژینگە لە هەر جێگایەك کاریگەری لەسەر خەڵکی تەواوی ناوچەکانی دنیا دەبێت، بەمجۆرە گۆی زەوی بوو بە گوندێکی گەورە و بۆیەکەمجاریشە مرۆڤ هەست بەوە دەکات کە بە فیعلی لەگەڵ خەڵکانی تردا لەسەر یەك ئەستێرەو لە ژێر یەك ئاسماندا دەژی.

"ئەلیخاندرۆ کۆلاس" لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێت: (دوای ئەوە کۆمەڵگەی مەدەنی جیهانی لە کۆنگرەی –سیاتل– کە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سازدرا بەرجەستە بوو، چونکە لەو کاتەدا بزوتنەوە و ڕێکخراوگەلێکی وا کۆبوونەوە کە ئەکتیڤیستی سەرجەم وڵاتانی دنیای تێدا بوو، هەموو ئەوانە بۆ ئەوە کۆبووبوونەوە تا لە دژی بەجیهانیبونی سەرمایەداری ناڕەزایی دەربڕن، چونکە ئەو سستەمە خەمساردە دەرحەق بە پەراوێز کەوتە و هەژار و نەدارانی جیهان و ژمارەی ئەوانەش زیاتر و زۆرتر دەبێت لەگەڵ پەلکێشان و هەژمونی زیاتری سەرمایەداریدا.

کەواتە بۆ یەکەمین جارە کۆمەڵگەیەکی مەدەنی وا دێتە ئارا کە لەسەرو نەتەوەو ئایین و زمانەوەیە و ئەوەش کۆمەڵگەی مەدەنی نێودەوڵەتیە کە تەواوی کۆمەڵگە مەدەنیەکانی وەك: فەرەنسی و عەرەبی و ئەمریکی و ڕوسی و چینی و ئەفریقای و.. هتد، لە خۆ دەگرێت، واتە کۆمەڵگەیەکە تەواوی مرۆڤایەتی لە خۆ دەگرێت نەك تەنها ئەم یان ئەو نەتەوە).

ئەم کتێبە تاوتوێی چەمکی کۆمەڵگەی مەدەنی دەکات لە سەرەتای دروستبونیەوە لەسەدەی حەڤدەهەمەوە تا ئەمڕۆ، هەروەها باس لە پەیوەندی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگەی مەدەنی دەکات و پاش ئەوەش دێتە سەر باسکردنی ئەو ڕۆڵەی بزاوتە ئەکتیڤیستەکانی ئێستا دەیگێڕن لە پێکهاتەی پەیوەندییە نێو دەوڵەتیەکان و سستمی جیهانی بە گشتی.

ئەم کتێبە کتێبێکی مەنهەجیە و بەشێوەیەکی گشتی بۆ خوێندکارانی خوێندنی باڵا و لێکۆڵیاران نوسراوە. بە گشتی کتێبەکە لە پێشەکیەك و چوار بەش و پاشەکیەك پێکهاتووە، پێشەکیەکەی بەم ناونیشانەیە: ڕۆڵی ڕێکخراوە ناحکومیەکان لە پەیوەندییە نێو دەوڵەتیەکاندا. هەرچی بەشی

یەکەمیشە تایبەتە بە: کۆمەڵگەی مەدەنی، هەڕەشەکانی پەیوەندییە نێو دەوڵەتیەکان. بەشی دووەم بریتییە لە: ڕۆڵی هێز و ڕێکخراوە نا حکومییەکان لە دروستبونی پەیوەندییە نێو دەوڵەتیەکاندا، تاوتوێکردنی بزاوتە کۆمەڵایەتیە جیهانیەکان. بەشی سێیەم بابەتێکە بە ناونیشانی: لە خوارەوە سەیرکردنی کۆمەڵگەی نێو دەوڵەتی.. ڕۆڵی کۆمەڵگەی مەدەنی لە پەیوەندییە نێو دەوڵەتیەکاندا. دوا بەشیش کە بەشی چوارەمە باس لە (بەڵێنەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی جیهانی) دەکات، ئایا پێدەنێینە ناو حوکمی بەجیهانیبون و دیموکراسیەتێکی کۆسمۆپۆلێتی و نەهێشتنی سەروەری نەتەوەیی؟ پاشەکی کتێبەکەش لێکۆڵینەوەیەکە دەربارەی سودەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی جیهانی.

"ئەلیخاندرۆ کۆلاس" دەڵێت: (زیاد لە سی ساڵە ئەو زانایانەی پسپۆڕن لە بواری پەیوەندییە نێو دەوڵەتیەکاندا، ناکۆکن لەگەڵ ئەو بۆچونەی پێی وایە دەوڵەت هەموو شتێکە و بە تەنها ئەو دەتوانێت شوێن دەستی لەسەر پەیوەندییە نێو دەوڵەتیەکان هەبێت، بەڵکو ئەوان پێیان وایە کۆمەڵگەی مەدەنیش ڕۆڵ و کاریگەری خۆی لە هەموو ئەو شتانەدا هەیە و ئەم کارەش لە ڕێی ڕێکخراو و بزاوتە کۆمەڵایەتی و هەڵسوڕاوەکانیەوە ئەنجام دەدات. نمونەی ئەو زانایانەی باس لەم مەسەلەیە دەکەن بریتین لە: ڕۆبەرت کیوهان و جۆزیف نای، ئەم دوو نوسەرە لە کتێبێکیاندا بە ناونیشانی – پەیوەندییە بان نەتەوەییەکان و سیاسەتی جیهانی – باس لەو مەسەلەیە دەکەن).

"ڕۆبەرت کیوهان و جۆزیف نای" لەم بارەیەوە دەڵێن: (لە ئێستادا بەشێکی دیاریکراوی پەیوەندییەکان لە نێوان کۆمەڵگاکاندا دوور لە چاودێری حکومەتەکان و تەنانەت بە دزی ئەوانیشەوە ئەنجام دەدرێت، ئەم پەیوەندییە بان نەتەوایەتیانەش لە ڕێی ئەو پەیوەندی و بەریەککەوتن و کارلێکردنەی نێوان گروە و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنییەوە دروست دەبێت و ئەم ڕێکخراوانەش لە هەموو شوێنێکدا هەن. بۆ نمونە کۆمەڵگەیەك نییە ڕێکخراوێکی بۆ داکۆکیکردن لە مافەکانی مرۆڤ تێدا نەبێت، ئەم ڕێکخراوانەش بە بەردەوامی و بە درێژایی ساڵ پەیوەندیان لەگەڵ یەکتریدا هەیە و هیچ یەکێکیش لەم ڕێکخراوانە ئیعتراف بە سنوری نەتەوەیی ناکات کە کۆمەڵگە و گەلان لە یەکتری جیا دەکاتەوە.

چونکە کێشەی مرۆڤی چەوساوە یان زیندانی کراو و ستەم لێکراو بە هۆی بیر و بۆچونی سیاسیەوە، بۆتە جێ بایەخی کۆی ئەو ڕێکخراوانە، ئیتر ئەو مرۆڤە لەهەر شوێنێك بێت و سەربە هەر ئایین و زمان و نەتەوەیەك بێت.. باشترین نمونەش ڕێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتیە کە داکۆکی لە زیندانیکراوەکان دەکات لەهەر جێیەکی دنیادا بن.

ئەمە دیاردەیەکی تازەیە و پێشتر لە ئارادا نەبووە و پرۆسەیەکی ئومێدبەخشە لە بەراییەکانی سەدەی بیست و یەکدا، بەڵام پێویستە دان بەوەشدا بنێین کە بیریارە کلاسیکیەکانی پەیوەندییە نێودەوڵەتیەکانی وەك:– ئەمانوێل کانت و جۆن ستیوارت میل – پێشبینی شتێکی وەهایان کردووە و بەر لەوەی لە ئێستادا بێتە دی، خەونیان پێوە بینیووە).

هەر لە سەروبەندی ئەم مەسەلەیەدا "ئەلیخاندرۆ کۆلاس" دەڵێت: (بێگومان تیۆرسینەکانی پەیوەندییە نێو دەوڵەتیەکان لە سەدەی بیستەمدا، هەڵگری ئەو ئاقارە فیکرییە بەرفراوانە بوون کە خۆی لەناو چوارچێوەیەکی

نەتەوەییدا گیرنەدەدا، لەمبارەیەشەوە دەکرێت وەك نمونەیەك باس لە ڕیمۆن ئارۆن بکەین. بەڵام ئەدەبیاتی نێو نەتەوەیی کە لە سەرو دەمارگیری نەتەوایەتیەوەیە، لە سەردەمی بەجیهانی بووندا گرۆتینێکی تازەی بەخۆیەوە بینی و ئەوەی کار ئاسانی بۆ ئەم پرۆسەیەش کرد، ئەو شۆڕشی زانیاریە بوو کە تەواوی جیهانی پێکەوە بەستەوە).

نوسەری ئەم کتێبە بۆ ئەوەی جیاوازی نێوان کۆمەڵگەی مەدەنی نەتەوەیی و کۆمەڵگەی مەدەنی جیهانی ڕون بکاتەوە، ئەوا کەمەکێك دەگەڕێتەوە دواوە و لەلای تیۆریای کلاسیکی دەوڵەت و کۆمەڵگە و سیاسەت، ئێستێك دەکات.

دەربارەی چەمکی کۆمەڵگەی مەدەنی و چۆنیەتی سەرهەڵدانی دەڵێت: (سەرجەم فەیلەسوفە مەزنەکانی سەردەمی کلاسیك لە هەوڵی ڕونکردنەوەی چەمکی کۆمەڵگەی مەدەنیدا بوون و ئەم پرۆسەیەش لەسەردەستی هیگڵ و ڕەخنەکانی مارکس لێی گەیشتە ترۆپك، بەڵام پاش ئەوەی ماوەیەکی زۆر و لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا ئەم چەمکە پاشەکشەی کرد، ئێستا بە گوڕ و تینێکی زۆرەوە گەڕاوەتەوە و گەڕانەوەشی پەیوەست بوو بە ژێرەو ژووربوونی سستمە دیکتاتۆریەکانی ئەمریکای لاتین و وڵاتانی باشوری ئەوروپای وەك ئیسپانیا و پورتوگال).

ئەوە کۆمەڵگەی مەدەنی بوو کە بووە مایەی دروستبونی بزوتنەوە ئۆپۆزسیۆنەکان، ئەو بزوتنەوانەی لە سستمە ستەمکاریەکان یاخی بوون، نەك تەنها لەو شوێنانەی باسمان کردن، بەڵکو لەناوچەگەلێکی تری وەك خۆرهەڵاتی ئاسیا و پاشان لە ئەوروپای ناوەڕاست و خۆرهەڵاتیشدا لەگەڵ هەرەسهێنانی کۆمۆنیزمدا.

ئەگەر بەرخوردی کۆمەڵگەی مەدەنی نەبوایە لەبەرامبەر ستەمکاری و دیکتاتۆریەتدا، ئەوا تا ئێستاش ئەو سستمی حوکمڕانیانە دەمانەوە. کەواتە نابێت لە گرنگی و بایەخی کۆمەڵگەی مەدەنی کەم بکەینەوە و دەوڵەتیش وەکو ئەوەی ئێمە پێمان وایە توانای هەموو شتێکی نییە، گەر کۆمەڵگەی مەدەنی بە دڵی دەوڵەت نەکات و لەگەڵیدا ڕێنەکات ئەوا خۆی بە تەنها ناتوانێت هەموو شتێك بکات. هەر سستمێکی سیاسی دابڕاوبێت لەگەڵ کۆمەڵگەی مەدەنیدا، ئەوا لە دۆخێکی ناجێگیر و ئارامدا دەژی و بە بەردەوامیش لەبەردەم هەڕەشە و مەترسیدا دەبێت، ئەگەرچی ئەو سستمە دیکتاتۆریش بێت و خاوەن دەسەڵاتێکی پۆڵایین بێت.

ئاشکرایە فەیلەسوفی بەناوبانگی ئەڵەمانی "یۆرگن هاپرماس"، سەرلەنوێ دەستی کردەوە بە فۆرمەلەکردنی چەمکی کۆمەڵگەی مەدەنی و لەبەرامبەریدا چەمکی فەزای گشتی کۆمەڵگەی هێنایە ئارا. "هاپرماس" لە چۆنیەتی دروستبونی ئەم فەزایەی لە ئەوروپادا کۆڵیەوە، بە تایبەتی لەسەروەختی هەڵکشانی چینی بۆرژوازیدا لە سەدەی هەژدە و نۆزدەدا، ئەمەش بووە مایەی ئەوەی بۆرژوازیەت شوێنی چینی ئۆرستۆکراتی و فیودالیزمی کۆن بگرێتەوە. کەواتە چەمکی کۆمەڵگەی مەدەنی شتێکی نوێیە و ئەوروپا لە دوای تیۆریزەکردنەکانی "تۆماس هۆبز و جۆن ستیوارت میل و ژان ژاك ڕۆسۆ و..هتد"، ئاشنابووپێی.

هەر لە درێژەی قسەکانیدا پرۆفیسۆر "ئەلیخاندرۆ کۆلاس" دەڵێت: (لەبەرئەم هۆیە چەمکی ڕای گشتی لە کۆمەڵگە دیموکراسیە مۆدێرنەکاندا بایەخێکی زۆری پێ دەدرێت و هەر

ئەمەشە هەریەك لە حكومەتەكانی فەرەنسا و ئینگلستان و ئەمریكا زۆر سڵی لێدەكەنەوە. بە دەگمەن ئەو حكومەتانە بریارێك دەردەكەن كە بەدڵی رای گشتی نەبێت، چونكە لەو كاتەدا خەڵكی بە خۆپیشاندان دەرژێنە سەر شەقامەكان و دەسەلاتی حكومەت دەخەنە بەرمەترسی. بۆیە ئاساییە كە راپرسی گشتی لە وڵاتە پێشكەوتووەكاندا لە زیادبوندایە و ئەو راپرسیانەش هەموو مانگێك ئەنجام دەدرێت و زیادبوون یان دابەزینی ئاستی جەماوەری سەرەك كۆمار و سەرەك وەزیران و وەزیرەكان و.. هتد، نیشاندەدات.

كەواتە پەیوەندیەكی توند و تۆڵ لە نێوان سستمی حوكمرانی و میللەتدا هەیە، ئەمەش بە پێچەوانەی سستمە نادیموكراسیەكانەوەیە كە شەرعیەتی خۆیان لە گەل و هەڵبژاردنی دروستەوە بەدەست ناهێنن، بەلام دەبێت ئەوەش بوترێت كە لە ئەوروپای پێش ژان ژاك رۆسۆدا هەلومەرج وەها نەبوو، بۆ نمونە لەوكاتەدا لویسی چواردەهەم مەشروعیەتی لە كلێسای كاتۆلیكیەوە وەردەگرت، بەوپێیەی سێبەری خواوەندە لەسەر زەوی).

لە كۆتایی كتێبەكەیدا "كۆلاس" دەڵێت: (چەمكی كۆمەڵگەی مەدەنی تەنها لە سەدەی هەژدەهەم و لەسەر دەستی ژان ژاك رۆسۆ و كانت و هیگڵ هاتە ئارا.. ئیتر لەوێشەوە بۆ یەكەمین جار دەوڵەتی ماف و یاسا لە ئەوروپادا دروست بوو، بەلام ئەم دەوڵەتە تەنها دوای شۆرشی فەرەنسی و راگەیاندنی جارنامەی مافەكانی مرۆڤ و هاوڵاتی بەشێوەیەكی فعلی دامەزرا.. بەر لەو قۆناغە ئەوەی بالا دەست بوو دەوڵەتی ستەمكاری و زوڵم و زۆر بوو، واتە دەوڵەتی بێ یاسایی بوو.. لە ئێستاشدا مرۆڤایەتی لە مێژووی خۆیدا پێیناوەتە قۆناغێكی نوێوە. ئەوەتا پاش ئەوەی دەوڵەتی یاسایمان لەسەر ئاستی نەتەوەیی بەدی هێنا، هەنوكە خەون بەوەوە دەبینین كە لەسەر ئاستی سەرتاسەری دنیا جێبەجێی بكەین، بۆ ئەم مەبەستەش بزاوتە كۆمەلایەتیەكان كە كار بۆ دادپەروەری دەكەن، رۆڵێكی گەورە و بەرچاو دەگێرن، چونكە ئەمانە دەتوانن سستمی نێو دەوڵەتی ناچار بكەن كە نەرمونیانتر بێت دەرهەق بە هەژاران و بێ دەسەلاتان و پەراوێزكەوتەكان و ستەمی زۆریان لێنەكات).

دروستكردن و هێنانە ئارای كۆمەڵگەیەكی مەدەنی نێو دەوڵەتی كە نوێنەرایەتی تەواوی مرۆڤایەتی بكات و دوور بێت لە سانسۆری رەسمی، وەكو بیرۆكەیەك لە ئارەدایە و كاری بۆ دەكرێت، بەلام تا ئێستاش بەرجەستە كردنی لەسەر زەمینەی واقیع ئەستەم و گرانە.

## سەرچاوە

بیان الكتب، ژمارە (227)، بەرواری 2002/11/9.

# کۆمەڵگای مەدەنی: مێژووی چەمکەکە

**نیرا چاندۆك**

**لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی**

لە فەسڵی پێشودا بەڵگەمان هێنایەوە کە بێ ئاماژەکردن بۆ کۆمەڵگای مەدەنی ناتوانرێ دەوڵەت بەدروستی شیبکرێتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا لە تیورەی سیاسیدا هیچ ڕێکەوتنێك لەبارەی پێناسی کۆمەڵگای مەدەنیەوە نیە. لە دەرون و لەناو نەریتە فکریە جیاوازەکاندا لەبارەی مانای کۆمەڵگای مەدەنیەوە، بیروبۆچونی جیاواز هەبووە. لێرەوە ئەم چەمکە، چەمکێکی چەند لایەنە و ئاڵۆزە. ئەم چەمکە خاوەن ڕەهەندی مانای جیاوازە کە ئەم ڕەهەندانە لە سیستەمی فکری جیاوازەوە سەرچاوەیان گرتووە و لە هەندێك ڕوەوە لەیەکەوە نزیکن و لە هەندێك رووی دیەوە زۆر لەیەك دورن. دەکرێ هۆی ئەمە بگەڕێنرێتەوە بۆ ئەو ڕاستیەی کە لە قۆناغە مێژووییە جیاوازەکاندا، ڕەهەندی جیاوازی ئەم چەمکە باڵادەست بووە و ئەمەش چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی بەشێوەیەکی سەرەکی، توشی گۆڕان کردووە.

هەرچەند باسی گەرموگوڕ لەبارەی کۆمەڵگای مەدەنیەوە هەیە، بەڵام ئەم باسانە خاوەن ئینسجامێکی بنەڕەتین، چونکە ئەگەرچی چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی رەنگە ماهیەتێکی نەگۆڕ و یەکتای نەبێت، بەڵام خاوەن چەند خەسڵەتێکی دیاریکراوە. هەریەك لەم خەسڵەتانە بۆتە ناوەندێك بۆ شکڵگرتن و وتوێژی فکری دی لەبارەی ئەم چەمکەوە. لێرەوە دەکرێ مێژووی چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی بەپێی ریوایەتە بەرجەستەکان و ئەو کاردانەوانەی لەبەرامبەر ئەم ریوایەتانەدا ئەنجامدراوە، وێنە بکەین.

لێکۆڵینەوەی مێژووی چەمکێکی تایبەت لەو ڕوەوە گرنگە کە یارمەتی ناسین و جیاکردنەوەی تێڕوانینە جیاواز و ناکۆکەکان لەبارەی ئەو چەمکەوە دەدات. لێکۆڵینەوەی مێژوویی چەمکێك، مانا جیاوازەکانی ئەو چەمکە ڕووندەکاتەوە و ئەمەش خۆی دەرگایەکمان بۆ ناسینی ئەو چەمکە، بۆ دەکاتەوە. بە تاوتوێکردنی کۆی نەریتی تیورەی سیاسی لە گۆشەی چەمکێکی تایبەتەوە و بە ناسینی کەموکوڕی چاکسازیەکانی رابردوو، دەکرێ رەگەزە چارەنوسساز و زیندوەکانی ئەو

چەمکە تێکئاڵێنین و بە ناسین و تێڕوانینێکی تازە بۆ ئەو چەمکە بگەین.

لەگەڵ ئەوەشدا لێکۆڵینەوەی مێژووی چەمکێك هاوکاریمان دەکات بۆ ئەوەی هەڵەکانی رابردوو دوبارە نەکەینەوە. لێرەوە ئەم لێکۆڵینەوە مێژووییە یارمەتی رونکردنەوەی ئەو چەمکە بۆ مەبەستە سیاسیەکان دەدات، چونکە ئەگەرچی کۆمەڵگای مەدەنی بووە بە چەمکێکی بنەڕەتی بۆ داڕشتنی پرۆژە رادیکالەکان لە دنیای هاوچەرخدا، بەڵام تێڕوانینێکی کەموکوڕ و تاك رەهەندی و شیکاری بۆ ئەم چەمکە دەتوانێ ببێتە هۆی ئاراستەیەکی سیاسی نادروست. ئەمە بەمانای ئەوەیە لە لێکۆڵینەوەی مێژوویی چەمکی کۆمەڵگای مەدەنیدا، نەك هەر دەبێ تێڕوانینی دامەزرێنەران و لایەنگرانی هەمەرەنگی کۆمەڵگای مەدەنی، بەڵکو دەبێ تێڕوانینی رەخنەگرانی کۆمەڵگای مەدەنیش، تاوتوێ بکرێ. لێکۆڵینەوەی مێژووی چەمکێك وەك کارێکی فیکری و سیاسی گرنگیەکی زیندووی هەیە.

مێژووی چەمکەکە لە دێڕەکانی خوارەوەدا دەهێنرێتەوە، هەڵبژاردراوە و بەهیچ شێوەیەك کۆی تیورەکانی کۆمەڵگای مەدەنی ناگرێتەوە. من بە پشتبەستن بەو تێڕوانینە سەرەکیانەی لەبارەی پەیوەندی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنیەوە پێشکەشکراوون، هەوڵمداوە پەیوەستبوون و دابڕان لە چەمکی کۆمەڵگای مەدەنیدا، تاوتوێبکەم. بەبڕوای من لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگای مەدەنی تەنها لەپەیوەندیدا بە دەوڵەتەوە مانای هەیە.

## مێژووی تیوری

چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی بۆ ماوەیەکی درێژ بەشێك بووە لە نەریتی فکری رۆژئاوا. ئەم نەریتە فکریە هاوکات لەگەڵ گۆڕانکاریە مادی، سیاسی، و فکریەکانی کۆمەڵگای رۆژئاوادا، گۆڕانی بەسەردا هاتووە. ئەم نەریتە فکریە لەگەڵ گۆڕانکاریە مێژووییەکانی کۆمەڵگای رۆژئاوادا وەك پەیدابوونی دەسەڵاتی دنیایی و نامەزهەبی، پەرەسەندنی موڵکایەتی تایبەتی، پەیدابوونی کلتوری شار، لەناوچوونی دەوڵەتە دەسەڵاتدارە رەهاکان، پەیدابوونی بزوتنەوە دیموکراتیەکانی سەدەی نۆزدەهەم، مەشروتیەتگەری نوێ و باڵادەستی یاسا، پەیوەندییەکی دانەبڕاوی هەیە. ئەم نەریتە فکریە بەر لەهەموو شتێك پەیوەندی لەگەڵ پەرەسەندنی ئابوری سەرمایەداری و لە دەرئەنجامدا جیابونەوەی ئابوری لە سیاسەتدا هەیە. بەمشێوەیە ئەم نەریتە فکریە بێ چەند و چون پەیوەندییەکی توند و تۆڵی بە پەیدابوون و سەقامگیری سەرمایەداریەوە هەیە.

ئەو وتەیەی کین راستە کە چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی (بەر لە دەرکەوتنی بۆرژوازی هەبووە و بۆ نمونە لە بیری سیاسی سەردەمی کلاسیك و ناوەڕاستدا بە باشی بڵاوبوو بووە و لەمەش گرنگتر ئەوەیە هەموو مانا سەرەتاییە تازەکانی ئەم چەمکە پەیوەندی بە مەسەلەی سیاسی و جۆر و شکڵی هەلومەرجی کونترۆڵ و رەوایەتی دەسەڵاتی دەوڵەتەوە هەیە). بەڵام وەك پاشتر دەریدەخەین، بەر لە دەرکەوتنی کۆمەڵگای بۆرژوازی، چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی بە وردیەکی ئەوتۆ بەکار نەدەهات. کۆمەڵگای مەدەنی تەنها کاتێك بوو بە چەمکێکی روون و گونجاو کە بواری مەدەنی بە باشی دروستبوو. دروستبوونی بواری مەدەنیش خۆی دەرئەنجامی سەقامگیری سەرمایەداری بوو. ناوەندێتی کۆمەڵگای مەدەنی پەیوەندیەکی نزیکی بە دەرکەوتنی دەسەڵاتی سیاسی ناشەخسی و

ناوەندێتی ژیانی ئابوریەوە هەیە لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا. بەبڕوای بۆبێۆ ئەم «زنجیرە بیروڕایە هاوکاتی دەرکەوتنی دنیای بۆرژوازیە: ناسینی ماف سروشتی تاکەکان و گروپە کۆمەڵایەتیەکان بە شێوەیەکی سەربەخۆ لە دەوڵەت، بەشێوەیەك کە دەسەڵاتی سیاسی سنوردار بکات و ناسینی بوارێك لە پەیوەندی نێوان تاکەکان وەك پەیوەندیە ئابوریە خودموختارەکان کە رێکخستنی پێویستی بە دەسەڵاتێکی سەرکوتکەرانە نیە».

سەرەڕای ئەمە ئەم زنجیرە بیروڕایە لە نەریتی رۆژئاوادا هاوکاتی ئەم مەسەلانەی خوارەوە بووە: مافە فەردیەکان بەتایبەتی ماف موڵکایەتی، پیرۆزی مافەکان و ئازادیە فەردیەکان، دەسەڵاتی بازاڕ، فەردگەری، و جیابونەوەی بواری گشتی لە بواری تایبەتی. جگە لەمەش ئەم بیروڕایانە پەیوەندی بە دەزگا و تێزە پەرلەمانیەکان و هەروەها بڕوابوون بە پێویستی کۆنترۆڵ کردن و سنوردارکردنی دەسەڵاتی دەوڵەتەوە هەبووە. هەریەك لەم بیروڕایانە لە قۆناغی جیاوازی پەرەسەندنی چەمکی کۆمەڵگای مەدەنیدا، روونبونەتەوە. هەریەکێکیشیان لە قۆناغی مێژووی جیاوازدا، باڵادەستبوون. بەڵام هەمویان پێکەوە یارمەتی روون بونەوەی خەسڵەتەکانی شتێکیان داوە کە دەکرێ ناوی بنرێ «کۆمەڵگای مەدەنی». لە دێرەکانی خوارەوەدا باسی ئەم خەسڵەتانە دەکەین.

لە رویەکەوە دەتوانرێ بگوترێ کۆمەڵگای مەدەنی لەبەرامبەر چەمکی ئەرستۆیی کوینونیا پۆلیتیکە (بەمانای کۆمەڵگای سیاسی) دا رادەوەستێ. لە روانگەی یۆنانیەکاندا، کۆمەڵگای سیاسی لە سروشتی مرۆڤەوە سەرچاوەی دەگرت، چونکە مرۆڤ «ئاژەڵێکی سیاسی» و بونەوەرێکی سیاسی بوو. مرۆڤ عیزەتی نەفس و سروشتی راستەقینەی خۆی لە بواری سیاسیدا بەدەست دێنێت و لەبەرئەوە چالاکیە ناسیاسیەکانی لە پلەی دوهەمدا دەهات. بوونی بوارێکی تایبەتی یان نادەوڵەتی کە تیایدا تاکەکان بتوانن لە ئەرکە گشتیەکانیان دوربکەونەوە یان بتوانرێ بەهۆیەوە سنور بۆ کۆمەڵگای سیاسی دابنرێت، شتێکی قابیلی وێناکردن نەبوو. ئەو بیرەش نەبوو کە تاکەکان دەبێ خاوەن ماف سەربەخۆ و پارێزگاریکراو بن.

ئەم تێڕوانینانە لە تیورەی یۆنانیەکاندا نەبوو . چونکە لە روانگەی ئەوانەوە تاك خۆبەخۆ بەشێك بوو لە پرۆسەی سیاسی کە تاکەکان بەهۆیەوە، تواناکانی خۆیان بەدی دێنن. ماف سەرەکی تاك بریتیبوو لە بەشداریکردن لە وتوێژی کۆمەڵگایەکدا کە ئەم خۆبەدیهێنانەی، دەهێنایەدی. ئەم مافە لەراستیدا، ئەرکێکی مەدەنی بوو.

ئەڵبەتە چەمکی ئەرستۆیی «ئاژەڵی سیاسی» لە بنەڕەتدا خەسڵەتێکی دەستەبژێرانەی هەبوو: «ئاژەڵی سیاسی» ئەرستۆ تاکێکی نێر، هاوڵاتی و دەوڵەمەند بوو. کەسانی دی وەك ژنان یان کۆیلەکان سەر بە ئویکۆس یان دنیایی تایبەتی بوون. ئویکۆس بەمانای بوارێکی تایبەتی و جیاواز لە کۆمەڵگای سیاسی بوو، بەڵام زەحمەتە بەشێوەیەکی سەرەتایی کۆمەڵگای مەدەنی بزانرێت، چونکە ئویکۆس بوارێکی پلە دوو بوو کە ئەو کەسانەی لەخۆ دەگرت کە لە مافەکانی هاوڵاتیبوون بێبەش بوون. وەك دواتر دەیبینین لە شکڵبەندیەکانی دواییدا خودی هاوڵاتیان لە خۆ دەگرێت و لەبری ئەوەی بوارێکی پلە دوو بێت لەبەرامبەر کۆمەڵگای سیاسیدا، بوارێکە کە تیایدا گرنگترین چالاکیەکانی کۆمەڵگا دروستدەبێت. لە کۆمەڵگای یۆنانیدا هیچ جۆرە وینایەك بۆ ئازادی

فەردی وەك مافێكی زاتی و پارێزراوی مرۆڤ نەبوو. لەكاتێكدا ئەم مافە بەرجەستەترین رەگەزەكانی تێگەیشتنە سەرەتاییەكان بووە بۆ كۆمەڵگای مەدەنی.

رۆمانیەكانیش چالاكی سیاسیان بە گرنگترین چالاكی تاك و بە رەمزی خوددروستكردنی تاكیان دەزانی. لە روانگەی رۆمانیەكانەوە دەوڵەت بەمانای كۆمەڵگای هاولاتیان بوو. لەگەڵ ئەوەشدا بە پەرەسەندنی یاسایی رۆمانی كە مافی فەردی و بەتایبەتی مافی موڵكایەتی زامن دەكرد، شێوەیەكی سەرەتایی لە جیابونەوەی بواری تایبەتی لە بواری گشتی دروستبوو. مافە تایبەتیەكان ئاماژەی بۆ خێزان و بەڵگەی پەیوەندیدار بە رێكەوتنامەكان، موڵكایەتی و میرات دەكرد. لەڕاستیدا پەیدابوونی سیستەمێكی ئەخلاقی تاگەریانە لە رۆمانی كۆندا پەیوەندی بە موڵكایەتی تایبەتی و مافی پاوانكردنی مولكایەتیەوە هەبوو. بە یاساییبوونی موڵكایەتی تایبەتی جیاكردنەوەیەكی چەمكی لەنێوان رەهەندی گشتی ژیانی تاك لەلایەك و پێداویستیە تایبەتیەكانی خۆی كە هەنوكە ملكەچی مافی جیا و تایبەتی خۆی بوو، لەلایەكی دییەوە دروستبوو. ئەم مەسەلەیە بە رەسمی ناسرا كە تاك مافی ئەوەی هەیە خاوەن ژیانێكی سەربەخۆ لە كۆمەڵگای سیاسی بێت. ئەم جیابونەوەی بواری تایبەتی لە بواری گشتی، زەمینەی چەمكیی پێویستی بۆ دەركەوتنی چەمكی كۆمەڵگای مەدەنی، خۆشكرد.

كۆمەڵگای مەدەنی وەك چەمكێك بەشێوەیەكی سەرەكی تازە، لەسەدەی هەڤدەهەم تا سەدەی نۆزدەهەم پەیدابوو. دەركەوتنی ئەم چەمكە پێشكەوتنێكی گرنگ بوو لە بواری مافەكانی پەیوەندیدار بەتاك، پەیوەندی تاك بە دەوڵەتە و بەكەسانی دی كۆمەڵگاوە. كۆمەڵگای مەدەنی چەمكێكی نوێیە. چونكە ئاشكراكەری جیابونەوەی روونی ژیانی مەدەنی و سیاسیە لەیەكدی، جیاكاریەك كە لە رابردوودا بەگشتی نەناسراو بوو. یەكەمین نیشانەكانی ئەم چەمكە تازەیە لە شكڵبەندیەكانی لۆك و هۆبزدا ، تیوریزەنانی سەرەتایی نوێگەریدا دەدۆزرێتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا جیاوازی كۆمەگای مەدەنی لە كۆمەڵگای سیاسی هێشتا روون نیە. چونكە هۆبز و لۆك دوو سیفەتی مەدەنی و سیاسیان لەبری یەك بەكاردەهێنا: بۆ نمونە لۆك باسی «كۆمەڵگای مەدەنی یان سیاسی» و روبەڕوبونەوە «دۆخی سروشتی» و «دۆخی مەدەنی» دەكرد.ئەو ئاڵۆزیەی لە بەكارهێنانی چەمكی كۆمەڵگای مەدەنیدا هەبوو بەشێوەیەكی سەرەكی دەگەڕایەوە بۆئەوەی كە ئەم چەمكە بۆ ئەو مەبەستە بەكاردەهێنرا كە شێوەیەكی تایبەت لە رێكخستنی كۆمەڵایەتی و سیاسی لە دۆخی سروشتی جیابكاتەوە. یەكەم لە روانگەی ئەم تیوریزەنانەوە كۆمەڵگای مەدەنی لەرووی چەمكەوە خاڵی بەرامبەر بە دۆخی سروشتی بوو. دوهەم لە تیورەكانی پەیمانی كۆمەڵایەتیدا كۆمەڵگای مەدەنی دیاردەیەكی دروستكراوە. بە دەربڕینێكی تر دۆخی سروشتیە كە فەزای سروشتی تاكە و كۆمەڵگای مەدەنی شتێكە كە دەبێت دروستبكرێت.

هەلومەرجی سروشتی دروستكراوی زیهنی تیوریزەنانی پەیمانی كۆمەڵایەتی بوو بۆ پیشاندانی ئەوەی كە تاك ئازادانە دەوڵەت قبوڵدەكات و هەروەها بۆ پیشاندانی ئەو مەسەلەیەی كە دەوڵەت لەسەر بناغەی رازیبوون دروستدەبێت. تیوریزەنانی پەیمانی كۆمەڵایەتی لای خۆیان وا بیریان كردبۆوە كە ئەگەر هەوەس و ئارەزوەكانی مرۆڤ كۆنترۆڵ نەكرێت، ژیان چ

شکڵێکی دەبێت. ئەوان ئەم دۆخەیان بە دۆخی سروشتی ناودەبرد. لەدیدی هۆبزەوە ئەم دۆخە هەم دۆخێکی پێش سیاسی بوو، هەم پێش مەدەنی. لەدیدی ئەوەوە خەسڵەتی ئەم دۆخە جەنگی هەموانە دژی هەموو. لەو دۆخەدا هەوەس و ئارەزووەکانی مرۆڤ ژیانی تاکەکان دەخەنە مەترسیەوە. لە دەرئەنجامدا ئاشتی و ئاسایشی مادی کاتێك دەستەبەر دەکرێت کە هەوەس و ئارەزوەکانی مرۆڤ بەهۆی دەسەڵاتدارێکی بەهێزەوە، کۆنترۆڵ دەکرێت. تاکەکان بۆ زامنکردنی مافی ژیانی خۆیان واز لە ئازادیە سروشتیەکانی خۆیان دێنن و قبوڵی دروستبوونی کۆمەڵگایەکی یاسایی دەکەن. هۆبز ئەم کۆمەڵگا یاسارێژکراو و ئاشتیخوازە کە بە رازیبوون دروستدەبێت، ناودەنێت کۆمەڵگای مەدەنی. بەمشێوەیە پەیمانی کۆمەڵایەتی دەبێتە هۆی دروستبوونی کۆمەڵگای مەدەنی و سیاسی کە هەردوکیان لەرووی چەمکەوە لەبەرامبەر دۆخی سروشتیدا رادەوەستن.

بە بڕوای لۆك دۆخی سروشتی دۆخێکی توندوتیژ نەبوو، بەڵکو دۆخێکی کۆمەڵایەتی بوو کە خەسڵەتەکەی ئاڵوگۆڕی مەدەنی نێوان تاکە سەربەخۆ و ئازادەکان دروستی دەکات. دۆخی سروشتی وەك دۆخێك کە تیایدا تاکەکان لەسەر بناغەی یاسای سروشتی کاردەکەن، هەلومەرجێکی پێش سیاسی بوو، نەك هەلومەرجێکی پێش کۆمەڵایەتی. لەگەڵ ئەمەشدا بەپێ بەڵگاندنەکانی لۆك لەحاڵەتی نەبوونی مەرجێکی رێکخەر کە بتوانێ زامنی جێبەجێبوونی رێکەوتن و پەیمانەکان بکات، پەیوەندی تاکەکان پێشبینی ناکرێت و لە دەرئەنجامدا مەترسیدار دەبێت. هەستی نەبوونی ئاسایشی گیانی و مادی بووە هۆی ئەوەی تاکەکان پەی بە گرنگی بوونی مەرجەعێکی یاسایی بەرن و لە دەرئەنجامدا دۆخی مەدەنی پێکبهێنن کە تیایدا خاوەن ئاسایش بن. لۆك بەڵگەی دەهێنایەوە کە کۆمەڵگا لە سروشتی مرۆییەوە سەرچاوە دەگرێت، بەڵام ئەم کۆمەڵگایە دەبێت بەهۆی پەیمانە کۆمەڵایەتیەکان و دەوڵەتەوە رێکبخرێت. تەنها کاتێك دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی دروستبوون، ئازادیەکانی دۆخی سروشتی دەتوانن، بێنە دی. لۆك هەم وەك هۆبز دۆخی سروشتی لەرووی چەمکەوە بە خاڵی بەرامبەر دۆخی سروشتی دەزانی.

کۆمەڵگای مەدەنی و سیاسی کە بە هۆی پەیمانی کۆمەڵایەتیەوە دروستدەبوو، زامنی مەدەنیەتی دەکرد، چونکە ئەم کۆمەڵگایە بەپێچەوانەی دۆخی سروشتیەوە. ئازادی هەڵسەنگێنراو،ئاسایشی گیانی و مادی، ژیانی عەقلانی دەستەبەر دەکرد. هەنوکە تاکەکان دەچنە ناو تۆڕێك پەیوەندی سەقامگیرەوە و مافی یەکدی بەرەسمی دەناسن و رێزیان لێدەگرت. بەمشێوەیە کۆمەڵگایەك دروستدەبوو کە تەنها کۆمەڵگایەکی سیاسی واقعی بوو کە تیاییدا تاکەکان بەهۆی پەیمانی دولایەنەوە، پێکەوە دەبەستران. رازیبوون یان پەیمانی کۆمەڵایەتی هەروەها کۆمەڵگایەکی یاسایی پێکدەهێنا کە تیایدا ژیانی تاك، داراییەکانی و ئاسایشی، دەیتوانی پارێزراو بێت. بەمشێوەیە کۆمەڵگای مەدەنی یەکسان بوو بە کۆمەڵگای سیاسی، بەڵام کۆمەڵگای سیاسی تەنها کاتێك دەیتوانی هەبێت کە مەدەنیەت لە پەیوەندی مرۆڤەکاندا بەهۆی پەیمانێکەوە زامن دەکرا. لە بەرامبەردا مەدەنیەتیش تەنها بەهۆی دەسەڵاتی سیاسیەوە دەیتوانی بپارێزرێت. جەختی هەردوو بیریار لەسەر مامەڵەی کۆمەڵایەتی و سیاسی رێکخراو، باسی ئەوە دەکات کە گواستنەوە لە

دۆخی سروشتیەوە یان سوکێتاس ناتورالیس (کە تیایدا مرۆڤەکان ئازاد و یەکسان بوون) بۆ کۆمەڵگای مەدەنی یان سۆکێتاس کیویلیس (کە تیادا تاکەکان ئازادانە قبوڵی هەندێك سنورداریێتی ئازادی خۆیان دەکەن)، مەسەلەیەکی لۆژیکی و تەنانەت پێویست بوو. گەر وانەبوایە تاکەکان دەبوو باجێکی گەورە بدەن. ئەگەر ئەم رێسا و سنورداریێتیانە نەبوونایە، دڵەڕاوکێ و لەرزیووی بالادەست دەبوو. تاکەکان یان دەبێت ئازادی رەها بەلام بێ دڵنیایی دۆخی سروشتی هەڵبژێرن، یان ئازادی سنوردار بەلام دڵنیایان لە کۆمەڵگای مەدەنیدا. ئەوان بە ئاشکرا دوهەمیان هەڵبژارد.

لەو روەوە کە تیوریزەنانی پەیمانی کۆمەڵایەتی، کۆمەڵگای مەدەنیان لەخاڵی بەرامبەر بە دۆخی سروشتیدا دادەنا، کۆمەڵگای مەدەنی و کۆمەڵگای سیاسیان تێکەڵ بەیەکتر کرد. لە روانگەی ئەوانەوە تاکەکان هەرئەوەندەی لە دۆخی سروشتیەوە چونەدەرێ دەچنە ناو کۆمەڵگای مەدەنی و سیاسیەوە، هەردوك پێکەوە. تێکەڵی کۆمەڵگای مەدەنی و سیاسی لە بەرهەمەکانی بیریارانی تریشدا دەبینین. بۆ نمونە بۆدن دەیگووت کە «دەوڵەت کۆمەڵگای مەدەنیە» و ئیمانوئیل کانتیش دەیگووت «مرۆڤ دەبێت لە دۆخی سروشتی کە تیایدا هەرکەسێك بەپێی هەوس و ئارەزوەکانی خۆی دەسوڕێتەوە، بێتە دەرێ و پەیوەندی بەکەسانی دیەوە بکات....مل بۆ سنورداریێتیەکی یاسایی و دەرەکی گشتی بدات...و بە دەربڕینێکی دی بەپلەی یەکەم بچێتە ناو دۆخی مەدەنیەوە».

مەسەلەیەکی تر ئەوەیە کە لە تیورەکانی پەیمانی کۆمەڵایەتیدا، کۆمەڵگای مەدەنی وەك خاڵی بەرامبەر دۆخی سروشتی، چەمکێکی دروستکراوە. لەتیورەی لۆکدا کۆمەڵگا سەرچاوە لە سروشتی مرۆڤەوە وەردەگرێت، بەلام کۆمەڵگا بۆئەوەی بەردەوام بێت دەبێت کۆمەڵگایەکی مەدەنی بێت، واتە کۆمەڵگایەك بێت کە لەسەر بناغەی مەدەنیەت و هەنگاونانی دولایەنە راوەستاوە. کۆمەڵگایەکی یاساریێژ کە تیایدا تاکەکان سنورداریێتیەك بۆ ماڤی خۆیان قبوڵدەکەن و دۆخێکی سیاسی کە تیایدا تاکەکان ملکەچی یاسا مەدەنیەکان و پەیمانی دولایەنەن، شتێکە کە دەبێت هوشیارانە دروستبکرێت. بەمشێوەیە چەمکی ئەرۆستۆیی کوینونیا پۆلۆتیکە (یا کۆمەڵگای سیاسی) بەتەواوی پێچەوانە دەبێتەوە. لەڕوانگەی یۆنانیەکانەوە کۆمەڵگای مەدەنی\ سیاسی مەسەلەیەکی سروشتی بوو، چونکە:

بەتەواوی لەگەڵ سروشتی کۆمەڵایەتی مرۆڤدا (ئاژەڵی سیاسی) گونجاو بوو. بەلام هەر ئەم کۆمەڵگای مەدەنیە لە روانگەی هۆبزەوە (لەبەرئەوەی کە خاڵی بەرامبەر دۆخی سروشتیە و لەرێگەی رێکەوتنی تاکەکانەوە بۆ دەرچوون لەدۆخی سروشتی دروستدەبێت) کۆمەڵگایەکی «دامەزراو یان دروستکراوە».

ئێستا قبوڵکردنی ئەو مەسەلەیەی کە تاکەکان بەشێوەیەکی هوشیارانە کۆمەڵگایەکی مەدەنی و کۆمەڵگایەکی سیاسی دروستدەکەن ، دەرئەنجامی زیندووی دیارکراوی دەبێت. لە تێڕوانینی ئەرستۆدا بۆ کوینیونیا پۆلیتیکە، تاك توانای کەمی لەبەرامبەر کۆمەڵگای سیاسیدا هەیە، چونکە ئارەزوەکان و هەوەس و عەقڵی مرۆڤ بەشێوەیەکی سروشتی دەبێتە هۆی پەیدابوونی کۆمەڵگای سیاسی. بەلام کاتێك تاکەکان بەشێوەی ئازادانە و هوشیارانە کۆمەڵگایەکی دروستکراو پێکدەهێنن، ئەوسا ئەوان خۆبەخۆ خاوەن

توانایەکی سەربەخۆ لە ئەم کۆمەڵگا دروستکراوە دەبن. رازیبوونی تاکەکان ئەو گرنگییەی هەیە کە توانایی ئەو کەسانەی رازیدەبن، پیشاندەدات. لە تیورەکانی پەیمانی کۆمەڵایەتیدا، تاك خەسڵەتێکی عەقلانی هەیە و دەتوانێ لەوە تێبگات کە لە حاڵەتی نەبوونی خەسڵەتە یاساییەکاندا، پەیوەندییە مرۆییەکان توشی کێشە دەبن و ئاسایش مومکین نابێت. پرۆسەی رازیبوون توانای سیاسی و کۆمەڵایەتی بە تاك دەبەخشێ، چونکە دەیکاتە خاوەن تیژ بینی و یەکسانی سیاسی. گرنگتر لەمە دروستکردنی کۆمەڵگایەکی مەدەنی/سیاسی دروستکراو، دەبێتە هۆی ئەوەی تاکە رازیبووەکان تا رادەیەك کۆنترۆڵیان بەسەر ئەم دروستکراوەی خۆیاندا (واتە کۆمەڵگای مەدەنی و سیاسی) هەبێت. ئەم کۆنترۆڵەش لەبەرئەوە قابیلی جێبەجێبوونە کە تاکەکان لەسەر بناغەی یاسای سروشتی، خاوەن مافی سروشتین.

تیوریزەنانی پەیمانی کۆمەڵایەتی گۆڕانکاریەکی یاسایی گرنگیان هێنایە دی. ئەوان مافی سروشتی فەرمانڕەوایان سەندەوە و مافە سروشتیەکانیان لەسەر بناغەی یاسای سروشتی، بە تاکەکان سپارد. ئەم مافە سروشتیانەیان بە ئەبەدی و نەگۆڕ دەزانی کە قابیلی گواستنەوە نییە. لە هەر کۆمەڵگا و هەلومەرجێکدا تاکەکەکان لەبەر مرۆڤبوونی خۆیان، خاوەن ئەم مافانەن. ئەم مەسەلەیە دەرئەنجامی گرنگی بۆ چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی هەبوو. تاکەکان بە دەستی خاڵی نەدەچونە ناو کۆمەڵگای مەدەنیەوە، بەڵکو ئەم مافانەیان لەگەڵ خۆیاندا دەبرد. یەکێك لەم مافانە، مافی هەڵبژاردنی شێوەی حکومەت بوو. بەڵام گرنگتر لەمە کاتێك حکومەت دروستبوو، وەزیفەی فەرمانڕەوا ئەوەبوو کە هەلومەرجی پێویست بۆ بەدیهاتن و بەردەوامبوونی مافی تاکەکان، بێنێتەدی. لەڕاستیدا ئامانجی پەیمانی کۆمەڵایەتی، دروستکردنی کۆمەڵگایەك بوو کە تیایدا مافی تاکەکان لەرێگەی رێکەوتنی دولایەنەوە، پارێزراو بێت و بێتە دی. بەمشێوەیە ئەم مافانە بوونە هۆی سنورداربوونی دەسەڵاتی فەرمانڕەوا. نەك هەر ئەو دەوڵەتە مەشروتیەتەی کە بەپێی بەڵگاندنەکانی لۆك بە هۆی تاکەکانەوە دروستدەبوو، بەڵکو ئەو دەوڵەتە دەسەڵاتدارەش کە بەپێی تێڕوانینی هۆبز لەلایەن تاکەکانەوە دروستدەکرا، سنوردار بوو. ئەم دەوڵەتانە بەهۆی مافی سروشتی تاکەکانەوە، سنوردار دەکرێن. بە دەربڕینێکی دی رەچاوکردنی مافەکانی تاك بوو بە ئەرکی دەوڵەت و بەمشێوەیەش سنورداریێتی بۆ دەوڵەت دروستکرد.

دیارە ئەم سنورداریێتیانە لە تیورەکەی لۆکدا زۆر زیاترە. ئەو کە راستەوخۆ پاش «شۆڕشی شکۆدار»ی ساڵی 1688 تیورەکانی خۆی نوسی، مافی جۆراوجۆری، وەك مافی موڵکایەتی و گواستنەوەی دارایی و مافی ئازادی بۆ تاك بە رەوا دانا. لە روانگەی لۆکەوە تاکەکان بۆ پاراستن و بەدیهاتنی ئەم مافانە، دەچنە ناو کۆمەڵگای مەدەنیەوە. لۆك و هیگڵیش پاش ئەو بڕوایان وابوو کە ئەم مافانە تەنها لە کۆمەڵگایەکدا دەتوانێ بپارێزرێت کە ئەم مافانە بەرەسمی بناسێت و پشتیوانیەکی یاسایی بۆ دابین بکات. ئەم مافانە بەهۆی زەمانەتی کۆمەڵایەتی و سیاسیەوە، پیرۆزی ئەخلاقی و سیاسی بەدەستدێنن. لێرەوە ئەو دەوڵەتەی لۆك مەبەستی بوو، هەر لەسەرەتاوە دەوڵەتێکی مەشروتە بوو.

بەڵام تەنانەت هۆبزیش بەپێچەوانەی تەفسیرە باوەکانەوە چەند سنورداریێتیەکی بۆ دەوڵەت دادەنا. ئەگەر کتێبەکەی بەقوڵتر بخوێنینەوە،

دەتوانین ئەم سنوردارێتیانە دیاریبکەین. لە روانگەی هۆبزەوە تاك خاوەن دوو زنجیرە مافە کە دەوڵەت دەبێت ڕێزیان لێبگرێت. یەکێکیان ئەوەیە دەوڵەت ناتوانیٚ مافی ژیانی تاك پێشێل بکات. هۆبز دەنوسیٚ «ئامانجی گوێڕایەڵی، پاراستنە» لە روانگەی هۆبزەوە نەك مافی زیندوو بوون، بەڵکو مافی خاوەندارێتی بەرهەمەکانی گوزەرانی ژیان: وەك دەستگەیشتن بە کەرەسەی خۆراك و ئاو و دەرمانیش، دەگرێتەوە.

«ئەگەر فەرمانڕەوا فەرمان بەکەسێك بدات، ئەگەرچی دادپەروەرانە مەحکومکرابێت ، خۆی بکوژیٚ یان بریندار یان کەمئەندام بکات، یان لەبەرامبەر هێرش و زەبری کەسانی دیدا، بەرگری نەکات، یان لە بەکارهێنانی خۆراك، هەوا، دەرمان یان هەر شتێکی دی کە بۆ بەردەوامی ژیان پێویستە دەستهەڵگریٚ، ئەو تاکە مافی سەرپێچی کردنی هەیە.

ئەگەر تاکێك لەرووی تاوانێکەوە کە ئەنجامی داوە، لەلایەن فەرمانڕەوا یان نوێنەرەکەیەوە لێکۆڵینەوەی لەگەڵ بکرێت، ئەو تاکە بیٚ دڵنیابوون لە بەخشین و عەفوو، ناچار نیە دان بە تاوانەکەیدا بنێت...چونکە ناتوانریٚ بە ڕێکەوتن و پەیمان هیچکەس ناچار بکات خۆی تاوانبار بکات».

ئەم مافە تایبەتیە سنوردارێتیەکی پۆزەتیڤ بۆ دەسەڵاتی فەرمانڕەوا دروستدەکات.

لە روانگەی هۆبزەوە تاکەکان خاوەن چەندان مافی نیگەتیڤیشن، واتە ئەو مافانەی کە لەحاڵەتی بێدەنگبوونی یاسادا موڵکی تاکەکەسن: «ئازادیەکانی دی پەیوەندی بە بێدەنگبوونی یاساوە هەیە. لەحاڵەتێکدا کە فەرمانڕەوا هیچ یاسایەکی دانەناوە، تاك دەتوانێت بەپێی بڕوای و دیاریکردنی خۆی کار بکات». گرنگتر لەهەموو ئەمانە ئەوەیە لای هۆبز گوێڕایەڵیش سنوری هەبوو: «گوێڕایەڵی خەڵکی لە فەرمانڕەوا تا کاتێك بەردەوام دەبێت کە هێشتا فەرمانڕەوا توانای پێویستی بۆ پارێزگاریکردن لە خەڵك هەبێت، چونکە تاکەکان بەشێوەیەکی سروشتی خاوەن مافی پارێزگاریکردنن لە خۆیان و کاتێکیش هیچ کەسێکی دی ناتوانیٚ پارێزگاریان لێبکات، ناتوانریٚ مافی ناوبراو بەهیچ پەیمان یان ڕێکەوتننامەیەك بە کەسێکی دی بسپێرێت».

کین دەڵێت «بەهیچ شێوەیەك هۆبز لایەنگری بەکارهێنانی بیٚ قەید و شەرتی دەسەڵات نەبوو. بەبڕوای ئەو فەرمانڕەوا دەبێت دەسەڵاتی خۆی بەپێی «یاسا سروشتیە» گشتی و هەمەکیەکان بەکاربهێنیٚ، یاساگەلێك کە سەندنی ژیان و ئامرازەکانی گوزەرانی ژیان، قەدەغە دەکات. راستە هۆبز دان بە بوونی بوارێکی تایبەتیدا دەنێت لەناو کۆمەڵگای مەدەنیدا..بوارێك کە تاکەکان دەتوانن تیایدا هەندێك ئازادی نیگەتیڤیان هەبێت». بەڵام سەرەرای ئەم تێڕوانینانە، کین بەو دەرئەنجامە دەگات کە ئەم سنوردارێتیانە بۆ دەسەڵات زۆرتر روکەشین، تا واقعی. لە روانینی کۆیندا هۆبز ئارەزووی دەوڵەتێکی ئاسایشی دەکات.

کین بەپێی پێویست بەها بۆ ئەو سنوردارێتیانە دانانیٚ کە بنەمای پەیمانی کۆمەڵایەتی و یاسای سروشتی بۆ «مرۆڤی دروستکراوی» دروستدەکەن. لەلایەکەوە دەتوانریٚ بگوتریٚ کە لەبەرئەوەی تاکەکان بۆ دروستکردنی دەوڵەتێك لەیەك کۆدەنەوە، خودی ئەم مەسەلەیە ئاشکراکەری چاوەڕوانی تایبەتیە لەبارەی ئەرکەکانی فەرمانڕەواوە. لە دیدی تیوریزەنانی پەیمانی کۆمەڵایەتیدا، ئەرکی دەوڵەت دروستکردنی فەزایەکی یاسارێژکراو بوو بۆ

بەدیهاتنی راستەقینەی مافە سروشتیەکان. ئێستا لەو روەوە کە ئەم مافانە ئەوەندە گرنگن کە بۆ بەدیهاتنیان تاکەکان دەستبەرداری چەند ئازادیەکی دی دەبن کە لەدۆخی سروشتیدا هەیانبوو، کەوابوو دەبێت فەرمانڕەوا رێز لەم مافامە بگرێت. ئەم مافانە پێش دەوڵەت کەوتوون و هەر لەبەرئەمەش دەبێت رێزیان لێبگیرێت. ئەگەر دەستدرێژیش بکرێتە سەر ئەم مافانە، دەکرێ دژی دەوڵەت بەکاربهێنرێن. لەراستیدا مافەکانی تاکەکان بووە بە ئەرکی فەرمانڕەوا و دەسەڵاتی فەرمانڕەوا سنوردار دەکات. دەوڵەتی ئاسایش هۆبز، بەهیچ شێوەیەك بێ قەید و شەرت نیە، بەڵکو دەوڵەتێکی سنورداره.

تێکەڵکردنی کۆمەڵگای مەدەنی و کۆمەڵگای سیاسی لە تیورەکانی پەیمانی کۆمەڵایەتیدا، بەئاشکرا دیارە. چونکە کۆمەڵگای مەدەنی و کۆمەڵگای سیاسی هەردوکیان پێکەوە لەبەرامبەر دۆخی سروشتیدا رادەوەستن. کۆمەڵگای مەدەنیش نەك لە بەرامبەر کۆمەڵگای سیاسیدا، بەڵکو لەگەڵیدا گونجاوە. لەو تیورانەدا جیاکردنەوەی کۆمەڵگای مەدەنی و سیاسی لەیەکدی بەشێوەیەکی شاراوە و ئاماژەپێکردنە، چونکە تاك خاوەن مافی سەربەخۆ لە فەرمانڕەوایە. تاکی خاوەن ماف لە فەزایەکدا دەژی کە تارادەیەك سەربەخۆی لە دەسەڵاتی سیاسی هەیە. ئەم فەزایە کۆمەڵگای مەدەنیە. ئاشکرایە کە چۆن دەسەڵاتی سیاسی لە بواری مەدەنی کە فەزای تایبەتی ئەم مافانەیە، جیادەبێتەوە. ئەوەی پەیوەندی لەنێوان دۆخی سروشتی، دروستکردنی کۆمەڵگای مەدەنی و کۆمەڵگای سیاسیدا و جیابونەوەی شاراوەی کۆمەڵگای مەدەنی و سیاسی لەیەکدی، دروستدەکات،چەمکی مافی سروشتی هەمیشەیی و قابیلی دەستدرێژی نەکردنە. لە دواجاردا کۆمەڵگای سیاسی بەهۆی کۆمەڵگای مەدەنیەوە سنوردار دەکرێت. کۆمەڵگای مەدەنی فەزای هاوڵاتیانی خاوەنداری مافە. بەمشێوەیە چەمکی دۆخی سروشتی کە دروستکراوی زیهنی بیریارانی پەیمانی کۆمەڵایەتیە، دوو دەور دەبینێ: لەلایەکەوە ئاراستەی پێویستی بوونی فەرمانڕەوایەکی دەسەڵاتدار دەکات و لەلایەکی دیەوە بەهۆی مافە سروشتیەکانەوە، سنورێك بۆ دەسەڵاتی ئەم فەرمانڕەوایە دروستدەکات.

هەرچەندە ناکرێت بیریارانی پەیمانی کۆمەڵایەتی بە وردی بە بیریارانی کۆمەڵگای مەدەنی دابنرێن، بەڵام دەکرێت ناوەڕۆکە سەرەکیەکانی شکڵبەندی لیبڕالانەی دوای لەبارەی کۆمەڵگای مەدەنیەوە، لە تیورەکانی پەیمانی کۆمەڵایەتیدا بدۆزرێتەوە. یەکێك لەم ناوەڕۆکانە چەمکی تاکی خۆویستە کە بە دوای بەرژەوەندیەکانی خۆیدا دەگەڕێت. لە راستیدا مەك فرسۆن بڕوای وایە کە هۆبز یەکەم و بەرجەستەترین وتەبێژی تاکگەری نوێ بوو. تاکگەریش شتێك بوو کە دواتر بوو بە پێشگریمانە بنەڕەتیەکانی بیرۆکەی کۆمەڵگای مەدەنی. چونکە چەمکی سەربەخۆیی، و باڵادەستی تاکی عەقڵانی و هوشیار، بناغەی داواکاری بەدەستهێنانی سەربەخۆی لە دەوڵەتی پێکدەهێنا.

ناوەڕۆکێکی دی ئەو بیرۆکەیە بوو کە تاك خاوەن کۆمەڵێك مافە کە ئەم مافانە پێش دەوڵەت کەوتون و سەربەخۆییان لە دەوڵەت هەیە. لێرەدا گرنگترین مەسەلە، بیرۆکەی پیرۆزی موڵکایەتی تایبەتیە کە لۆك ئاماژەی بۆ کردووە. لە راستیدا لۆك مەسەلەیەکی هێنایە پێشێ کە بوو بە یەکێك لە تەوەرە سەرەکیەکانی لیبڕالیزم: بناغەی هەرجۆرە

ئازادیەك بریتیە لە مافی موڵكایەتی و گواستنەوەی دارایی. مافی موڵكایەتی لەگەڵ ئازادیدا یەكسان كراوە و لە راستیدا بووە بە بناغەی هەرجۆرە مافێك.

سێهەم ناوەڕۆك كە بیریارانی پەیمانی كۆمەڵایەتی بۆ بیرۆكەی كۆمەڵگای مەدەنیان زیادكرد، ئەوە بوو كە پەیوەندی تاكەكان بەیەكەوە و پەیوەندی تاكەكان بە دەوڵەتە، پەیوەندیەكی پەیمانئاسایە. ئەوان مۆدێلێكیان بۆ مامەڵەی كۆمەڵایەتی لەنێوان تاكەكان و لەنێوان تاك و دەوڵەتدا پێشكەشكرد.

چوارهەمین یارمەتی بیریارانی پەیمانی كۆمەڵایەتی هێنانە ئارای چەمكی حكومەتی سنوردار بوو، حكومەتێك كە لەلایەكەوە بەهۆی ئەو مەسەلەیەوە سنوردار دەكرا كە مەخلوقی مرۆڤ بوو، لەلایەكی دیەوە بەهۆی ئەوەوە كە ئەركی سەرەكی بریتی بوو لە پارێزگاریكردن لەو مافانەی كە تاك لە دۆخی سروشتیەوە لەگەڵ خۆی هێنابووی. بیریارانی سەرەتای تازەگەری لەلایەكەوە بە كردنی تاك بە گرنگترین رەگەزی گوتاری سیاسی و لەلایەكی دیەوە بە هێنانە پێشێی ئەو مەسەلەیەی كە بواری مەدەنی بواری هاوڵاتیانی خاوەن مافە،چوارچێوەی پێویستیان بۆ گوتارێك ..بۆ گفتوگۆیەك پێكهێنا كە جێگەی یەكەمی بە تاك داوە و بڕوای بە توانای تاكە بۆ هەڵبژاردنی چارەنوسی خۆی. تیورەی سیاسی لە شێوە مۆدیرنەكەیدا چەمكی دەوڵەتی وەك خاوەنی كۆی مافەكان رەدكردەوە و ئەم مافانەی بۆ تاك گواستەوە. بیریارانی پەیمانی كۆمەڵایەتیش یەكەم بنەماكانی ئەم شكڵبەندیەیان، بەرپاكرد.

لەگەڵ ئەمەشدا تیۆرەی بناغەدانەرانی پەیمانی كۆمەڵایەتی، چەند كێشەیەكی مێژوویی هەیە. هۆبز و لۆك لەبری تیۆرەی مافی خودایی فەرمانڕەوا، تیۆرەی مافی سروشتیان هێنایە پێشیّ، بەڵام خودی فەرمانڕەوا لە ناوەندی تیۆرەكەیاندا مایەوە. لەروانگەی ئەوانەوە كۆمەڵگا توانای خۆبەڕێوە بردنی نیە و لەراستیدا پەیدابوون و مانەوەی كۆمەڵگا پەیوەندی بە لڤیسان و فەرمانڕەواوە هەبوو. بیریارانی پەیمانی كۆمەڵایەتی بەئاشكرا بەدبین بوون بە توانای كۆمەڵگا بۆ بەڕێوە بردنی خۆی. لەراستیدا پێویستی بوونی دەوڵەت وەك دەزگایەكی سیاسی رێكخراو ، لە رخنەگرتنێكی قوڵەوە لە كۆمەڵگا سەرچاوە دەگرێت. بیّ فەرمانڕەوایەكی بەهێز، كۆمەڵگا توشی كێشە و چەرمەسەری دەبێت. تاكەكانی ئەم كۆمەڵگایە پێڕەوی پرۆژەیەكی خۆدروستكردنی بەربڵاو بەمانا هیگڵیەكەی نین . واتە گواستنەوە لە بەرژەوەندی لاوەكیەوە بۆ بەرژەوەندی گشتی. «هۆبز...هیچ چاوەڕوانیەكی ئەخلاقی یان عەقڵانی مەزنی لەبارەی سودوەرگرتنی تاكەكانەوە لەبارەی ئازادیەوە، لەسەردا نەبوو». بیریارانی پەیمانی كۆمەڵایەتی تاكی گوشەگیریان هێنایە ناو كۆمەڵگاوە، بەڵام چەمكسازی لەبارەی ئەم پرۆژەیە، واتە لەبارەی توانا و ماهیەتی خودی كۆمەڵگاوە، بە لیرالیەكانی دوایی سپێررا.

هەرچەند بیریارانی پەیمانی كۆمەڵایەتی رونكردنەوەی عەقڵانی و قانعكەرانەیان لەبارەی دەوڵەت و كۆمەڵگاوە پێشكەشكرد، بەڵام هەوڵەكانیان خەسڵەتێكی شەخسی هەبوو. دەكریّ یەكەمین و گرنگترین مەسەلەی تیۆرەكانی پەیمانی كۆمەڵایەتی بە شێوەی چەمكسازی یاسای سروشتی و مافی سروشتی بزانرێت.لەروانگەی هۆبز و لۆكەوە مافی سروشتی لە یاسای سروشتیەوە سەرچاوە دەگرێت. بەپێی تەفسیری كەسانی وەك

جان دانیش لەروانگەی لۆکەوە ئەم یاسا سروشتیە دەرکەوتێکی زاتی خوداوەندە. جان گری بە قبوڵکردنی ئەم تەفسیرە دەنوسێت:

«لەروانگەی لۆکەوە مافە سروشتیەکان هەڵگری هەلومەرجێکن کە بۆ پارێزگاریکردن لە پاراستنی ژیانی خود، پێویستمان بە بناغەی یاسا سروشتیە خودا پێدراوەکانە. بە پێی ئەم یاسایانە ئێمە مافی ئازادی و موڵکایەتیمان هەیە و هیچ کەس ناتوانێ پیشێلیان بکات، بەڵام لەبەرئەوەی ئێمە موڵکی خوداین، کەوابوو ناتوانین بەشێوەیەکی کامڵ و هەمیشەیی دەستبەرداری ئازادی خۆمان بین...یان لەرێگەی خۆکوشتنەوە کۆتایی بە ژیانمان بێنین. ..ئەم دەزگا فکرییە کە تیایدا مافە لیبراڵیەکانی موڵکایەتی لە چوارچێوەی خواناسی مەسیحیدا رەوایەتی وەردەگرێ، لە ئینگلتەرادا تا سێ سەدە پاش بڵاوبونەوەی بەرهەمە سیاسیە سەرەکیەکانی لۆك، لەگەڵ لیبرالیزمدا، تیکەڵبوو بوو».

بیریارانی یاسای سروشتی بڕوایان وابوو بەم بیرۆکەیە کە تاکەکان بە پێی یاسای سروشتی خاوەن مافی تایبەتین، دەتوانن بەرەنگاری دەسەڵاتی رەها ببنەوە، ئەم یاسایەش لایەنیکەم لە روانگەی لۆکەوە خودا پێدراوانە بوو. بەڵام بیریارانی یاسای سروشتی ئەم یاسایەیان بە «بەڵگەنەویست و بەدیهی» دەزانی. ئەم یاسایە تایبەت بە کۆمەڵگایەکی دیاریکراو نەبو، بەڵکو بەشێك بوو لە مرۆڤایەتی هەر تاکێك. قبوڵکردنی چەمکی یاسایی سروشتی سەرچاوە لە باوەڕێکی بێ چەند و چونەوە بە جۆرێك لە تێزی نامێژوویی لەبارەی یاسای سروشتیەوە، دەگرێت. چەمکەکانی یاسا و ماف، چەمکی دڵخوازانەن، چونکە دروستکراوێکی زیهنین.

تیۆرەکانی پەیمانی کۆمەڵایەتی لەلایەکی دیشەوە خەسڵەتێکی شەخسی و دڵخوازانەیان هەبووە. پێویستی بوونی کۆمەڵگای مەدەنی و دەوڵەت لە وێنایەکی گریمانەی و تێڕوانینێکی تیۆریەوە بۆ ماهیەتی مرۆڤ سەرچاوە دەگرێت. ئەم تێڕوانینەش لە تیۆرەیەکەوە بۆ تیۆرەیەکی دی دەگۆڕرا. بڕوابوون بە سەرچاوەی خودایی ئەم یاسایە و بە کۆمەڵگا و دەوڵەتێکی دروستکراو و ساختە پاش ماوەیەکی کەم جێگەی خۆیدا بە رونکردنەوە «زانستیەکان» لەبارەی پەرەسەندنی کۆمەڵگا مرۆڤایەتیەکانەوە. بەمشێوەیەش فەلسەفەی تیۆری جێی خۆی دا بە «زانست» کە تیایدا جێگەیەك بۆ چەمکی یاسای خودای ئەبەدی و نەگۆڕ نەبوو.

سەرئەنجام ئەم تێڕوانینە تایبەتە لەبارەی دەوڵەت و شکڵگیری کۆمەڵگاوە نەك تەنها تێڕوانینێکی شەخسی و دڵخوازانە بوو، بەڵکو نامێژوییش بوو. ئەم تێڕوانینە لەو روەوە نامێژووی بوو کە ئەو دەوڵەت و کۆمەڵگایەی دروستدەکرا لەڕووی شوێن و زەمەنەوە جێگەیەکی دیاریکراوی نەبوو. رونکردنەوەی مێژووی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی پێویستی بە تێڕوانینێکی وردتر هەیە، تێڕوانینێك کە لەرووی مێژووییەوە بتوانێ دەوڵەتەکان لەناو جەرگەی کۆمەڵگا دیاریکراوەکاندا دابنێت. ئەم تێڕوانینە بۆ لێکۆڵینەوەی پەرەسەندنی کۆمەڵگاکان و دەوڵەتە جیاوازەکان و رونکردنەوەی جیاوازیەکانیان پێویست بوو. ئەم تێڕوانینە کە هەم ورد بوو و هەم سەرنجی لە مێژوو دەدا، بەهۆی ئابوری سیاسی کلاسیکییەوە پێشکەشکرا. وەك دواتر دەبینین ئابوری سیاسی کلاسیك زانستی لەبری فەلسەفەی تیۆری و بیرۆکەی وابەستەی تاکەکان بە پلەی

پەرەسەندویی مێژوویی کۆمەڵگاوە لەبری بیرۆکەی وابەستەی مافەکانی تاك بە یاسایەکی سروشتی ئەبەدی و جیهانیەوە، دانا.

## ئابوری سیاسی کلاسیك و کۆمەڵگای مەدەنی

قوتابخانەی ئابوری سیاسی کلاسیك کە لە سەدەی هەژدەدا پەیدابوو، بەرهەمی سەردەمی رۆشنگەری بوو، هەر لەبەر ئەمەش تەحەدای کۆی چەمکسازیە باوەکانی لەبارەی کۆمەڵگا و دەوڵەتەوە دەکرد. کلارك دەڵێت:

«بزوتنەوەی رۆشنگەری بنەما سەرەکیەکانی رەوایەتی سیاسی و ئەخلاقی لە رژێمی دەسەڵاتی رەها، بە راشکاوی خستە ژێر پرسیارەوە. بزوتنەوەی رۆشنگەری لەبری خوداوەند، عەقڵ و سروشتی بە بنەمای رێنمایکەری سیستەمی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی دانا، لەبری وەحی ئیلاهی، لیکۆڵینەوەی زانستی بەسەرچاوەی هەقیقەت دانا و لەبری قەشە و فەیلەسوفان، زانایانی بە مەرجەعی دیارکردنی راست و ناڕاست دانا».

بزوتنەوەی رۆشنگەری بە باوەڕهینان بە عەقڵی مرۆڤ و بە پشتبەستن بە یاسارێژی دنیای کۆمەڵایەتی وەك دنیایی فیزیایی، ژیانی کۆمەڵایەتی بەسەربەخۆ لە زیهن و بیری مرۆڤ دانا. لە روانگەی بیریارانی رۆشنگەریەوە ئەرکی زانست و زانین ناسینی ژیانی کۆمەڵایەتی بوو لە رێگەی عەقڵی مرۆڤەوە. دەستگەیشتن بە زانینی و ناسینی جێی بایەخیش لەبەرئەو هۆیەوە مومکین بوو کە دنیا یاسارێژ بوو. هۆی بوونی زانستە کۆمەڵایەتیەکان، دۆزینەوەی ئەم یاسایانە بوو. زانستە تازەکان تاڕادەیەکی زۆر بەدوای دۆزینەوەی هەقیقەتی شاراوە لە پشت دیاردە ئاشکراکانەوە بوون. لە زانستە تازەکاندا هەوڵێکی زۆر بۆ دۆزینەوەی شێوازە ئاڵۆزەکان و دوبارە بیرلێکراوەکان بۆ ئەنجامدانی ئەم ئەرکە درا، لەبەرئەوەش کە ناسین موکین بوو بەهەمان ئەندازە دەستگەیشتن بە زانستێکی بایەخدار کە بتوانێت دەستبکات بە شیکردنەوە و پێشبینی ورد، مومکین بوو. لەسەر ئەم بناغەیە زانستە کۆمەڵایەتیەکان دەیانتوانی بە هاوکاری ئەم ئامرازە دوبارەلێکراوانەوە، دەست بە شیکردنەوە و سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی مێژوو بکەن و پێشبینی رەوتی شێمانەی کۆمەڵگا مرۆییەکان بکەن.

بەپێچەوانەی فەلسەفەی تیۆریەوە، ئابوری سیاسی بانگەشەی زانستیبوونی دەکرد. ئابوری سیاسی تێڕوانینێکی مێژووی وردی لەبری تیڕوانینە هەبوەکان لەبارەی خاڵی دەرچوونی دەوڵەتەکان و کۆمەڵگاکانەوە، هێنایە پێشێ. ئەم تێڕوانینە چیدی پێویستی بە وێنای گریمانەیی یان بەم بیرۆکەیە نەبوو کە یەك یاسای سروشتی گەردونی بەسەر هەموو مرۆڤەکاندا لە هەموو قۆناغە مێژویەکاندا، حوکمدەکات. ئەم تێڕوانینە دەیتوانی دەست بە شیکردنەوە، پێشبینی و وێنەکردنی کۆمەڵگای جێی مەبەست ، لەسەر بنەمایەکی دی بکات کە زۆرتر سەرنجی لەسەر مێژووە.

زانایانی ئابوری سیاسی کلاسیك لە ژێر کاریگەری دیدی رۆشنگەریدا، گۆڕانێکی بەرجەستەیان لە میتۆدلۆجیا و شێوازی ناسینی کۆمەڵگاکاندا، دروستکرد. تێڕوانی ئەم ئابوریناسانە پوختەی تێڕوانینی نوێگەری بوو کە بەپێی ئەم تێڕوانینە کۆمەڵگا مرۆییەکان بەپێی یاساگەلێکی بنەڕەتی دەچنە پێشێ کە سەربەخۆن لە خواست و ئیرادەی مرۆ ڤ. ئەم ئابوریناسانە بڕوایان وابوو روداوە مێژووییەکان نە بەرهەمی یاسا خواییەکان، و نە بەرهەمی مەبەستەکانی

مروڤن. ئادام فرگسۆن دەیگووت «تەنانەت لەسەردەمی رۆشنگەریدا هەر جوڵەیەك كە لە كۆمەڵگایەكەوە بكرێت، بە یەك ئەندازە هاوڕێی بێ ئاگاییە لە ئایندە. نەتەوەكان بێ ویستی خۆیان كۆمەڵگا گەلێك پێكدەهێنن كە لە راستیدا بەرهەمی كاری مروڤە، بەڵام بەرهەمی هیچ پرۆژەیەكی مرۆیی لەپێشەوە دیاریكراو نیە».ئەركی زانستە كۆمەڵایەتیەكان دۆزینەوەی ئەو یاسایانەیە كە بەسەر پەرەسەندنی كۆمەڵگا مرۆییەكاندا، فەرمانڕەوان.

گەڕان بەدوای ئەم یاسایانەدا بووە هۆی ئەوەی زانایانی ئابوری سیاسی كلاسیك بەرەو تێڕوانینێكی مادیانە بۆ مێژوو بڕۆن. بەپێی ئەم قوتابخانەیە كۆمەڵگاكان لەرێگەی ئەوەوە كە (میك) بە «چوار قۆناغ»ی پەرەسەندنی ناو دەنێ (راوچێتی، ئاژەڵداری، كشتوكاڵی و بازرگانی)، بە پێشكەوتن و پەرەسەندن دەگەن. كۆمەڵگای بازرگانی پیشاندەری دواهەمین یان كامڵترین قۆناغی پەرەسەندنی رەگەزی مروڤە. دەبێ بۆ هۆكانی گواستنەوە لە قۆناغێكەوە بۆ قۆناغێكی دی، بەدوای گۆڕانكارییە مادییەكاندا بگەڕێین، چونكە هەر قۆناغێك دەبێتە هۆی پەیدابوونی دابەشبوونی كاری ئاڵۆز كە دەبووە هۆی پێشكەوتن و جیابونەوەی كۆمەڵایەتی. ئەم مەسەلەیە دەستكەوتی كۆمەڵایەتی زیاد دەكرد و جوڵەی بەرەو قۆناغێكی پێشكەوتوتر، مومكین دەكرد.

شێوازی بەرهەمهێنان نەك هەر بە گرنگترین هۆكاری دیاریكردنی هەر قۆناغێكی پەرەسەندنی كۆمەڵگا، بەڵكو بە هۆی دەستنیشانكەری مۆڵكایەتی، حكومەت، بنەمای ئەخلاقی و دەزگا كۆمەڵایەتی و سیاسیەكانیش دادەنرا. رێكخستنی مادی كۆمەڵگا واتە شێوازی بەرهەمهێنان و ئاڵوگۆڕ و دابەشكردنی كاڵا لەناو كۆمەڵگادا دەبووە هۆی پەیدابوونی خەسڵەتە كۆمەڵایەتیەكان و بنەما ئەخلاقیە گونجاوەكان. لێرەوە تێڕوانینی مادیانە بۆ مێژوو بۆ ناسینی ژیانی كۆمەڵایەتی و دەستكەوتەكانیان لەبوارە ئەخلاقی، كۆمەڵایەتی، كلتووری و شارستانیەكاندا، پێویست بوو. بە دەربڕینێكی دی دەكرێ هەر قۆناغێك لە پەرەسەندنی كۆمەڵگایەك بەپێی رێكخستنی سیستەمی بەرهەمهێنان و دابەشكردنی ئەو كۆمەڵگایە، بناسرێ و هەڵسەنگێنرێ.

ئێستا گەر كۆمەڵگاكان قۆناغگەلێك لە پێشكەوتنی ئابوری، كۆمەڵایەتی و ئەخلاقی بەجێهێشتووە، و هەریەك لەم قۆناغانەش پێشكەوتوترە لە قۆناغەكانی پێشوو، كەوابوو دەكرێ كۆمەڵگاكان بەپێی ئەو قۆناغەی كە تێیدان، پۆلێن بكرێن. ئابوری سیاسی كلاسیك وەك تێڕوانینێكی نوێ بۆ كۆمەڵگا نەك هەر زانستێكی لەبارەی كۆمەڵگاوە دروستكرد، بەڵكو لەسەر ئەو گریمانەیە بوو كە ئەم زانستە سروشتگەلێكی گەردوونی دروستكردووە. عەقڵ،پێشكەوتنی مادی و پێشكەوتنی ئەخلاقی پۆلێنكراون و كۆی ئەم پێوەرانە لە چەمكی كۆمەڵگای مەدەنیدا، كۆدەكرێنەوە. بە دەربڕینێكی دی چەمكی كۆمەڵگای مەدەنی بوو بە پێوەرێك بۆ هەڵسەنگاندنی پلەی پێشكەوتنی كۆمەڵگاكان. رەنگە جێی سەرسوڕمانیش نەبێت كەئەم شتە باشانەیان لە كۆمەڵگاكانی رۆژئاوادا بینی. لێرەوە كۆمەڵگای مەدەنی بوو بە ئامێری هەڵسەنگاندنی پێشكەوتن و پەرەسەندن و كەسانی وەك ئادام فرگسۆن ئەو دەرئەنجامەیان وەرگرت كە كۆمەڵگا پیشكەوتوەكان خاوەن كۆمەڵگای مەدەنین، بەڵام كۆمەڵگا سەرەتاییەكان خاوەنی نین.

ئالێرەدا وەرچەرخانێکی مێژووی سەرنج ڕاکێشەر دەبینرێت. کۆمەڵگای مەدەنی چیدی خاڵی بەرامبەر دۆخی سروشتی نیە (بەو شێوەیە کە بیریارانی پەیمانی کۆمەڵایەتی وێنایان دەکرد) بەڵکو خاڵی بەرامبەر دیسپۆتیزمی ڕۆژهەلاتی و ڕۆژئاوایی و فیودالیزمە. کۆمەڵگا سەرەتاییەکان لەژێر دەسەلاتی ستەمکاراندا دەژین و بەلام کۆمەڵگا مەدەنیەکان فەزایەك بۆ رکەبەرایەتی ئازاد و مامەڵەی کۆمەلایەتی ئاشتیانە، دەخولقێنن. لە روانگەی ئابوریناسانی سیاسی کلاسیکەوە، کۆمەڵگا پێشکەوتوەکان ئەو بەشە لە کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکانن کە گەیشتونەتە قۆناغی گەشەکردنی بازرگانی.

لێرەوە ئابوریناسانی سیاسی کلاسیك بە پێچەوانەی دامەزرێنەرانی پەیمانی کۆمەلایەتیەوە، کۆمەڵگای مەدەنیان بە دیاردەیەکی دروستکراو نەدەزانی و بڕوایان وابوو کە پێشکەوتن و پەرەسەندنی کۆمەڵگاکان دەبێتە هۆی پەیدابوونی کۆمەڵگای بازرگانی. لە راستیدا لە روانگەی ئەوانەوە کۆمەڵگای مەدەنی دواهەمین و پێشکەوتوترین قۆناغی مێژوویی بوو کە باسی قۆناغێکی بالاتری پەرەسەندن و پێشکەوتنی دەکرد. بۆ نمونە فرگسۆن لەکتێبەکەی خۆیدا لەبارەی مێژووی کۆمەڵگای مەدەنیەوە، پەرەسەندنی کۆمەڵگای لە شێوە سەرەتاییەکانی مامەڵەی مرۆییەوە بۆ قۆناغێکی بەرزتری پێشکەوتنی تاوتوێکردووە. فرگسۆن بەڵگە دێنێتەوە کە کۆمەڵگای مەدەنی هاوڕێی پێشکەوتنە ئەخلاقی و کلتوریەکان، دابەشبوونی کاری ئالۆز، پابەندبوون بە یاسایە.ئادەم فرگسۆن بە روونی وێنەی کۆمەڵگای بازرگانی دەکێشا. ئەم کۆمەڵگایە دەرخەری دواهەمین و کاملترین قۆناغی پەرەسەندنی مرۆڤ بوو. لە روانگەی فرگسۆنەوە «بەگشتی پەیدابوونی حکومەتی یاسا و پێشکەوتنی یاسا و بەرهەمهێنانی پیشەسازی دەبێتە هۆی جموجوڵ لە کۆمەڵگا مەدەنیە تازەکاندا. لەم سەرەدەمی جیابونەوەیەدا جۆرێك زیندووی و ڕۆحی مەزنی داهێنان هەیە کە پێشتر لە سەرەدەمی وەحشیەت (ئاژەڵداری) و سەردەمی بەربەریەتدا (شوانی و کشتوکاڵیدا) نەبوو». ڕێك لەم روانگەیەوەیە کە دەکرێت لەو وتەیەی مارکس بگەین کە دەڵێت لەبەرهەمەکانی ئابوریناسانی سیاسی کلاسیکدا سەرمایەداری تەنها خاوەنی مێژووی رابردووە نەك مێژووی داهاتوو. لەم روانگەیەوە سەرمایەداری لوتکەی هەوڵ و پێشکەوتنی مرۆڤ بوو.

ئەم تێڕوانینە بۆ مێژوو و ئەم بڕوایە کە کۆمەڵگا بەپێی یاسا و پرۆسەی سەربەخۆ دەجولێت، دەرئەنجامی قولی بۆ شیکردنەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگا هەبوو. ئەم تێڕوانینە بووە هۆی جیابونەوەی تیوری و سیاسەت، بڵندتر بوونی کۆمەڵگای مەدەنی و دواجار دابەزینی گرنگی سیاسەت. ئەم مەسەلانە دواتر بوون بە تەوەرەی سەرەکی زۆرێك لە تیورە لیبراڵیەکان.

## سەرچاوە

بەشێکە لە سێهەم فەسلی ئەم کتێبەی خوارەوە:
نیرا چانۆك: جامعه مدنی و دولت. ت: فریدون فاتمی\
وحید بزرگی. تهران، نشر مرکز چاپ اول1377

# سەرهەڵدانی چەمکی کۆمەڵگەی مەدەنی

د. برهان غلیون
لە عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد

## بنەمای چەمکی کۆمەڵگەی مەدەنی و بەکارهێنانەکانی

لێرەدا هیچ چەمکێکی جێگیر و دیاریکراو نییە کە لە هەموو کات و شوێنێکدا قابیلی بەکارهێنان بێت، تەنانەت ئەو چەمکانەیش کە پێمان وایە چەمکی جێگیر و هەتاهەتایین. لە راستیدا "چەمك" بەندە بە مێژووی سەرهەڵدانەکەی، واتە بەندە بەو گرفت و کێشانەی لە چرکەساتی سەرهەڵدانیدا هاتوونەتە ئاراوە، هەروەها "چەمك" بەندە بەو ئیشکالیەتە تیۆرییانەی یاوەریی ئەو گرفتانەیان کردووە، واتە بەندە بە جۆری ئەو ئەرگۆمێنتە فیکرییەی لە بارەی گیروگرفتەکانەوە خراوەتەڕوو و هەروەها ئەو شێوازەی کە لە میانیەوە رۆشنبیران بەرەنگاریی کێشەکان بوونەتەوە. بەکورتی "چەمك" بە پێویست لەدایکبووی ژینگەیەکی مێژوویی و کۆمەڵایەتیی دیاریکراوە و هەروەها زادەی فیکرێکی دیاریکراویشە. پاشان چەمکەکان تەنها لە تیۆرییەوە و لە میانی بیرکردنەوەوە لەدایك نابن، واتە چەمك و تیۆر بەشێوەیەکی لۆجیکی و ماتماتیکی یەکتر بەرهەم ناهێنن، بەڵام لە دەرکەوتن و پەرەسەندنیاندا پەیوەستن بە ململانێی کۆمەڵایەتییەوە، واتە پەیوەستن بە جۆرێك لە بەکارهێنانی ستراتیژی. لێرەدا هیچ چەمکێك نییە ئەوەندەی چەمکی "کۆمەڵگەی مەدەنی" ئەو سێ فاکتەرەی بەسەردا پراکتیك ببێ و وای لێبکات ببێت بە چەمکێکی زۆر دینامیکی و گۆڕاو و لە هەمان کاتدا مانا و لێکدانەوەی جیاواز جیاوازی هەبێت.

بەڵام بۆ ئەوەی ئەم بابەتە لە زەینەوە نزیك بکەینەوە، دەتوانین ئەم بەکارهێنانە جیاجیایانە کورت بکەینەوە و لە چوار بەکارهێنانی جیاوازدا کۆیان بکەینەوە کە هەریەکەیان، لە سەرەتای سەرهەڵدانی ئەم چەمکەوە تا ئەمڕۆ، هاوشان لەگەڵ چەمکەکەدا رۆیشتوون، واتە هەریەکە لەم بەکارهێنانەی خوارەوە یاوەریی چەمکی کۆمەڵگەی مەدەنییان کردووە.

**1–بەکارهێنانی یەکەمی کۆمەڵگەی مەدەنی**

پێچەوانەو دژی چەمکی سروشت و کۆمەڵگەی سروشتییە، کە لەلای هەندێ کەس کۆمەڵگەی سروشتی بریتییە لە کۆمەڵگەی ئاژەڵی یان کۆمەڵگەی باوکسالاری یان کۆمەڵگەی تەقلیدی یان کۆمەڵگەی یەکەمین ئازادی. ئەم بەکارهێنانە لە کۆنتێکستی هەڵوەشاندنەوەی جۆری تەقلیدیی کۆمەڵگەی فیوداڵییەوە سەریهەڵداوە یان لە دەوڵەتی پۆست فیوداڵییەوە کە لەسەر ئایین یان ئیتنیك دامەزراوە و لەوێدا شعورێکی وا گەشە دەکات کە سیاسەت پیشەیە یان پیشەسازییە، واتە سیاسەت چالاکییەکی ئەقڵییە و سەر بەکاری مرۆڤ و کۆمەڵگەیە، لە پشتی ئەم تێڕوانینەشەوە "تیۆری سیاسەتی نوێ" دەرکەوتووە. ئەوسا زۆر پێویست بوو چەمکێکی نوێ هەبێت ئەو مەیلە بەردەوامە پێچەوانە بکاتەوە بۆ دۆزینەوەی شتێك کە دواتر بە "سیاسەتی مەدەنی" ناودەبرێت، واتە ئەو سیاسەتەی گوزارشت لە حەقیقەتی مرۆڤ و سروشتە کۆمەڵایەتی و مەدەنیەکەی دەکات، هەروەها گوزارشت لە تایبەتمەندیی مرۆڤ دەکات لە بەرامبەر ئەو دەرکەوتانەی لە چاخەکانی ناوەڕاستدا باوبوون کە سیاسەت کایەیەکی گشتی و هاوبەش نەبوو بەڵکو پەیوەست بوو بە ئایین و نەریتی ئەرستۆکراتی. بونیادی کۆمەڵگە پێش مۆدێرنەکان لە ڕووی سیاسییەوە لەسەر سێ پلە و پایەی بنچینەیی راوەستا بوو: پیاوانی ئایین و کەنیسە، چینی خانەدان و خاوەن زەوی و زار و فیوداڵیستەکان، پاشان کۆمەڵانی خەڵکی ئاسایی. بەڵام کۆمەڵانی خەڵکی ئاسایی هیچ شوێنێکیان لە سیاسەتدا نەبوو.

گرفتی سەرەکیی ڕۆشنبیرانی سەدەی حەڤدەهەم و هەژدەهەم کە داڕزان و لێکهەڵوەشانی سیستمی کۆمەڵایەتیی فیوداڵیزمیان بینی و لە تەکیدا چینی بورژوازی وەکو چینێکی نوێ گەشەی دەکرد و دەیویست لە چەند تێڕوانینێکی جیاوازەوە سیاسەت بنیات بنێتەوە و ئەو پلەو پایە سیاسییەی پیاوانی ئایین رەت بکاتەوە و بوارێکی نوێ بۆ سیاسەتێکی نوێ بکاتەوە، دەڵێم گرفتی سەرەکیی ڕۆشنبیران لەو کاتەدا بریتی بوو لە سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی سیاسەت کە لەسەر چەند بنچینەیەکی نائایینی و نائەرستۆکراتی دابمەزرێت، واتە سیاسەتێك پابەند نەبێت بە ویستی خواوەندی یان بە میراتی بنەماڵەیی، بەڵکو پابەند بێت بە خودی کۆمەڵگاوە، واتە سیاسەت لەناو هەناوی کۆمەڵگەوە بێتە دەرێ و هەر بۆ ئەویش بگەڕێتەوە. ئێمە لەم خاڵەوە وردە وردە دەگەینە گواستنەوە لە تیۆرییەکی کۆنەوە بۆ تیۆرییەکی تازە، واتە لە تیۆری "هیچ دەسەڵاتێك نییە جگە لە دەسەڵاتی خواوەند و میراتی بنەماڵە" بۆ تیۆرییەکی تەواو پێچەوانە کە دەڵێ "هیچ دەسەڵاتێکی شەرعی نییە جگە لەو دەسەڵاتەی تەعبیر لە دەسەڵاتی میللی و ئیرادەی کۆ دەکات"، ئەمەش بنەمای هەنگاونانە بەرەو مۆدێرنەی سیاسی.

ئاشکرایە چەمکی کۆمەڵگەی مەدەنی لێرەدا شتێك نییە جگە لە چەمکی ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە ئاساییەی دەبێتە بنەمای کۆمەڵبوون لە بەرامبەر پەیوەندیی ئایینی و ئەرستۆکراتی کە دەشێت ئەم دوو پەیوەندییەی دوایی ببەسترێنەوە بە دابونەریت کە گوایە دیاردەیەکی سروشتییە. ئیتر لەوساوە چەمکی کۆمەڵگەی مەدەنی دەبەسترێتەوە بە چەمکی یاسا و پەیمانی کۆمەڵایەتی وەك گوزارشتێك لەو یاسایەی جیاوازە لە دابونەریت و بە دەسەڵاتی میللیەوە گرێ دراوە. ئەم چەمکە نوێیە چەمکی سیاسەتی مۆدێرن

بەرجەستە دەکات بەو سیفەتەی سیاسەتێکە لەناو کۆمەڵگەی بەشەرییەوە هەڵقوڵاوە و لە جیهانێکی ترەوە نەهاتووە.

لەبەرئەوە لێرەدا هەردوو زاراوەی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی بە تەواوی جووتن و لێکدی ناترازێن. دەشێت ئەم ئیشکالیەتە لە یەك رستەدا کورت بکەینەوە: سیاسەتی مۆدێرن سیاسەتێکی مەدەنییە. لەم سیاسەتە مەدەنییەشەوە — بە پێچەوانەی سیاسەتی ئایینی و نەریتەوە — سەرجەم چەمکە نوێیەکانی تر گەشە دەکەن وەك چەمکی: هاوولاتیبوون و دیموکراسیەت و دەوڵەتی یاسا. لێرەوە بەشداریکردنی نووسەرە کلاسیکییە گەورەکانی سەدەی حەڤدەیەم و هەژدەیەمی وەکو هۆبز، جۆن لۆك، توکڤیل، مۆنتیسکیو، جان جاك رۆسۆ، سپینوزا دەردەکەوێ. باشترین کتێب کە ئەم بەکارهێنانە تازەیەی سیاسەتی نوێ و دەوڵەت و کۆمەڵگەی مەدەنی بەرجەستە دەکات، کتێبە ناودارەکەی جۆن لۆکە بە ناوی "پەیامێك لە بارەی حوکمی مەدەنی". دەکرێت ئەمرۆ ئەو کتێبە وەك پەیامێك وەربگرین لە بارەی ماهیەتی سیاسەتی مۆدێرن کە پێچەوانە و دژی جۆرە حوکمکردنێکە سەرچاوە ئایینی و نەریتە ئەرستۆکراتییەکان پشتی پێدەبەستن.

## 2–بەکارهێنانی دووەمی چەمکی کۆمەڵگای‌مەدەنی

لە سەدەی نۆزدەهەمدا برەوی هەبووە، ئەوسا چینی بورژوازی شۆڕشەکەی خۆی گەیاندە ئاستێکی باڵا و سیاسەتی لە کایەی ئایینی و نەریتگەراییەوە گواستەوە بۆ کایەی کۆمەڵایەتی، واتە سیاسەتی کرد بە راستییەکی مرۆیی و پەیمانبەندی. لەوێوە ئیتر گرفتەکە لە چوارچێوەی رزگارکردنی سیاسەت لە ئایین و نەریتی ئەرستۆکراتیدا نەمایەوە، بەڵکو چووە ئاستی بنیاتنانەوەی چەمکی سیاسەتی مۆدێرن و جیاکردنەوەی ئاستە جیاوازەکانی. سیاسەتی مۆدێرن کە پلە و پایە چینایەتییە تەقلیدییەکەی هەڵوەشاندەوە، میللەتی کرد بە یەکەیەکی پتەو، واتە گریمانەی یەکێتی میللەتی هێنایە ئاراوە لە کاتێکدا ئەمانە زۆرینەن و خەڵکانی ئاسایین. شۆڕشی پیشەسازی کۆمەڵگەی لە قۆناغی فیودالییەوە گواستەوە بۆ قۆناغێکی تر، واتە جۆری پەیوەندییە پیشەیی و فیودالییەکانی گۆڕی کە پەیوەندیی نێوان تاکەکان پەیوەندییەکی خێزانی بووە لەناو کارگەیەکی پیشەیی (مانیفاکتۆرە) و پەیوەندیی باوکایەتی و گەورە و بچووکی ناو نەریتی فیودالیستی، ئەم شۆڕشی پیشەسازییە کۆمەڵێ شتی دیکەی هێنایە ناو کۆمەڵگەوە بەو پێیەی ژمارەیەکی گەورەی تاکەکان مامەڵە لەگەڵ یەکتردا دەکەن و متمانە بەیەکتر دەبەخشن و لە کارەکانیاندا پشت بە یەکتر دەبەستن، ئەمەش بە تەواوی مانای کۆمەڵگەی مەدەنی بەرجەستە دەکات. لەناوبردنی کاری دەستی یان مانیفاکتۆرە و گەشەکردنی ئابووریی شتومەك و هەڵوەشاندنەوەی موڵکیەتی فیودالیستی و پاشەکشەی ئەرستۆکراتیزم و ترازانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە کۆنەکانی خەڵکی، بووە مایەی سەرهەڵدانی کێشەی بنیاتنانەوەی پەیوەندییەکان، واتە بنیاتنانەوەی کۆمەڵگەی مەدەنی لە بەرامبەر دەوڵەتی نوێدا. دواتر فەیلەسووفانی سەدەی نۆزدەهەم وەڵامی ئەو کێشانە و ئەو ئیشکالیەتە تیۆرییانە دەدەنەوە، لەسەرووی هەموویانەوە هیگڵ و مارکس کە لە ڕووی پراکتیکییەوە کۆنترۆڵی بیری سیاسیی سەدەی بیستەمیان کرد.

سەبارەت بە هیگڵ، کۆمەڵگای مەدەنی وەك ئەوەی بریتییە لە کۆی پەیوەندییە یاسایی و

ئابوورییەكان كە پەیوەندیی خەڵكی لە نێویەكدیدا رێكدەخات و یارمەتی و هاوكاریی نێوانیان فەراهەم دەكات، ئەم كۆمەڵگەیە شتێك نییە جگە لە چركەساتێك لە گۆڕانێكی هەمیشەیی گەورەتر كە لە دەوڵەتدا بەرجەستە دەبێت، ئەو دەوڵەتەش لە واقیعدا دەوڵەتی ناسیونالیستییە. كەواتە كۆمەڵگەی مەدەنی بەو سیفەتەی ناوم برد، بە بەراورد لەگەڵ سروشتی خاودا، پێشكەوتنێكی نەوعی دەنوێنێت، بەڵام ناوەرۆكە راستەقینەكەی تەنها لەو چەشنە دەوڵەتەدا دەدۆزرێتەوە كە ڕەهایی بەرجەستە دەكات، واتە ئازادی و یاسا و نیازە مێژووییەكان لە روونترین دەركەوتەیاندا. كۆمەڵگە لە ئاستی كۆمەڵگەی مەدەنیدا وەك كۆمەڵگەی بەرژەوەندییەكانی تاك و پرۆژە تایبەتییەكان دەمێنێتەوە، واتە كۆمەڵگەی دابەشبوون و موڵكایەتیی تاكەكەس و ململانێ، ئەم كۆمەڵگەیەش خۆی لە دەوڵەتدا دەبینێتەوە. لەم مەیلە هیگڵیستییەوە بۆ بەرزكردنەوەی دەوڵەت تا ئاستی چارەسەری كێشەكانی كۆمەڵگە و دۆزینەوەی كلیلەكان، دەبینین ئەم حاڵەتە دەبێتە مایەی متوربەكردنی بزوتنەوە ناسیونالیستییەكان و فەلسەفە ناسیونالیزمیەكان كە دەوڵەت دەبەنە سەرووی كۆمەڵگەوە و ئەمەش سیفەتێكی نێگەتیڤانەی بە كۆمەڵگەی مەدەنی بەخشی و چەمكی دەوڵەتیش بوو بە چەمكێكی پیرۆز وەك دواتر دەیبینین.

بەڵام ماركس لە تێڕوانینێكی ترەوە سەیری ئەم بابەتەی كردووە، كە تێڕوانینێكی دژ و پێچەوانەیە و ئەمەیشی لە كاروانی مۆدێرنەی بورژوازی و پرۆژە رزگاریخوازەكەیەوە هەڵێنجاوە. بەبۆچوونی ماركس پرۆژەی رزگاریی سیاسی كە بورژوازی بەكردەوە ئەنجامی داوە ئەو كاتەی كۆمەڵگەكانی لە سیستمێكی كۆنەوە گواستەوە بۆ سیستمێكی مۆدێرن، ئەم پرۆژەیە لە قووڵاییدا شتێك نییە جگە لە پرۆژەی زەوتكردنێكی نوێ، بگرە سیاسەت لەم پرۆژە تازەیەی بورژوازیدا بریتییە لە گۆڕینی جۆری زەوتكردن كە گەورەترین فۆرمی زەوتكردن بەرجەستە دەكات. بۆ نموونە لە هەمان ئەو ساتەوەختەی كە "بورژوازییەتی دەوڵەت"ی وەكو كایەیەكی گشتی خوڵقاند، هاوكات كایەی تایبەتیشی دروست كرد، بەمە تاكەكەسی لەناوبرد بە دروستكردنی درزی گەورە لە نێوان خودی ئەو تاكەكەسە و شوناسەكەی، واتە لە نێوان دوو ماهیەتی دژ كەمومكین نییە بەیەكەوە بلكێنرێن یان بەیەكەوە بگونجێنرێن: واتە ماهیەتی تاكەكەس وەك هاووڵاتی و / ماهیەتی تاكەكەس وەك بەرهەمهێنەر. كایەی گشتی (واتە: هاووڵاتیبوون و مافی یەكسانی) لە دۆخێكی ململانێی بەردەوامدا دەژی لەگەڵ حەقیقەتی بەرهەمهێنانی كۆمەڵایەتیدا كە جیاوازییەكی زۆر گەورە لە مەرجەكانی ژیان و گوزەران و پرۆسیسەدا دەردەخات. لەبەرئەوە ئەو ئازادییەی گوایە لە هاووڵاتیبوون و یەكسانیدا هەیە، ئازادییەكی تەواو شەكلی و رووكەشە. لێرەدا ئازادییەكی راستەقینەی تاكەكەس دابین نابێت تەنها ئەوكاتە نەبێت كە مەرجەكانی ئازادیی سیاسی لەگەڵ مەرجەكانی ئازادیی كۆمەڵایەتیدا جووت و گونجاو بن، ئەمەش ئامانجی كۆمۆنیزم و بەرنامەكەیەتی، واتە جووتبوونی كایەی گشتی و كایەی تایبەتی، جووتبوونی نێوان دەوڵەت و كۆمەڵگەی مەدەنی. كەچی لە دۆخی بورژوازیدا هەم دەوڵەت و هەم كۆمەڵگەی بورژوازی دەبنە كایەیەك بۆ زەوتكردن و دەستبەسەرداگرتن.

ماركس رەخنەیەكی توند ئاراستەی ئەو لێكترازانە گەورەیەی نێوان كایەی گشتی و كایەی

تایبەتی دەکات کە بورژوازی لە هەموو تاکێکدا دروستی کردووە، بۆیە مارکس وێنای کۆمەڵگەیەك دەکات بەبێ دەوڵەت و بەبێ سیاسەت کە ناوی دەنێت کۆمەڵگەی کۆمونیستی و ئەم کۆمەڵگەیە –لە وێناکردنی مارکسدا– کۆمەڵگەیەکە خاڵییە لە لێکترازانی نێوان کایەی گشتی و کایەی تایبەتی یان دەوڵەت و تاکەکەس، چونکە پێی وایە جیاکردنەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگە سەرچاوەی زەوتکردن و دەستبەسەرداگرتنە.

### 3–سێهەم بەکارهێنانی چەمکی کۆمەڵگەی مەدەنی

لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا سەریهەڵداوە لە چوارچێوەی گەورەبوونی ململانێی شۆڕشگێڕی و لە سیاقی بنیاتنانەوەی ستراتیژی شۆڕشگێڕیی لە کۆمەڵگە پیشەسازییەکانی ئەوروپادا. دیارترین کەسێك کە ئەم شێوازە نوێیەی بەکارهێناوە بیریاری ئیتالی کۆمونیست ئەنتۆنیۆ گرامشی بوو. گرامشی کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر ئەو چەمکەدا هەبوو بەو شێوەیەی ئەمڕۆ بەکاردەهێنرێ، بێگومان دوای ئەوەی چەندین رەگەزی فەلسەفی و عەقائیدیی لێ دوورخستەوە. گرامشی هەوڵیدا بابەتی کۆمەڵگەی مەدەنی لە چوارچێوەی تیۆری دەسەڵات و هەژموونی چینایەتیدا بخاتە ڕوو و بۆ بنیاتنانەوەی ستراتیژی شۆڕشی کۆمۆنیستی یان رزگاریخوازی بەکاریبهێنێت. سەبارەت بە گرامشی دوو کایەی سەرەکی هەن سەقامگیریی دەسەڵات و سیستمی بۆرژوازی دەستەبەر دەکەن، کایەی یەکەم یان بواری یەکەم بریتییە لە کایەی دەوڵەت و ئامێر و دامەزراوەکانی دەوڵەت، لەوێدا دەسەڵاتی راستەوخۆ –واتە دەسەڵاتی سیاسی– دابین دەکات. کایەی دووەمیش بریتییە لە کایەی کۆمەڵگەی مەدەنی و دامەزراوەکانی وەکو حزب و سەندیکا و کۆمەڵە و هۆیەکانی راگەیاندن و قوتابخانە و مزگەوت یان کەنیسە و.. هتد و لەوێشدا وەزیفەیەکی تر دابین دەبێت کە بریتییە لە هەژموونی ئایدیۆلۆژی و رۆشنبیری، ئەمەش زۆر پێویستە بۆ مانەوەی هەر رژێمێك. لێرەوە بۆ گەیشتن بە دەسەڵات –بەبۆچوونی گرامشی– و پاراستنی ئەو دەسەڵاتە، کۆنترۆڵکردنی ئامێری دەوڵەت بەس نییە، بەڵکو دەبێ کۆنترۆڵی کۆمەڵگەش بکرێت، ئەمەش تەنها لە میانی رێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و لە ڕێگەی کاری رۆشنبیرییەوە دێتە دی.

لەم شیکردنەوەیەدا گرامشی ستراتیژێکی نوێ بۆ حیزبی کومۆنیست گەڵاڵە دەکات، ئەو ستراتیژە نوێیە دەڵێت مومکینە دەست بە جەنگی گۆڕانکارییەکی کۆمەڵایەتی بکرێت بۆ رۆیشتن بەرەو کومونیزم، ئەمەش لە ڕێگەی ستراتیژێکەوە کە تەرکیز دەکاتە سەر کارکردن لە ئاستی کۆمەڵگەی مەدەنی و سازدانی رۆشنبیران بۆ بردنەوەی جەنگی هەژموونی ئایدیۆلۆژی کە ئەمەش ڕۆڵێکی گەورە دەبینێ لە یارمەتیدانی حزب بۆ کۆنترۆڵکردنی ئامراز و دامەزراوەکانی دەوڵەت. ئەمە ستراتیژێکە ناکۆك لەگەڵ ستراتیژی بەلشەفیزم کە لینین هێڵە درشتەکانی داڕشتووە و باوەڕی بە کودەتایەك هەیە کە چینێکی بەهێز و چەکدار ئەنجامی بدات و چنگ لە هەموو جومگەکانی دەوڵەت گیر بکات. لە بەرامبەر ئەم ستراتیژەی بەلشەفیزمدا، گرامشی پرۆسەی پەروەردە و سازدانی سەرانسەریی کۆمەڵگە پێشنیار دەکات، واتە کۆنترۆڵکردنێکی پلە بە پلە و فیکریی ئەو چوارچێوانەی پەیوەندییە ڕۆژانەییەکانی کۆمەڵگە ڕێکدەخەن. کەواتە لە تێڕوانینی گرامشیدا کۆمەڵگەی مەدەنی ئەو بوارەیە

یان ئەو کایەیە کە هەژموونی کۆمەڵایەتیی تیادا دەستەبەر دەبێت، جا لەبەرئەوەی هەژموون پابەندە بە ئایدیۆلۆژیاوە، ئەوا ڕۆشنبیران ئامرازی ئەو هەژموونەن. لێرەوە گرامشی جارێکی تر پێناسی ڕۆشنبیری کردەوە و ڕۆڵی ڕۆشنبیری خستەڕوو وەك گرەوێکی گەورە لە گۆڕانی کۆمەڵایەتیدا. بەڵام گرەوکردن لەسەر کۆمەڵگەی مەدەنی، ڕۆڵی دەوڵەت و گرنگیی کۆنترۆڵکردنی دەوڵەت لەلای گرامشی، ڕەتناکاتەوە، بگرە کارکردن لە چوارچێوەی کۆمەڵگەی مەدەنیدا بەشێکە لە کارکردن لە چوارچێوەی دەوڵەت و سیاسەتی دەستگرتن بەسەر دەوڵەتدا. بۆیە لەلای گرامشی ڕۆشنبیر بەهایەکی نییە و چالاکییەکانی بێ سوودن تەنها ئەگەر ڕۆشنبیرێکی ئۆرگانی بێت، واتە تەنها ئەو کاتەی ڕۆشنبیر گرێ درابێت بە پرۆژەی سیاسیی چینەوە. کەواتە کۆمەڵگەی مەدەنی و کۆمەڵگەی سیاسی (یان دەوڵەت) شانبەشانی یەکتر دەڕۆن و لە هەموو ڕژێمێکدا یەکەی دینامیکییەتی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی کۆیاندەکاتەوە.

**4–چوارەم بەکارهێنانی چەمکی کۆمەڵگەی مەدەنی**

که لە هەشتاکان و نەوەدەکانی سەدەی بیستەمدا کاری پێکراوە، سوودی لە بۆچوونەکانی گرامشی وەرگرتووە بەڵام پاش دەستکاریکردن و لابردنی کەلەپووری مارکسی، تەنها بیرۆکەی ڕێکخراوەکان و دەستەو دامەزراوە کۆمەڵایەتییە تایبەتییەکانیان هێشتەوە، ئەو دامەزراوانەی لەتەك دەوڵەتدا کاردەکەن بەڵام لە ژێر فەرمانی دەوڵەتدا نین. بەم مانایە مەبەست لە کۆمەڵگەی مەدەنی، وەك ئەوەی ئەمڕۆ بەکاردەهێنرێ، ئەو تۆڕە فراوانەی ڕێکخراوە جیاجیاکانە کە کۆمەڵگە مۆدێرنەکان لە مێژووی دوور و درێژیاندا پەرەیان پێداوە، ئەو ڕێکخراوانە ئێستا هاوکاریی کارەکانی دەوڵەتیش دەکەن.

ئەگەر دەوڵەت بە بڕبڕەی پشت بچوێنین، ئەوا کۆمەڵگەی مەدەنی هەموو ئەو خانانەیە کە ئەندامەکان پێکدەهێنێ و لە ڕاستیدا جەستەی کۆمەڵایەتی بەبێ ئەو خانانە –واتە بەبێ کۆمەڵگەی مەدەنی– ناتوانێ بژیت. لێرەدا هیچ دوژمنایەتییەك لە نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگەی مەدەنیدا نییە و هیچ جیاوازییەکیش لە سروشتی وەزیفەکانیاندا نییە ئەگەرچی جیاوازی لە ڕۆڵەکانیاندا هەیە.

لەڕاستیدا بەکارهێنانی هاوچەرخی چەمکی کۆمەڵگەی مەدەنی بەسێ قۆناغی سەرەکیدا ڕۆیشتووە:

**قۆناغی یەکەم:** بریتییە لە کرانەوە بەرامبەر بە کۆمەڵگەی مەدەنی لەلایەن حزبەکان و هێز و سیستمە سیاسییەکان بە مەبەستی ئاکتیڤکردنێکی زیاتری سیاسەت و بەخشینی مۆرکێکی میللی بە سیاسەت. ئەمەش بەهێنانی چەندین ڕەگەز و بەرپرسی ناو بزووتنەوە هیومانیستی و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییە خێرخوازەکان بۆ ناو وەزارەتەکان لە پێناوی نزیك خستنەوەی سیاسەت لە توێژە چالاکەکانی کۆمەڵگە و هەروەها لە جەماوەری فراوانی خەڵك.

**قۆناغی دووەم:** بریتییە لە قۆناغی مامەڵەکردن لەگەڵ کۆمەڵگەی مەدەنی بە سیفەتی ڕێکخراوگەلێکی سەربەخۆ و هاوتەریب لەگەڵ دەوڵەتدا و بەشداریکردن لە زۆربەی ئەرکە گرنگەکان. ئەم چەمکە لەگەڵ بڵاوبوونەوەی چەمکی گلۆبالیزم هاوشانە، ئەم چەمکە تازەیەی کۆمەڵگەی مەدەنی واتە گواستنەوە بەرەو کۆمەڵگەیەك خۆی حوکمی خۆی بکات و خۆی بەرپرسیار بێت لە بەشی هەرە زۆری کاروبارە بنچینەییەکانی خۆی.

دەوڵەتە دیموکراتییەکان چەمکی کۆمەڵگەی مەدەنییان لەم دۆخەدا بۆ ئەوە بەکارهێنا تا بێتوانایی خۆیان بشارنەوە لە جێبەجێکردنی ئەو بەڵێنانەی نەیانتوانی تاسەر ئەنجامی بدەن و لە چەندین چالاکیی گرنگدا پاشەکشەیان کرد.

**قۆناغی سێهەم:** قۆناغی سێهەمی کۆمەڵگەی مەدەنی بریتییە لە قۆناغی هەنگاوی گەورەی ئەم کۆمەڵگەیە بۆ ئەوەی ببێت بە جەمسەرێکی سەربەخۆ و سێنتەرێکی ڕێبەرایەتی و دەسەڵاتێکی کۆمەڵایەتی، بە تایبەتی لە ئاستی ڕێکخراوی جیهانیدا، لەبەرامبەر ئەو جەمسەرەی دەوڵەت نوێنەرایەتیی دەکات، ئەو دەوڵەتانەی لە چوارچێوەی سیاسەتی گلۆبالیزمدا هاریکاری یەکترن لە مەسەلە بازرگانی و ئابوورییەکاندا. لەبەرئەوە دەبینین وردە وردە لە بەرامبەر ئەم جەمسەرە دەوڵەتی و ئەم ڕێبەرایەتییە ڕەسمییەی جیهاندا، بە تەریبی، چەندین ڕێکخراوی ناحکومی پێکهێنران کە پتر ڕێکخراوی کۆمەڵایەتین و ڕووبەڕووی کێشە بازرگانی و ئابوورییەکان دەبنەوە و جەخت لە بەهای عەدالەت و یەکسانی لە نێوان هەموو مرۆڤەکان دەکەنەوە. لەم دۆخەدا کۆمەڵگای مەدەنی خواستی ئەوەی هەیە ببێت بە ئامرازی تیۆرییەك بۆ گەڵاڵەکردنی سیاسەتێکی جیهانی و پاشان سیاسەتێکی نیشتمانی وەك ئەلتەرناتیڤێك بۆ سیاسەتی باو، لەمەشدا پشت بە کۆمەڵێ بەهاو پێوەر دەبەستێ کە بازاڕی سەرمایەداری هەوڵدەدات ئەو پێوەر و بەهایانە تێك بشکێنێت.

بەمجۆرە لە ساڵانی حەفتاکان بەدواوە لە زۆربەی وڵاتە ئەوروپییەکاندا بیریان لەوە کردەوە بایەخ بەو کەرتە گرنگەی چالاکیی کۆمەڵایەتی بدرێ، یەکەمین دەستپێشخەریی ئەم بوارەش بریتی بوو لە متوربەکردن و چالاککردنی دەستەی سیاسیی وزارەتەکان بە چەندین ڕەگەزی دیکە کە لە بواری سیاسەتدا پسپۆر نین و کەسانێك نین لە خەباتگێڕانی حزبەکان، بەڵکو ڕاستەوخۆ لەناو ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنییەوە هاتوون، واتە لەو دەستە و ڕێکخراوە غەیرە سیاسیانەوە هاتوون کە لە کاری کۆمەڵایەتیدا کاردەکەن، ئەمەش پێچەوانەی ئەو ڕێسا تەقلیدییەیە کە پایە وزارییەکانی تیادا دابەش دەکرا و هاوپەیمانییە حکومییەکانی تیادا دروست دەکرا. بەمجۆرە لەناو جومگە گرنگەکانی دەوڵەت و سیاسەتی دەوڵەتدا کەسانی ناسیاسی و ئەکتیڤیستی کۆمەڵایەتی شوێنی گرنگیان گرت، بۆ نموونە ژمارەیەك لە مامۆستایانی زانکۆ پایەی سیاسی گەورەیان پێدرا و ژمارەیەك پزیشکی چالاکیش لە مەیدانی پزیشکانی بێ سنووردا دامەزران، پاشان ڕۆڵی هونەرمەندان و نووسەران هاتە پێشەوە و ئەمانیش چەند پایەیەکی حکومییان گرت. بەڵام ئەوەندەی پێنەچوو مەسەلەکە لەوەش زیاتر ڕۆیشت و ڕێکخراوە ناحکومییە ناوچەیی و نێودەوڵەتییەکان لەتەك دەوڵەتدا بوون بە بکەرێکی سەرەکی لە بەڕێوەبردنی کاروبارە نیشتمانی و جیهانییەکاندا. چەمکی ڕێکخراوە ناحکومییەکان لەو دۆخە یاساییەوە گەڵاڵە بوو کە نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ ئەو ڕێکخراوانەی فەراهەم کرد، هەروەها نەتەوە یەکگرتووەکان ڕۆڵێکی چالاکتری بەو ڕێکخراوە ناحکومییانە بەخشی بۆ چارەسەرکردنی ژمارەیەکی زۆری گیروگرفتەکان و کێشە کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕۆشنبیرییەکان. تەنانەت گەیشتە ئەو ئاستەی زۆر کەس باوەڕیان وا بێت کە ئەم ڕێکخراوانە تاکە پەناگەیەکن بۆ جێبەجێکردنی پرۆژە مرۆییە خێرخوازەکان و پرۆژە مرۆییەکانی تر لە بەرامبەر بێتوانایی دەوڵەت و ئیفلیجی ئامرازەکانی بەهۆی دەسەڵاتی بیرۆکراتیانەی دەوڵەتەوە.

ئاشکرایه ئەم دۆخه لە وڵاتە هەژار و تازە پێگەیشتووەکاندا بەوشێوەیە نییە. لەوێدا قسەکردن لە بارەی کۆمەڵگەی مەدەنی و رۆڵی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان و سەربەخۆیی رێکخراوەکان هۆیەکەی ئەوە نییە کە دەوڵەت لە ئاستی پێگەیشتن و پێشکەوتندا بێت، هەروەها ئەوەش نییە کە کۆمەڵگە لە ئاستێکی بەرزی پێشکەوتندا بێت و ئاگایی رۆڵی رێکخراوە سەربەخۆکانی هەبێت و گیانی دەسپێشکەری لەلای تاکەکاندا هەبێت بۆ دروستکردنی کۆمەڵە و دامەزراوی ئەهلیی بە توانا بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان، بگرە لەوانەیە بە پێچەوانەوە بێت، سەرچاوەی قسەکردنی بەردەوام لە بارەی کۆمەڵگەی مەدەنی بریتییە لە شکستی دەوڵەت کە بە رێگە کلاسیکییەکە رۆڵێکی گەورەی نەماوە و ناتوانێ نەتەوە بنیات بنێت و بێتوانایە لە گەڵاڵە کردنی رۆڵێکی نوێ کە لەگەڵ پێداویستییەکانی کۆمەڵگەو بۆ پێداویستییەکانی هاووڵاتی کاربکات، هەروەها کۆمەڵگەش لاواز و داوەشاوە، لە رێکخراوی سەربەخۆ و دامەزراوی ئەهلیی کاریگەردا زۆر هەژارە، هەروەك بە ئاشکرا رێگەی پێنادرێت کۆمەڵە و رێکخراوی سەربەخۆ دروست بکات. ئەمڕۆ لە جیهانی سێدا بەکارهێنانی ئەم چەمکە بەکارهێنانی دروشمێکە بۆ داپۆشینی نەبوونی ناوەڕۆکی کۆمەڵگەی مەدەنی بەرز دەکرێتەوە، واتە بۆ داپۆشینی ئەو بۆشاییەی هەم لە دەوڵەت و هەم لە کۆمەڵگەدا هەیە، ئەمەش دەستەبژێری ئۆپۆزیسیۆن هاندەدات کە زاراوەی کۆمەڵگەی مەدەنی وەك باوەڕێکی نوێ بەکاربهێنێت لە پرۆسەی خۆسازدان بۆ کاری سیاسی، واتە وەك سەرچاوەیەك بۆ رەوایی کارێکی سیاسیی نوێ کە دەستەبژێر دەیەوێت خۆی بەو سیاسەتەوە ببەستێتەوە تا لە سیاسەتی بیرۆکراتیی فەرمانڕەوا جیابێتەوە.

لێرەدا دوو خاڵ هەیە کە لە پەرەسەندنی چەمکی کۆمەڵگەی مەدەنیدا گرنگن:

1–ئەوەی کە پێشتر وەك چەمکێکی ئەبستراکت بەکاردەهێنرا بۆ جیاکردنەوەی سروشتی و مەدەنی، کایەی تایبەتی و کایەی گشتی، بابەتی سیاسی و بابەتی رۆشنبیری یان سیاسەتمەدار و رۆشنبیر، ئەمڕۆ بووە بە چەمکێك دەلالەت لە بکەرێکی کۆمەڵایەتیی دیاریکراو دەکات کە لە چەندین رێکخراو و دەستەی بەهێزدا بەرجەستە دەبێت، بە تایبەتی ئەو دەستە و رێکخراوانەی هێز و سامان و نفوزێکی وایان هەیە کە دەتوانن بەربەرەکانیی دەوڵەت بکەن و بگرە زۆر جار لە دەوڵەتیش بەتواناترن.

2–ئەم چەمکە هەر لە سەدەی نۆزدەهەمەوە گۆڕان و پەرەسەندنێکی قووڵی بەخۆوە بینیوە، چونکە سەدەی نۆزدەهەم لەلای ژمارەیەکی زۆری توێژەران مەرجەعێکی سەرەکیی سەرهەڵدان و گەشەکردنی کۆمەڵگەی مەدەنییە، ئەمڕۆ کۆمەڵگەی مەدەنی ئازادی و مافەکان دەستەبەر دەکات و پەرەیان پێدەدات.

### سەرچاوە

اخبار الشرق – 2002/3/19.

# ئیشکالیەتی سەرهەڵدان و گەشەکردنی کۆمەڵگەی شارستانی

**کەریم ئەبوحەلاوە**

له عەرەبییەوە: هەڵکەوت عەبدوڵڵا

ئەم توێژینەوەیە هەوڵدەدات دەرگابکاتەوە بە ڕوی ئەگەری سوودوەرگرتن لە چەمکی کۆمەڵگەی شارستانی(مەدەنی)، بۆ توخنکەوتنی ئیشکالیەتەکانی کۆمەڵگەی هاوچەرخمان، ئەمەش لە ڕێگەی گەڕانەوە بۆ بنەچەی چەمکەکەو سەرهەڵدانی لە ئەوروپای سەردەمی ڕێنسانسەوەو ئەو گۆڕانکاریانەی لە پڕۆسێسی پچڕپچڕدا بەسەر واتاکەیدا هاتوە..

## لەبارەی دیاریکردنی چەمکی کۆمەڵگەی شارستانییەوە

کۆمەڵگەی شارستانی دیاردەیەکە لە ئەوروپا سەریهەڵداوەو هاوشانی سەرهەڵدانی چینی بۆرژوا بوە وەك چینێکی سەرکەوتوو بەسەر دەرەبەگایەتیداو ناکرێ لە هەموو ئەو گۆڕانکارییە قوڵانەی دابڕین کە لە ئاستی ئابووری، بەرهەمهێنان، کولتوورو فیکر لە بەرەبەیانی ڕێنسانسەوە هاتوونەتەوە ئاراوەو بوونەتە هۆی خستنەوەی تێڕوانین و وێناکردنی نوێ سەبارەت بە دنیا. هەروەها ناکرێ لەو دەستکەوتانە جیابکرێتەوە کە لەسەر ئاستی فراوانبوونی ئەقڵانیەت و توندوتۆڵکردنی بەردەوامی ئەو بنچینانەی عەلمانیەت لە ململانێی خۆی لەگەڵ کڵێسا پشتی پێدەبەست، هەتا دەگاتە ئیشکالیەتی یەکەمی دیموکراسی لیبرالی کە لەسەر کەلاوەی پاشایەتیە ڕەهاخوازەکان دامەزراو دەرگا کردەوە بەڕوی سەردەمێکی نوێی تێڕوانین سەبارەت بە مرۆڤ وەك یەکەمین حەقیقەت.

ئەو گۆڕانکارییانە پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی نوێیان خستەوەو پێویستیی دۆزینەوەی دامەزراوو ڕێکخراوگەلی وەهایان هێنایەئاراوە کە لە ڕێگەیانەوە بکەرە کۆمەڵایەتیەکان (ئاکتیڤیست)[1]

چالاك بن، مەبەست ئەوانەیە كە قۆناغی ساواییان جێهێشتوەو گرنگیی خۆیان لە ژیانی گشتیو قورسایی خۆیان وەك ویژدانی كۆمەڵایەتی دۆزیوەتەوەو بۆیان دەركەوتوە ڕای گشتی، لەو چركەساتەوە كە مەسەلەی هەڵبژاردنە دیموكراتیەكانو مافەكانی هاووڵاتی دەربڕاون، بایەخی خۆی هەیە.

ئا لەم پانتاییە كات – شوێنیەدا پێویستە بەدوای ئەو گۆڕانكاریو وەرچەرخانانەدا بگەڕێین كە لە ڕێڕەوی گشتیی ئەوروپیدا بیرۆكەی كۆمەڵگەی شارستانیان دەرهاویشتو خەملاند، ئەگەرچی ئەوە تایبەتمەندیی هەندێك ئەزموون وەلاوەنانێت، وەك ئەزموونی ئینگلیزی، فەڕەنسیو ئەڵمانی كە خاوەن خەسڵەتی وەهان پڕۆسێسی تێگەیشتنو ناسینیان كاتی زیاترو كۆششی دەوێت.

ئێستا بابزانین ئەو گۆڕانكارییانە كامانەن كە بەسەر چەمكی كۆمەڵگەی شارستانیدا هاتوونو چ پەیوەندییەكیان لەگەڵ دەوڵەتدا هەیە.

لە داڕشتنە لاتینییە سەرەتاییەكەدا، چەمكی كۆمەڵگەی شارستانی هێماكردنە بۆ گروپێكی سیاسی كە ملكەچی یاساكانە[2]، واتە دەوڵەت (شار) هەیە كە نوێنەری گرتبوونەوەیەكی سیاسییەو ئەندامەكانی هاوڵاتیگەلێكن بڕوایان بە یاساكانی دەوڵەت هەیەو بەپێی ئەوان هەڵسوكەوت دەكەن. ئەمە ئەو واتایەیە كە لەسەر دەستی ئەرستۆ، بەتایبەتی لە كتێبی (سیاسەت)دا، بڵاوكراوەتەوە.

لە سەدەی هەژدەهەمەوە، لە هەلومەرجێكدا كە بە دیموكراسیو شۆڕش جیاكارەدەكرا، سەرەتا لە ئینگلستانو ئینجا فەڕەنساو ولایەتە یەككگرتوەكانی ئەمریكا، جیاوازیو ناكۆكی لەنێوان دەوڵەتو كۆمەڵگەی شارستانیدا سەریهەڵدا. وتاری فەیلەسوفی سكۆتلەندی (ئادەم فرجسۆن) لە كتێبی "وتارێك لەبارەی كۆمەڵگەی شارستانیەوە"، كە لە ساڵی 1767دا بڵاوبۆتەوە، هێما بۆ خەسڵەتە بنچینەییەكانی كۆمەڵگەی شارستانی دەكات: گوێزانەوە لە شێوازە زبرەكانی ژیانی بەربەریەتەوە بەرەو كۆمەڵگەیەكی شارستانی كە تیایدا ئاڵوگۆڕە بازرگانیەكان تەشەنەدەكاتو پرنسیپی دابەشكردنی كار لە پیشەو پیشەسازییە دەستەكیەكاندا پێڕەودەكرێت.

بەڕودانی شۆڕشە دیموكراتیەكان لە كۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا، كە شۆڕشگەلی قوڵ بوونو دابڕانی مەزنیان لەگەڵ سیستەمی مەعریفی كۆندا دروستكردو پشتئەستوور بوو بە دەستكەوتەكانی سەردەمی ڕۆشنگەری، مرۆڤی تاك بوە بناغەی نوێكاری لە بوارەكانی كاركردنو یاسادانانو فیكردا. ئەمەش بنچینەیەكی نوێی بۆ جیاوازیكردن لەنێوان دەوڵەتو كۆمەڵگەی شارستانیدا هێنایەئاراوە، كە تۆماس باین ساڵی 1791 لە كتێبی "مافەكانی مرۆڤ"دا دەریبڕیوە[3]. هەروەها دەكرێت ئەوە لە فەلسەفەی ئینگلیزیدا، بەتایبەتی نووسینەكانی (لۆك)و (هۆبز)، بەدیبكەین. چونكە هەردووكیان، وێڕای جیاوازیانو هەریەكە بەشێوازی خۆی، دەرفەتیان بۆ فەلسەفەی مافەكان ڕەخساند كە مافەكانو ئەركەكانی هاووڵاتی دیاریدەكات، جا بە سازاندن بێت لەگەڵ پاشایەتیدا یاخود بە ناتەبایی بێت لەگەڵیدا.

لای كەسیش شاراوەنییە، ئەو دەستكەوتانەی شۆڕشی فەڕەنسا لە بواری مافەكانی مرۆڤدا خستویانەتەوەو ئەو ئاسۆ مرۆڤانە، كولتووریو فیكریانەی دەرگای بەڕویاندا كردەوە، بۆ ماوەیەكی

دورودرێژ سەرنجی ئەوروپاییەکان و جیهانیان بۆلای خۆیان ڕاکێشا.

لە ئەڵمانیاش چەمکی کۆمەڵگەی شارستانی ڕەنگێکی نوێی بەبەری خۆیدا کرد، وەك لە کتێبە بەناوبانگەکەی هیگڵدا: "پرنسیپەکانی فەلسەفەی هەق"، هاتوەو بایەخێکی ڕیزپەڕ دراوەتە دەوڵەت، بەمەبەستی ڕەتکردنی ئەو پاشکەوتوویيەی ئەڵمانیا لەو ماوەیەدا (1821) تیا دەژیا، بەبەراورد لەگەڵ ئینگلستان کە شۆڕشی خۆی ئەنجامدابوو و فەرەنسا کە گەورەترین شۆڕشی سیاسی لە مێژووی نوێدا بەرپاکردبوو. هیگڵ داوای دەوڵەتێکی بەهێزی سەربەخۆی سەروو کۆمەڵگەی شارستانی دەکرد، کە بەپێی کۆمەڵێك پەیوەندیی ئابووری لە کۆمەڵگەدا دیاریدەکریێ. بەپێی تێگەیشتنی هیگڵیانە کۆمەڵگەی شارستانی ئەم سێ چرکەساتە لەخۆدەگرێت:

"1/سیستەمی پێداویستییەکان، 2/داکۆکیکردن لە خاوەندارێتی بە دادپەروەری، واتە ئازادی، 3/داکۆکیکردن لە بەرژەوەندییە تایبەتیەکان، وەك بەرژەوەندیی گشتی، لە ڕێگەی بەڕێوەبردن و ڕێکخراوەکانەوە"[(4)].

مارکس پشتی زۆری بە بیرۆکەی کۆمەڵگەی شارستانی نەبەست و تێگەیشتنی ئەوو هیگڵ یەکیاندەبڕی، چونکە کۆمەڵگەی شارستانی بەلای ئەوەوە ئەو گۆڕەپانە بوو کە تیایدا ڕووبەڕووبوونەوەکانی نێوان بەرژەوەندییە ئابوورییە جۆربەجۆرەکان، بەپێی یاسا و ئەخلاقی بۆرژواییانەی باڵادەست، ڕوویدەدا. واتە کۆمەڵگەی شارستانی گۆڕەپانی ململانێی چینایەتی نێوان دوو جەمسەری بنچینەیی: بۆرژواو پرۆلیتاریا، بوو. بەم پێیەش ئابووریی سیاسی بەو زانستە دانا کە لە توانایدایە لە پێکهاتەی ناوەکیی کۆمەڵگەی شارستانی بکۆڵێتەوە. ئەمەش ئەوە بوو کە لە کتێبی "بەشدارییەك لە ڕەخنەگرتن لە ئابووریی سیاسیدا" تاکو کتێبی "سەرمایە"و گەلێك لێکۆڵینەوەی تردا ئەنجامیداوە.

گەشەکردنێکی گرنگ کە بە دابڕانی ئیپستمۆلۆژیانە[(5)] لەگەڵ مێژووی بیرۆکەی کۆمەڵگەی شارستانی دەژمێرێت، لەسەر دەستی بیریاری ئیتالی "ئەنتۆنیۆ گرامشی" ڕوویداو پانتایی چەمکەکەو بواری بەکارهێنانی گوێزرایەوە بۆ سەرخانی کۆمەڵگە، بۆ ئەوەی هێمابکات بۆ بنەمای کولتووری- ئایدیۆلۆژی و دامەزراوەکانی، وەك سەندیکاکان، حیزب، قوتابخانەو ئامڕازەکانی ڕاگەیاندن و بڵاوکردنەوە. بۆ ڕۆشنایخستنە سەر چەمکی کۆمەڵگەی شارستانی، پێویستە لە چوارچێوەی سیستەمی تێگەیشتنی گرامشیانەدا تێی بڕوانین، لەو ڕوەوە کە پەیوەندی بە کۆمەڵگەی سیاسی (دەوڵەت) و ڕۆشنبیری ئۆرگانیکی و ڕۆشنبیری تەقلیدی و باڵادەستییەوە هەیە.

تێگەیشتنی گرامشی پشتئەستوورە بە تایبەتمەندیی کۆمەڵگەی ئیتاڵی و کۆمەڵگە ئەوروپاییەکان کە کۆمەڵگەیەکی شارستانی بەهێزیان گەشەپێداوە، هەرەسهێنانی سەرمایەداریی بەهۆی تەنگوچەڵەمە ئابوورییەکانەوە بەدووردەگرێت، لەکاتێکدا شۆڕش لە ڕووسیا لەسەر ئەو بنچینەیە سەرکەوتنی بەدەستهێنابوو کە کۆمەڵگەی سیاسی هەموو شتێکە، چونکە بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات لەلایەن بەلشەفیکەکانەوە و جڵەوکردنی دامودەزگا جۆربەجۆرەکان لە هەلومەرجی لاوازیی کۆمەڵگەی شارستانیدا، دەسەڵاتی خستە خزمەتی بەرژەوەندییەکانی ئەوانەوە[(6)]، بەپێچەوانەی دەوڵەتەکانی خۆرئاوای ئەوروپا کە سەرکەوتنی

شۆڕش تیایاندا پێویستی بە مەرجێکی بنچینەیی هەبوو، ئەویش گۆڕینی تەرازووی هێزە کۆمەڵایەتیەکان بوو لە بەرژەوەندیی توێژو چینە چەوساوەکاندا، هەتا چینی کرێکاران بتوانێ بە هاوپەیمانێتی لەگەڵ جوتیاران بالادەستیی ڕۆشنبیریو ئایدیۆلۆژیی بۆرژواییانە تیخبکاتو تێکبشکێنێ، چونکە ئەمە بە دەستپێکی پێویست بۆ هێنانەدیی دەسەڵاتی سیاسیی خۆی دەژمێرێت.

ئەمەش هانی گرامشی دا بیر لە گرنگیی ڕۆشنبیریو ئایدیۆلۆژیا و ڕۆڵی ڕۆشنبیرە ئۆرگانیکیەکانی چینو توێژە پێشکەوتوەکان بکاتەوە، بۆ خوڵقاندنی دژە ڕۆشنبیرییەك کە لە ڕێگەی جەنگی شوێنگەکانەوەو پێش دواڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ڕۆشنبیریی بالادەستی ڕەسمی بازنەی بڵاوبوونەوەی فراواندەبێتەوە.

ئەگەرچی گرامشی جیاوازیدەکرد لەنێوان کۆمەڵگەی سیاسی (دەوڵەت) بە دامەزراوو دامودەزگاکانیەوە (سوپا، پۆلیس، دادگا، یاسا)و کۆمەڵگەی شارستانیدا کە ئایدیۆلۆژیا بە پێکهاتە جۆربەجۆرەکانیەوە (فەلسەفەکان، ئایینو هەستی هاوبەش، حیزبە سیاسییەکان، سەندیکاکانو یانەکان، دەستە کولتوورییەکانو خوێندنگەکان) لەخۆدەگرێت، بەڵام هێما بۆ پێکداچوونو پەیوەندیی کارلێکەرانەی نێوانیشیان دەکاتو ئەم شێوە هاوتایەش پەیوەندیی ناوبراو دەخاتەڕوو: کۆمەڵگەی شارستانی– کۆمەڵگەی سیاسی، ئایدیۆلۆژیا– بالادەستی، ڕەوایەتی کولتووریو یاسایی– سەرکوتکردنی ئاشکرا، حیزبو ڕێکخراوە سیاسییەکان– دەسەڵاتی سیاسی، فەلسەفە بۆ کارپێکردن– فەلسەفەی بەرژەوەندخوازانە، توێژە جڵەوکراوەکان– توێژە جڵەوکارەکان، گۆڕانکاریو گەشەکردن– ڕیفۆرمخوازی.

لەکاتێکدا کۆمەڵگە ڕێکخراوە سیاسییەکان لەئامێزدەگرێت، دەوڵەت دەسەڵاتی سیاسی پاواندەکات. ئەنجامی ئەم پەیوەندییە ململانێکارەو لە پەراوێزی ئەو پەیوەندییەدا بنەماکانو دەستەو توێژە کۆمەڵایەتیەکان گەشەدەکەنو سەربەخۆیی ڕێژەییان بەدەستدێتو ڕەوایەتی خۆیان بەدەستدێننو دوایش بۆ دەسەڵاتی نیمچە سەربەخۆی خۆیان (دەسەڵاتی مەعریفی) کە دەیان بەستێتەوە بە دەسەڵاتەوە، پەیوەندییەکی پێکداچووو جیاواز، تەماهیکارانەو جیاکار دادەمەزرێنن. ئەمەش مانای ئەوەیە، وەك فۆکۆ دووپاتیدەکاتەوە، هاجووت نین، چونکە مەعریفەو دەسەڵات خاوەن سروشتی جیاوازن.. بەڵام ئەو جیاوازییە پەیوەندیی نێوانیان ڕەت ناکاتەوە، چونکە ئەگەرچی دان بە سەرەتاییبوونی مەعریفە لەچاو دەسەڵاتدا دەنرێت، بەڵام پێکەوە گرێدراونو هیچ دەسەڵاتێك بێ مەعریفەو هیچ مەعریفەیەکیش بێ دەسەڵات بوونی نییە، جا ئەو دەسەڵاتە بالادەست بێت یاخود بەرەو بالادەستبوون بچێت.

بەو پێیە فۆکۆ پێیوایە "ڕۆشنبیر" بۆ بەربەرەکانیکردنی بالادەستی دەتوانێت پێکداچوونی جیاواز لە هەموو ئەو کەرتانەدا دروستبکات کە تیایدا کاردەکات. ئەم ئەرکە بەلای گرامشییەوە ئەرکی سەرەکیی ئەو ڕۆشنبیرە ئۆرگانیکیانەیە کە چینە بنچینەییەکانی ناو کۆمەڵگە دەریاندەهاوێژی بۆ هێنانەدیی بالادەستی فیکریو کۆمەڵایەتی خۆی "هۆشمەندیی خۆیی ڕەخنەگرانە، لە ڕوی مێژووییو سیاسییەوە، مانای خوڵقاندنی دەستەبژێرێکی ڕۆشنبیرانەیە،

چونکه گروپ خۆبەخۆ "جیاکاره"و سەربەخۆ نابێت، بەبێ ئەوەی بەواتای فراوانی وشەکە خۆی ڕێك نەخات. ڕێکخستنیش بێ ڕۆشنبیرەکان، واتە بەبێ ڕێکخەرو ڕابەر ڕوونادات"[7]، چونکە باڵادەستیی ڕۆشنبیریو ئایدیۆلۆژی توێژێك یان چینێك ڕوونادات، ئەگەر ڕۆشنبیرە ئۆرگانیکیەکانی هۆشمەندیی توێژو چینە کۆمەڵاییە خاوەن پڕۆژە داهاتوخوازییەکان بەرزنەکەنەوەو نەیانگەیەننە پلەیەکی بەرزتری شێلگیری. ئەمەش لە ڕێگەی ئەو ڕیفۆرمە ڕۆشنبیریو بەهاخوازیانەی پشت بە فەلسەفەی پراکتیکی ئاڕاستەکراو بە زانست دەبەستنو ئامانجیان بەرپاکردنی پڕۆسێسێکی پاکسازییە بۆ خۆڕزگارکردن لە پاشماوەکانی ئایدیۆلۆژیای زاڵو لە ڕێگەی حیزبەکانو ڕۆشنبیرە ئۆرگانیکیەکانەوە.

لێرەوە دەشێت ئەو سەرەتایبوونە لێکبدەینەوە کە گرامشی داویەتە ڕۆڵی ئایدیۆلۆژیاو دەکرێت سەرسامبوونی شاراوەی ئەویش بە توانای کڵێسا بۆ نوێکردنەوەی دەسەڵاتی خۆی بە درێژایی سەردەمەکانو بەهۆی ڕۆشنبیرە ڕەسمییەکانیەوە (توێژی ڕەبەندەکان) شیبکەینەوە. ئەمەش وای لە گرامشی کرد ڕووبکاتە توێژینەوە سەبارەت بە مەسەلەی ئایدیۆلۆژیاو بەو ڕایەڵەی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی دابنێت کە بنەمای سەرخانو ژێرخانی کۆمەڵگە پێکەوە دەبەستێت. بەگشتی دەتوانین بڵێین هەر ئایدیۆلۆژیایەکی سەرتاپاگیر سێ فرمانی سەرەکی جێبەجێدەکات: فرمانێکی مەعریفی، فرمانێکی پراکتیکی سیاسی، فرمانێکی دەروونیو بەجێبەجێکردنی ئەو فرمانانەش پێداویستییەکانی ئەو توێژو چینانە دەستەبەردەکات کە بەشێوەیەکی قوڵ بەرهەمیانهێناوە.

بەو پێیەی ڕۆشنبیران بەرهەمهێنەرو پڕۆپاگەندەکەری ئایدیۆلۆژیان، ئەرکی ئەو باڵادەستکردنەشیان لەئەستۆیە کە چینە باڵادەستەکان لە کۆمەڵگەی شارستانیو لەپێناو هێنانەدیی قبوڵکردنو یەکانگیریی چینە ژێردەستەکانو لەڕێگەی دامودەزگا ڕۆشنبیرییەکانەوە پراکتیزەی دەکەن. ئینجا چینە کۆمەڵایەتیەکان لەسەردەستی ڕۆشنبیرەکانی خۆیان هۆشمەندی سەبارەت بە شوێنگەو بەرژەوەندییە ڕاستەوخۆو هەنوکەییەکانو بەرژەوەندییە مێژووییە دوورمەوداکانیش بەدەستدێنن. ئەو چینانە وێناکردنی شێلگیرانەی خۆیان دەربارەی دنیا لە ڕێگەی ئەو ڕۆشنبیرانەوە بەدەستدێنن، هاوکات لە ڕێگەی ئەو ڕۆشنبیرە ئۆرگانیکیانەی پێوەی گرێدراون، ڕەخنە لەو وێناکردنانەی دی دەگرنو ڕیسوایان دەکەن کە هۆشمەندیی خۆیی سەربەخۆیان دەشێوێنن[8].

ئەم شیکردنەوەیە دەربڕینی وێنەیەکی نموونەییە بۆ دۆخی کۆمەڵگەیەکی گەشەکردو کە لەگەڵ ململانێیەکی ڕاستەقینەدا دەستەویەخەیەو کۆمەڵگەیەکی شارستانی ڕەگداکوتاوی تێدایەو ڕۆشنبیرەکانی لە سەدەی هەژدەهەمەوە توانیویانە ستراتیژێکی تایبەت بەخۆیان بۆ هەڵمەتبردنە سەر کۆمەڵگەی شارستانی بخەملێنن، بەو جۆرەش هۆکاری ڕۆشنبیری ڕوی لە پێکهێنانی توخمەکانی کاریگەربوونی تایبەتیو چەسپاندنی بنچینەکانی سەربەخۆیی کرد، بەو مانایەش وەك دەسەڵاتێکی تایبەتمەندی پشت بەخۆبەستوو ڕوی لە پێکهاتن کرد[9].

لە کۆمەڵگە تازە پێگەیشتوەکاندا، کە کۆمەڵگەی ئێمەش بەشێکە لەوان، ئەوەی ڕەچاودەکرێت: کۆرپەیی کۆمەڵگەی شارستانیو

بوونی ئاستەنگی ڕاستەقینە لەسەر ڕێگەی پێکهاتنی، دواکەوتنی پێکهاتنی دیاردەی "تاکگەرایی" کە پێویستە بۆ گەشەکردنی شێوازەکانی پەیوەندییە ئەقڵانیو هەڵبژاردنخوازەکان لەناو کۆمەڵگەدا. ئەمە وێڕای پاوانکردنی دەسەڵاتی دەوڵەت لەم کۆمەڵگەیانەدا بەجۆرێك کە پێدەچێت هەر هەوڵدانێك بۆ دەربازبوون لە دۆخی باوو کارپێکردنی گوتارێکی ڕخنەگرانە بەرامبەر بە واقیع، جۆرە هەڕەشەکردنێك بێت لە هاوسەنگییە ئارامگرتوەکان. ئەم دۆخەی ڕۆشنبیرەکانمان تیایدا دەژین، بەرهەمی چەند مەرجێکی پیوارە (غائیبە) کە هەندێکیان پەیوەندییان بە پلەی گەشەکردنو پێگەیشتنی بنەمای کۆمەڵایەتییەوە هەیەو هۆی هەندێکی دیکەشیان دەگەڕێتەوە بۆ بوونو بەردەوامبوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان، کە گرامشی وتەنی، گرێدراوی لاوازیی خەملینی چینایەتیو سستی گوێزانەوەی چینەکانە لە ئاستی چینێکەوە بەخۆی بۆ ئاستی چینێك بۆ خۆی، ئەمەش هێمایە بۆ پیواری ڕۆشنبیری ئۆرگانیکی کە وێناکردنی چینەکەی یان نەتەوەکەی بۆ دنیا بەدەستدێنێو بڵاویدەکاتەوەو باس لەو پڕۆژەیەك دەکات کە خوازیاری بنیاتنانیەتی.

ئەو ئاخاوتنەی لەم دواییەدا دەربارەی دیموکراسیو لەژێر کاریگەریی سیستەمی جیهانیدا بەربڵاوە، وێڕای پێویستیو گرنگی دەرککردن بە خەسڵەتو کۆڵەکەکانی دیموکراسی وەك شێوازێکی ژیانو فەرمانڕەواییکردن، تەنیا بانگەوازی سۆزداردەبێت، ئەگەر لە ڕێگەی ڕێکخراوو دامودەزگای جۆربەجۆری وەهاوە نەکرێتە کردارو دەرنەبڕدرێ کە نیشاندەری پێگەیشتنو ئاستی گەشەکردنی کۆمەڵگەن.

واتە دیموکراسی چارەسەرێکی تەلیسماوی نییە بۆ کێشە دەربڕراوەکانو وەچەی چرکەساتی ئێستا نییە، بەڵکو میراتێکی ئەقڵانیو داننانە بەوی دیکەدا (پلورالیزم)و بە مافی ئاخاوتنو دەربڕینیدا، تەنانەت ئەگەر جیاوازیش بێت، هەروەها دیالۆگی بەردەوامە بۆ گەیشتنە چارەسەرکردنێکی کاریگەرتری ئەو مەسەلە کۆمەڵایەتیانەی ڕووبەڕووی کۆمەڵگە دەبنەوەو بەرژەوەندیی هاوبەش زاڵدەکاتو وا لە خەڵك دەکات لە ڕێگەی کەناڵی جۆربەجۆرەوەو بەشێوازی هەمەڕەنگ داکۆکی لە بەرژەوەندییەکانی خۆی بکات. هەموو ئەوانە ئەرکی زیاتر دەردەهاوێژن کە پێویستە ڕۆشنبیریی ئێمە بیانگرێتە ئەستۆ. یەکەمین ئەرکیش کە ڕووبەڕووی ڕۆشنبیریی هاوچەرخمان دەبێتەوە، دەستنیشانکردنی شوێنگەمانە لەسەر نەخشەی ژیواریی نوێ، ئەمەش لە ڕێگەی دیاریکردنی ناسنامەو ئینتیمای ژیواریمانەوە. ئەم دەستنیشانکردنەش پێویستی بە زاڵبوون بەسەر دوو کێشەدا هەیە کە وەك دژ بەیەك خۆدەنوێنن: یەکەمیان چۆنێتی ڕاگەیشتنە بە گەشەکردنی فیکرو مەعریفەدا بەواتا هاوچەرخەکەی، لە شوێنگەی سوودوەرگرتنو بەشداریکردنو بەرهەمهێنانەوە نەك شوێنگەی پاشکۆیەتیو بەرخۆرییەوە یان دووبارەکردنەوەو گوێزانەوەوە. ئەمەش پێویستی بە گەڕانە بە دوای تواناکانی گەشەپێدانی ڕۆشنبیرییەکی وەها کە لەسەر بنچینەی ژیواریو مێژوویی دامەزراوەو سوود لە قۆناغەکانی بەرهەمهێنانو داهێنانی مێژووی خۆمان وەردەگرێت، بەبێ ئەوەی بکەوێتە تەڵەی سەلەفیەتەوە یان لەلایەن خۆرئاواوە جڵەوکراوبێت. واتە ڕۆشنبیرییەك بەرهەمبهێنێ کە کۆیلەی ڕابردوو یان خۆرئاوا نییەو پەیوەندیی

نێوان گشتو تایبەت بەجۆرێك چارەسەردەکات کە دوورە لە سازانچێتیو هەڵبژاردەچێتی (تەوفیقەتو ئینتیقائیەت). ئەمە کێشەی ئێستای ڕۆشنبیریی ئێمەو چۆنیەتی مامەڵەکردنە لەگەڵ ئەو مەسەلەو ئیشکالیەتانەی دەریدەبڕێتو گەلێکن: لەسەر ئاستی پەیوەندیی ڕۆشنبیریو سیاسی کۆمەڵێك ئاستەنگ خۆدەخەنەڕوو، گرنگترینیان سەختیی ڕەخنەگرتنە لە کارپێکردنی سیاسی، ئەمە وێڕای سانسۆری ڕەسمیو کاریگەریی قوڵی لەسەر بەرهەمهێنانی دیاردەی سانسۆری خۆییو تەسکبوونەوەی پانتایی کۆمەڵایەتی کە بەردەوام فشاردەخاتە سەر ژیانی ڕۆشنبیریو لە سنوورێکی تەسکی دەستەبژێری ڕۆشنبیراندا گیریدەکات. لێرەشدا دابڕانی ئەو ڕۆشنبیرانە لەگەڵ خەڵكو بەپیرەوەنەچوونی پێداویستیو خەمەکانو کێشەکانی خەڵك گرنگترین کێشەیە، واتە شکاندنی پەیوەندیی نێوان بەرهەمهێنو وەرگری ڕۆشنبیری. بەدەربڕینێکی دی، ڕەتکردنی دەستەبژێریی ڕۆشنبیریو زاڵبوون بەسەر دۆگماییەتدا، جا ئەوە لەسەر دەستی ڕەبەندەکان بێت یاخود ئەو مارکسیستە تەقلیدیانەی دەمارگیریو بەسەرخۆدا داخرانو ڕەقهەڵاتنیان چەسپاندوە، نەك کرانەوەو دیالۆگو پلورالیزم.

تەسکیی بواری ڕۆشنبیریو سنوورداری گۆڕەپانی ڕۆشنبیریی کراوە بەڕووی هەموو شیانەکانی بیرکردنەوەو ڕزگاربوو لە فشارو دەسەڵاتخوازیی هەموو شێوەکانی سەروەریو دەسەڵاتەکان، جا بڕواخوازیی ئایینی بێت یاخود سیاسی، بۆتە هۆی پیواری شیانی جڵەوکردنو ڕەتکردنی ئایدیۆلۆژیا باڵادەستەکان، لە ڕووی مەعریفییەوە[10].

## لەبارەی ئیشکالیەتی لاوازیی کەڵەکەبوونو دابڕانی کاری کۆمەڵایەتیەوە

لێرەدا لە گریمانەیەکەوە هەنگاوهەڵدێنین کە دەکرێت بەدوایدابچینو گەشەی پێبدەینو وەك هەر گریمانەیەکی دیکەش ڕەتیبکەینەوەو وەلاوەی بنێین. ئەم گریمانەیە پشت بە هەڵهێنجانێك دەبەستێ کە پێویستی بە سەلماندنە: کۆمەڵگەی ئێمەو کۆمەڵگە تازەپێگەیشتوو و پاشکۆکان خاوەن کەڵەکەبوونی لاوازن لەسەر ئاستی کاری کۆمەڵایەتی (مادیو ڕۆحی)، ئەم کەڵەکەبوونە وێڕای لاوازی ناتوانێت بەردەوامبێو گەشەبکات، جا بەهۆی هۆکاری دەرەکیەوە بێت (کۆلۆنیالیزم–ئیمپریالیزم) یاخود بەهۆی دەستەبژێرە فەرمانڕەواکانی ناوخۆوە بێت، کە کەمێکی لێدەرچێت بە نائارامیو کتوپڕی جیاکارەدەکرێن، واتە تێکەڵی کیانی کۆمەڵایەتی نییەو دەربڕێکی ئازادانەی هێزو ناوەندە بنچینەییەکانی ئەو کیانە نییە. ئەمەش بۆتە هۆی گۆڕانی بەردەوامو ڕەتکردنەوەی هەموو ئەو دەستکەوتانەی دەستەبژێرەکانی پێشوو بەرهەمیانهێناوە، چونکە هەمیشە دەستەبژێری پاشتر هەڵناستێت بە تەواوکردنی ئەوەی دەستەبژێری پێشتر دایمەزراندوە، بەڵکو ڕەوایەتیو زامنی بەردەوامیی خۆی لەسەر بنەمای وێرانکردنی ئەوە بنیاتدەنێ کە پێشتر ئەنجامدراوە، واتە لە سفرەوە دەستپێکردنەوە.

ئەنجامی ئەوە هەمیشە دەرفەتی زیاتر دراوەتە شمشێربەدەست تاوەکو قەڵەمبەدەست[11]. ئەمەش لە دوو هەوڵدانی ڕێنسانسخوازی دیاری مێژووی نوێو هاوچەرخدا بەدەردەکەوێت، واتە ئەزموونی محەمەد عەلیو جەمال عەبدولناسر. پێدەچێت

ڕووداوەکانی ئەم دواییەی کەنداویش هێمابن بۆ هەمان مەسەلە. جالێرەدا دەپرسین: ئایا هۆکاری دەرەکی، وێڕای گرنگیی ڕۆڵی نێگەتیڤانەو ئاستەنگخواز، بەسە بۆ لێکدانەوەی دیاردەکە یاخود مەسەلەکە بەرهەمی کارلێککردنی تۆڕێك پەیوەندییە کە گرێدراوی ئاستی گەشەکردنی کۆمەڵگەو ئامڕازەکانی خۆدەربڕینێتیو پەیوەندیی بە توانای خەڵکەوە هەیە بۆ زانینی بەرژەوەندییە گشتیە هاوبەشەکانو هێنانەدیانو پاراستنیان؟ ئایا زۆرداریی ڕۆژهەلاتی بەناوبانگ لە ڕوی مێژووییەوە بەرپرسی ئەم دیاردەیە نییە؟ ئایا ئەوە پێویستی بەوە نییە ئەو پەیوەندییانەی دەسەلات هەڵوەشێنرێنەوەو شیبکرێنەوە کە بە درێژایی قۆناغە مێژووییە دورودرێژەکان بەرهەمهێنو سەرلەنوێ بەرهەمهێنی زۆرداری بوون ؟ ئایا ئەوە پەیوەندیی بە بوونمان، تێگەیشتنمان بۆ خۆمانو پەیوەندیمان بەوانی دیکەوە نییە؟ بێگومان ئەم بابەتە توانای بەدواداچوونی هەموو ئەو لایەنانەو وەلامدانەوەی هەموو پرسیارەکانی نییە، بەلام هەوڵدەدات لە ڕەوتی گفتوگۆکردن سەبارەت بە هۆکانی لاوازیی کەڵەکەبوونی کاری کۆمەلایەتی لە کۆمەڵگەی هاوچەرخماندا ڕۆشنایی بخاتە سەر گرنگترینی ئەو پرسیارکردنەوانە.

## خەسڵەتە بنچینەییەکانی کۆمەڵگەکەمان

ئەگەرچی ئاخاوتن دەربارەی کۆمەڵگەکەمان بەشێوەیەکی گشتی دەبێتە هۆی لەناوبردنی هەندێك جیاوازی لەئاستی ئەو گەشەکردنەی ناوچەیەك بەدەستیهێناوە، پێمانوایە نیشتیمانەکەمان یەکەیەکی شیکاریی گونجاوە بۆ قسەکردن دەربارەی گۆمەڵگەی شارستانی، بەتایبەتی کە هۆکارەکانی تەبایی و لێك نزیکی ئەو کۆڵەکەیە پێکدێنن کە هەر گەشەکردنێکی داهاتووی شایانی مانەوە لە سەریان ڕادەوەستێ. لێرەوە گرنگیی ڕۆشنبیری، وەك یەکێك لە گرنگترین هۆکارەکانی یەکبوونی نەتەوەیی و تێکەڵبوونی کۆمەلایەتی، دەردەکەوێت. بەو پێیەی ڕۆشنبیریی هاوبەش یاریدەدەرە بۆ خوڵقاندنی مەرجگەلی گونجاوو هۆشمەندیی خۆیی کە پێویستن بۆ هەر پڕۆژەیەکی داهاتووخوازی وەها کە یارمەتیمان دەدات کاریگەرانە بەشداربین لە ژیواری نوێدا نەك پەراوێز کاربین.

ئەوە مانای ڕەتکردنەوەی خەسڵەتە گشتییەکانی کۆمەڵگەکەمان نییە، کە دەشێت بەکورتیو دوور لە درێژدادڕی بەم شێوەیە دەربڕین: پاشکەوتوویی و پاشکۆیەتی، زۆرداری و پارچەپارچەیی. ئەمە وێڕای بەردەوامبوونو پێکەوەژیانی شێوازەکانی بەرهەمهێنانی پێش سەرمایەداریو شێوازی بەرهەمهێنانی، باو بەپلەو ڕێژەی جیاواز. دەشێت ئەوانەی سەرەوە بەو هۆکارە بنچینەییانە دابنێین کە هێما بۆ کۆڕپەبوونو لاوازیی کۆمەڵگەی شارستانی لای خۆمان دەکەنو بەئاستەنگی بە کردەوەی بەردەمی گەشەکردنی دابنێین.

سەبارەت بە پاشکەوتوویی، دەشێت هێما بۆ دیارترین ڕواڵەتەکانی بکەین: پاشکەوتوویی هێزە بەرهەمهێنەکان، بەردەوامبوونی پەیوەندییە تەقلیدییەکانی بەرهەمهێنانو هاتنی پەیوەندییە نوێکانی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری کە ڕەگداکوتانییە لەناو بنەمای کۆمەلایەتیدا. ئەمە وێڕای پاشکەوتوویی ئابووریو تەکنۆلۆژیی لە جیهانێکدا مۆنۆپۆڵی گەورەو کۆمپانیا فرەڕەگەزی وەها ڕابەرایەتیدەکەن کە خاوەن توانای مەزنو گەشەکردنی تەکنیکی خێران.

لەسەر ئاستی کۆمەڵناسیش، دەشێت جەغت لەسەر تەقلیدیبوونی خێزان و پاشکەوتوویی فێرکردن بکەینەوە، جا لە ڕوی بەرنامەو شێوازەکانەوە بێت یاخود ناوەڕۆکەوە، ئەمەش لە جیهانێکدا کە مەعریفە بۆتە دەسەڵات و هێزێك کە دەشێت بەدەستهێنان و بەشداریکردن لە بەرهەمهێنانیاندا زۆر شت لە سەردەمی بانقی زانیاری و کۆمپیوتەرو هەڵمەتبردن بۆ دۆزینەوەی سروشت پێشکەشبکات. دەبینین خێزانی ئێمە هەرەمی و باوکسالارە، ئەگەرچی زیاتر ڕوی لە شێوازی بەرتەسك کردوە تاوەکو فراوان، کەچی هێشتا دەسەڵاتی باوك ڕەهایەو ژن لە دۆخی سوکایەتیپێکردندایەو پەروەردەکردن پشت بە زۆربۆهێنان و هەرەمیەت دەبری تاوەکو باوەڕپێهێنان. بێگومان ئەمە لە گرنگیی خێزانی ئێمە کەم ناکاتەوە، چونکە پاراستن، دڵنیایی، کەرموگوری سۆزدارو دەروونی لە ڕێگەی ڕەهەندی پێکگەیشتن و ویژدانیی پەیوەندییەکانەوە بۆ تاکەکانی دەستەبەردەکات و پێویستە بەو شێوەیە بپارێزرێ کە لەگەڵ سەربەخۆیی کەسێتی تاکەکەسدا ناکۆك نییە، هەتا تاکەکە بتوانێ وەك کەسێتیەکی ئازادی بەرپرسیار ڕەفتاربکات، چونکە ئەمە دەبێتە هۆی لاوازکردنی پەیوەندییە تەقلیدییەکان و خزمەتگوزاریی پێویست بۆ بنیاتنانی پەیوەندییە نوێی وەها دەڕەخسێنێ کە کەسەکە هەڵیدەبژێرێ و لە ڕێگەیەوە دەتوانێت خۆی دەربڕێت.

بەو پێیە ئیشکالیەتی لاوازیی و دابڕانی کەڵەکەبوون لەسەر ئاستی کاری کۆمەڵایەتی بەواتا فراوانەکەی، کە بە زەمینەیەك دادەنرێت گەشەکردنی (چەندایەتی و چۆنایەتی) دواتری لەسەر دادەمەزرێ، ئەو ئاستەنگانە ڕووندەکاتەوە کە ڕووبەڕووی هەر پڕۆژەیەکی گۆڕانکاریخواز دەبێتەوە، ئەو پڕۆژەیەی دەرگا بەڕوی ئاسۆکانی گەشەکردنی داهاتووخوازدا دەکاتەوە.

لە کۆتاییدا، ئەگەر پێمانوابێت کۆمەڵگەی شارستانی کۆمەڵێك دامەزراوی شارستانی و کۆمەڵایەتی و چەند کەناڵ و دەروازەیەکە بۆ ئەوەی کۆمەڵگەی نوێ بەرژەوەندی و ئامانجەکانی خۆی دەربڕێ و بتوانێ بەرامبەر بە زۆرداریی کۆمەڵگەی سیاسی (دەوڵەت) داکۆکی لەخۆی بکات، ئەوا تێدەگەین ئەو چەمکەی لە زەینی هاووڵاتیانی ئەوروپای خۆرئاواو ئەمریکادا ڕوونە، لە زەینی ڕۆشنبیرانی ئێمەدا ئاڵۆزە، چ جای لە مێشکی مرۆڤی ئاساییدا. هەروەها هێماکردنە بۆ پەیوەندیی کارلێکردنخواز لەگەڵ دەوڵەتدا، بەو پێیەی دەوڵەت پەیوەندییەکانی نێوان تاکەکان و مامەڵەکردنیان، لە ڕێگەی یاسا و ڕێسا باوەکانەوە، ڕێکدەخات. ئەمە لەکاتێکدا کە هەندێك بەرژەوەندیی تایبەتی دەتوانن سیستەمی دەوڵەت تیخبکەن و فرمانی دیاریکراوی نوێی بۆ بگوێزنەوە[12].

پڕۆسێسی پێکهاتن و گەشەکردنی کۆمەڵگەی شارستانی لای ئێمە ئاڵۆزەو مەترسی زۆر دەوروخولیان داوە. هەروەها ئەگەرو گرفتی زۆر لە نوێکاری و چوونە نێو ژیواری سەردەم دامانده‌بڕن کە ڕووخسارە پۆزەتیڤەکانی بریتین لە: ئەقڵانیەت، ڕەخنەگرتن، پراکتیکی مرۆڤانە. لێرەشدا پێویستە هێما بۆ لایەن و ڕواڵەتە پۆزەتیڤەکانی کۆمەڵگەکەمان بکەین، چونکە هاندەرو پێویستن، بەڵام بەمەرجێك کە نەبێتە ئەڵتەرناتیڤێکی خەیاڵپلاوانەی ئەو ئەرك و مەسەلەو ئیشکالیەتانەی واقیعی ئیمڕۆو داهاتوو دەریانده‌بڕن یاخود وەك شێوازێك بۆ گەڕانەوە بۆ "ڕابردوی شکۆدار". ڕاستە ئەو لایەن و ڕواڵەتانە گەشبینی بەخشن،

"بەڵام هاوکات باسکردنی کەموکوڕییەکان، پشتگوێخستنەکان، لادانەکان، هەڵەکان، نەفامی، هۆشیاریی چەوت، بەهانەهێنانەوەی بەرگریخواز یاخود هێرشبەر، گەمەکردن بە مێژوو، مشتومڕە بەسەرچوەکانو ڕیسواکردنی هەموو ئەوانەی کۆمەڵگە پەردەپۆشیان دەکات، مانای جێبەجێکردنی ئەرکێکی ئەقڵیو ڕۆشنبیریی پۆزەتیڤانەیەو یارمەتی ئەوە دەدات هەستکردن بە هۆشمەندی شیاوبێتو جۆرێکە لە بەشداریکردن لە کاری ڕزگارکاردا[13].

## سەرچاوەو پەراوێزەکان

1–بکەرە کۆمەڵایەتیەکان: دەربڕینێکە کۆمەڵناسی فەڕەنسی هاوچەرخ (پییر بۆردیو) بەکاریدێنێ بۆ هێماکردن بۆ دۆخی مرۆڤ لە کۆمەڵگەکانی پێش پیشەسازیدا. لێرەدا بەکارمانهێناوە بۆ هێماکردن بۆ دۆخی هاوڵاتیە ئەوروپاییەکان لە کۆتایی سەدەی حەڤدەهەمدا.

2–الزغل، عبدالقادر: مفهوم المجتمع المدني، محاضرة قدمت الى ندوة القاهرة حول غرامشی والمجتمع المدنی، ص45.

3–المصدر السابق، ص46.

4–هیغل: مبادیء فلسفة الحق، ترجمة تیسیر شیخ الارض، دمشق، 1974، ص227.

5–دابڕانی ئیپستمۆلۆژی: چەمکێکی هاوچەرخەو دەگەڕێتەوە بۆ فەیلەسووفی فەڕەنسی (میشێل فۆکۆ)و مانای ڕوودانی دابڕێنێکی فیکرییەو هەمیشە چەند ئاستێکی مەعریفیو بەیەك جارو لە ماوەیەکی دیاریکراودا دەگرێتەوە. بڕوانە میشێل فۆکۆ: وشەکانو شتەکان.

6–هێماکە لێرەدا بۆ لاوازیی پێگەیشتنی بنەمای ئابووریو کۆمەڵایەتیە لە ڕووسیای تزاری بە بەراورد لەگەڵ کۆمەڵگە ئەوروپیە خۆرئاواییەکان، کە بەپێی شیکردنەوەی مارکسیستانە زیاتر لەوانی تر ئامادەبوون بۆ شۆڕشکردن، بەڵام ئەوەی دۆخ لە ڕووسیا جیاکارەدەکات، پێگەیشتنی هۆکاری خۆیی بوو لە ڕێگەی بزووتنەوەیەکی سیاسیی چالاکەوە کە هاندەری ئەو کارە شۆڕگێڕانەیە بوو بۆلشەفیکەکان ساڵی 1917 پێی هەڵسان.

7–غرامشی، انطونیو: مختارات، جزءان، ترجمة تحسین الشیخ علي، بیروت 1987، ص199.

8–بیوتی، جان مارك: فکر غرامشی السیاسي، ترجمة جورج طرابشي، بیروت 1975، ص18.

9–القش، سهیل: المثقف والسلطة في المجتمع العربي، الفکر العربي المعاصر، العدد 53، تشرین اول1980.

10–ارکون، محمد: تاریخیة الفکر الاسلامي، ترجمة هاشم صالح، بیروت1986، ص233.

11–البزري، دلال: مقترحات اولیة لاستخدام مفهوم المجتمع المدنی في العالم المعاصر. ندوة القاهرة، الطریق، شباط 1991، ص215.

12–رمسیس فرح، نادیة: المثقفون والدولة والمجتمع المدني، ندوة القاهرة، ص246.

13–ارکون، محمد: تاریخیة الفکر الاسلامي، ترجمة هاشم صالح، بیروت1986، ص238.

## سەرچاوە

مجلة "الوحدة"، المجلس القومي للثقافة العربیة، رباط/ المملکة المغربیة،
العدد 91 مارسی 1992، ص(49–56)

# هێزە کۆمەڵگەییە چالاکەکان و ڕۆڵیان لە نوێنەرایەتیکردندا

ئەلان تۆرین

لە عەرەبییەوە: شاهۆ سەعید

دیموکراسی بوونی نییە گەر (توانای) نوێنەرایەتیکردنی نەبێ. هەڵبژاردنی ئازادانەی فەرمانڕەوایان لەلایەن ئەو کەسانەوە کە فەرمانڕەوایی دەکرێن هیچ مانایەکی نییە گەر ئەو کەسانە توانای گوزارشتکردنیان نەبێ لە داخوازییە دیاریکراوەکانیان، یان ئەو پەرچەکردارو پێداویستیانەی کە هەڵقوڵاوی "کۆمەڵگەی مەدەنی"ن. بەڵام ئایا ئەو مەرجانە چین کە وادەکەن بکەرە سیاسیەکان نوێنەرایەتی بەرژەوەندی هێزە کۆمەڵگەییە چالاکەکان و پرۆژەکانیان بکەن.

## هێزە کۆمەڵگەییە چالاکەکان و بکەرە سیاسیەکان

بەو پێیەی بەرژەوەندیەکان هەمەلایەن و هەمەجۆرن، هەروەها بەو پێیەی هەر دەنگدەرێك زنجیرەیەك پێداویستی دیاریکراوی هەیە کە پەیوەستن بە چالاکیە پیشەیی‌و خێزانیەکانیەوە، یان پەیوەندییان بە پەروەردەکردنی ماڵومنداڵو ئاسایش و ئارامییەوە هەیە... هتد" هەربۆیە مەحاڵە سیاسەتێك دەستنیشان بکەین بۆ نوێنەرایەتیکردنی بەرژەوەندیەکانی زۆرینە یان ژمارەیەك لە کەمینە گرنگ و چالاکەکان. لەپێناو هاتنەئارای سیفەتی نوێنەرایەتیدا، پێویستە هاریکارییەکی زۆر بۆ دەستەبەرکردنی داخوازی کەس و کەرتە هەمەجۆرو لێکجیاوازەکانی ژیانی کۆمەڵگەیی لەئارادابێ. هەروەها بۆئەوەی دیموکراسی خاوەنی بنەماگەلێکی کۆمەڵگەیی پتەو بێ، پێویستە گوڕی زیاتر بدرێ بەو پرنسیپە لەپێناو گەیشتن بەوپەڕی ئامانجەکانی‌و لێك نزیککردنەوەی نێوان داخوازیە کۆمەڵگەییە تایبەتەکان و نمایشە سیاسیەکان، یان بە مانایەکی ساناتر لەنێوان توێژە کۆمەڵگەییە تایبەتەکان و

پارته سیاسییه دیاریکراوەکاندا. چونکه گەر دووربکەوینەوه لەم دۆخه، ئەوا پارته سیاسیەکان دەبنه هاوپەیمانی گروپەکانی بەرژەوەندی، ئەو گروپانەش تەنانەت گەر کەمایەتیەکی زۆر کەمیش پێکبێنن، دەتوانن بە تایەکی ترازوەکەدا بیشکێننەوەو سەرەنجام ببنه خاوەنی قورساییەك یان دەسەڵاتێك کە لەگەڵ بایەخی بابەتییاندا ناگونجێ. هەربۆیە دیموکراسی دەگاتە ئەوپەڕی هێزی خۆی کاتێ پشت دەبەستێ بە نەیارییە کۆمەڵگەییە بەرفراوان و گشتیەکان، بۆ نمونه وەك پشتبەستن بەو شتەی کە کەلەپوری خۆرئاوایی ناوی ناوە ململانێی چینەکان، هاوکات لەگەڵ پشتبەستن بە ئازادی سیاسی. چونکه هەروەك چۆن کارکردن بۆ ڕوخاندنی دەسەڵات لەڕێگای هێزەوە، یان سڕینەوەی کەمینە دەسەڵاتدارەکان بەو بیانووەی دوژمنی کۆمەڵگەن، یان بانگەشەکردن بۆ سەرخستنی گەلێکی یەکگرتوو، کورتترین ڕێگایە بۆ هێنانەکایەی ڕژێمی دەسەڵاتگەر" بەهەمان شێوە بوونی ململانێیەکی گشتی لەنێوان دوو هێزی کۆمەڵگەیی چالاکدا پتەوترین بنەما پێکدێنێ کە دیموکراسی لەسەر دادەمەزرێ. وڵاتێکی وەك بەریتانیای مەزن کە سەختترین جۆری خەمڵینی چینه کۆمەڵگەییەکان و توندترین ململانێی بەخۆوە بینیوە، ئەو وڵاتەیە کە دیموکراسی تیایدا دۆخێکی زۆر جێگیری بەخۆوە بینیوە، هەروەك چۆن سۆشیال–دیموکرات لە ئەوروپای باکور زەینیەتی دیموکراتی گەیاندە سەرکەوتن لەڕێگەی ململانێیەکی والاوە کە لەنێوان حزبێکی کرێکاریو حزبگەلێکی بۆرجوازیدا هەڵگیرسا، هەروەك سویدیەکان گوزارشتی لێدەکەن. لەبەرامبەردا دەبینین لەو شوێنانەدا کە دەوڵەت، نەك چینی دەسەڵاتدار، بکەری سەرەکی تازەکردنەوەی ئابوری بوون و لەهەمان کاتیشدا پلەبەندیی کۆمەڵگەییان پاراستووه، وەك وڵاتانی ئەوروپای لاتینیو ئەمریکای لاتین، دیموکراسی هەر بە لاوازی ماوەتەوە، بەجۆرێك زۆرجار بزاوتی سیاسی شۆڕشگێڕ دەسەڵاتی پەیداکردووەو ئیدی گرتنەدەستی دەسەڵات لە گۆڕینی پەیوەندیەکانی گۆڕانی کۆمەڵگەیی لەپێشتر بووه.

لە دۆخێکی ئاوهادا کە داخوازییە کۆمەڵگەییەکان پەرەدەستێنن، مشتومڕی سیاسی لە نێوان دوو حزبدا تۆخدەبێتەوه. مەرجیش نییە ئەو دوو حزبە هەڵگری پێناسەیەکی چینایەتی بن وەك ئەوەی لەو دوو دۆخەی پێشوتردا باسمانکرد. بەڵکو ڕەنگە یەکێك لەو دوو حزبە نوێنەرایەتی گروپێکی کۆمەڵگەییو کولتوریی مەرکەزی بکاو یەکێکی تریشیان نوێنەرایەتی گروپی ئەو کەمینانە بکا کە بەهۆی کۆچەوە دروستبوون، ئەو دۆخەی کە لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا ڕوویدا بەڵام ئەمڕۆ لە جاران کەمتر بۆتەوە. ساناکردنەوەی ژیانی سیاسی، لە زۆر وڵاتاندا ناگاتە ئاستێکی لەمجۆره، بەڕادەیەك پێویستە هاوپەیمانی لەنێوان ئەو هێزە سیاسیانەدا گرێبدرێ کە لەیەك کاتدا تێگەیشتنیان بۆ توێژە کۆمەڵایەتیەکان و داخوازیە سیاسییە جیاوازەکانیش هەیە. گرێوگۆڵەی ئەم نوێنەرایەتیکردنە سیاسییە لەگەڵ فشاری دەوڵەت بۆسەر ژیانی کۆمەڵگەیی زیاتر دەبێ، چونکە ژیانی کۆمەڵگەیی بەشێوەیەکی پەرت و لێکترازاو خۆی دەبینێتەوە لەئاست ئەو دەوڵەتەدا کە پشتی پێدەبەستێ، هەروەك کێشەی بەدەست کەم توانایی لەئەنجامدانی کرداری سەربەخۆدا هەیە. لێرەوە زۆرجار فەرەنسا، بەگوێرەی شیکردنەوەکەی رینیه ریمۆن، بەلایەنی کەمەوە سێ هێزی راستڕەوو و دوو هێزی چەپڕەوی بەخۆوە بینیوە، لەو کاتەوەی

لەساڵی 1920 دا حزبی سۆشیالیست بەهۆی شۆڕشی سۆڤێتییەوە تەقیەوە، زۆرینەی ئەو حزبەش دوای ئەو شۆڕشە کەوت هەرچەندە کەمینەیەك ئەوەی ڕەتکردەوە کە بچێتەپاڵ ئەنتەرناسیۆنالی سێیەم. ئەڵبەتە ئاساییە سیستمی هەڵبژاردن کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر ژمارەی حزبەکان هەبێ، بەڵام لەهەمان کاتدا ئەوەش بەدی ناکرێ کە گرنگیدانی بەریتانیای مەزن بە سیستەمی (زۆرینەی فەردیی تاك-خولی) دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە کۆمەڵگەی ئینگلیزی لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەوە ململانێیەکی بەردەوامی تێدایە لەنێوان جەنتڵمان (پیاوماقوڵان)و ۆرکنگ کلاس (چینی کرێکاران).

بەڵام مەرجی دووەمی نوێنەرایەتیکردن کە هێزە کۆمەڵگەییە چالاکەکان هەیانە زادەی مەرجی یەکەمە. پێویستە توێژە کۆمەڵگەییەکان توانای خۆڕێکخستنیان هەبێ بەشێوەیەکی سەربەخۆ، بەتایبەتی لەسەر ئاستی ژیانی کۆمەڵگەیی، واتە لەسەر ئاستە بەرزەکانی ژیانی سیاسی. ئەمجۆرە سەربەخۆییە لە کەلەپوری خۆرئاواییدا بە باشترین شێوە خۆی سەلماندو هاتەئاراوە. ژیانی سەندیکایی لە کەلەپوری خۆرئاواییدا ئەوەی خواست کە حزبی کرێکارییو سۆشیالیستی پێکبێنێ بۆ نوێنەرایەتیکردنی باڵی سیاسی، ئەو دۆخە بەدیاریکراوی لە حزبی کاری ئینگلیزیدا بەرجەستەبوو کە لەبنەڕەتدا سەر بە سەندیکاکانی یەکێتی *TUC* بوو. لە سویدیش ئەو پەیوەندیانەی کە یەکێتی سەندیکاکان *LO* دەبەستێتەوە بە حزبی سۆشیال- دیموکراتەوە هەمان سروشتیان هەیە. بارودۆخەکە لە ئیتالیاو ئیسپانیاش هیچ جیاوازییەکیان نیە، چونکە یەکێتی سەندیکاکان لەهەر وڵاتەو گرێدراوی حزبێکی سیاسییە، بەلانی کەمەوە تا ئەو دواییانەش لە ئیسپانیا *UGT* کەوتە ململانێوە لەگەڵ حزبی سۆشیالیستی دەسەڵاتداردا *PSOE* . بەڵام لە فەرەنسا پەیوەندی نێوان *CGT* و حزبی کۆمۆنیست پەیوەندیەکی زۆر پتەوە، زۆرجاریش هەڵسوڕاوە سەندیکاییەکانی *CFDT* هەست بە نزیکایەتی دەکەن لەگەڵ سەندیکای *FO* کە پەیوەندی زۆر مکومی لەگەڵ حزبی سۆشیالیستدا هەیەو لەهەمان کاتدا پێشوازی لە ڕێژەیەکی باشی دەنگدەری ڕاستڕەو و خەباتگێرانی ئەوپەڕی چەپیش دەکا. هەرچی پەیوەندی بە خاوەن کارەکانیشەوە هەیە، ڕێکخراوە پیشەییەکان ڕۆڵێکی هاوشێوە دەگێڕن کە بەهۆی پەیوەندی ڕاستەوخۆی نێوان فەرمانڕەوایان و بەرپرسە ئابووریە دیارەکانەوە بەهێزتر دەبێ. بەڵام ئەگەر پێچەوانەکەی ڕووبداو داخوازیە کۆمەڵگەییەکان تەنها لەسەر ئاستی سیاسی یەکخران، ئیدی چۆن دەکرێ سەبارەت بە دیموکراسی نوێنەرایەتیکردن قسەبکەین؟ لەکاتێکی وادا دۆخەکە بەشێوەیەکی مەترسیدار لە دژە دیموکراسی نزیکدەکەوێتەوە، واتە کۆمەڵگەی سیاسی جەماوەری. پەیوەندی نێوان ژیانی کۆمەڵگەییو ژیانی سیاسیش نەك تەنها ڕاستەوخۆیە، بگرە بە بواری ئەو یانەو ڕۆژنامەو یەکێتیو نێوەندو کۆمەڵە ڕۆشنبیرانەدا دەگوزەرێ کە هەڵبژاردنە سیاسیەکان ئاڕاستەدەکەن و لەهەمان کاتیشدا بەشداری لە پێکهێنانی ئامانجی حزبە سیاسیەکاندا دەکەن لە چەند بوارێکی ژیانی کۆمەڵگەییدا.

### قەیرانی نوێنەرایەتیکردنی سیاسی

ماوەیەکی درێژە لە زۆر وڵاتی خۆرئاواییدا بە پێداگرتنێکی زۆرەوە قسە لە قەیرانی نوێنەرایەتیکردنی سیاسی دەکرێ، ئەو قەیرانەی

کە بەبڕوای قسەکەران بەرپرسیارە لە لاوازی بەشدرایکردن. لە ڕاستیدا ئەمجۆرە قسانە دوور نین لە ڕاستیەوە، چونکە بنەما کۆمەڵگەییەکانی ژیانی سیاسی لاوازبووەو ڕووتبۆتەوە بەو ئەندازەیەی وڵاتانی خۆرئاوا قۆناغی کۆمەڵگەی پیشەسازییان تێپەڕاندووە، ئەو قۆناغەی کە مەحکوم بوو بەکێشەی نێوان خاوەن کارو کرێکاران. بەشی زۆری دانیشتوانی چالاکی ئەو وڵاتانە نە سەر بە دنیای کرێکاران و نە سەر بە دنیای خاوەن پرۆژەکانیشن، تەنانەت گەر پیشەوەری بچوك و بازرگانیش بن. ئەڵبەتە دنیای کارپێکراوەکان تەنها درێژبوونەوەی دنیای کرێکاران نیە، هەروەها توێژی کادرەکان توێژێکی دوورە لە جێبەجێکەران و خاوەن بڕیارەکان. جگە لەوەی بەرخۆریو پەیوەندی جەماوەری، بزاوتی کۆمەڵگەییو کۆچ، فرە نەریتیو بەرگری لە ژینگەو پشتبەستن بە بەرهەمی پیشەسازی... (خەسڵەتی) ئەم جۆرە کۆمەڵگانە دیاری دەکا، بەجۆرێك مەحاڵە ژیانی سیاسی لەسەر مشتومڕو کێشمەکێش و توانای ئەو هێزە چالاکانە بنیات بنرێ کە تەنها بەشێوەیەکی ڕێژەیی پەیوەندییان بە واقعی هەنوکەییەوە هەیە. ئەو دۆخە بەسەریەکەوە بۆتەهۆی سەربەخۆییەکی زۆری حزبە سیاسیەکان و جیابوونەوەیان لە هێزە کۆمەڵگەییەکان، هەروەها بۆتە هۆی گەڕانەوەی ئەو حزبانە بۆ ئەو تێگەیشتنەی کە بەسەر ئەزموونی ئینگلیزیدا زاڵبوو لە ڕۆژگارێکدا کێبڕکێ لەنێوان وێگزو تۆرێزدا هەبوو. ئیدی هەندێ کەس وردە وردە ئەو باوەڕەیان پەیداکرد کە پێویستە حزبەکان ئەو لایەنە جیاوازانەی فەرمانڕەوایی پێکبێنن کە دەنگدەرەکان لەنێوانیاندا بە ئازادانە هەڵدەبژێرن. بەڵام لەڕاستیدا ئەم وێنەیە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا لەهیچ شوێنێك دروست نیە. چونکە ڕاست نیە بووترێ کۆمارییەکان و دیموکراتەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هیچ نین جگە لە دوو هاوپەیمانێتی کە لەپێناو هەڵبژاردنی سەرۆکایەتیدا دامەزراون. چونکە بەشێکی زۆری جەماوەری هەردوو حزبەکە جێگیرو نەگۆڕن و لەگەڵ چەند هەڵبژاردنێکی کۆمەڵگەییو ئابوریدا شوناسگۆڕکێ دەکەن. دەشێ فەرەنساو ئیتالیا ئەو دوو وڵاتە بووبن کە لەچەند ساڵی ڕابردوودا لاوازترین ڕووبەری نێوان حزبە سیاسیەکانیان پێکهێنابێ. لە فەرەنسا، کە پێداویستیەکانی ژیاندنەوەی ئابوری، چەپی سۆشیالیستی لە ساڵی 1984 بەدواوە، ناچارکرد سیاسەتێکی لیبراڵی ئەرسەدۆکسی پێڕەوبکا کە تا ساڵی 1986 و دواتریش تا ساڵی 1993 هیچ هەموارکردنێکی بەخۆوە نەبینی. بەڵام لە ئیتالیا، حزبی دیموکراتی مەسیحیو حزبی سۆشیالیست بۆ ماوەیەکی درێژ بەشدارییان لە دەسەڵاتدا کرد لە هاوپەیمانیەکدا کە دەرگای لەبەردەم گەندەڵیدا کردەوە، ئەو دۆخەی کە حزبی کۆمۆنیستی جاران و ڕاسترەوی پەڕگیر سوودیان لێوەرگرت. بەهەرحاڵ ئەو دوو وڵاتە، هەروەها ئوستورالیا کە دەسەڵاتی سۆشیالیستی سیاسەتێکی ئابوری لیبراڵی پێڕەوکرد، لەو وڵاتانەن کە تیایاندا زۆر بەتوندی باس لە قەیرانی نوێنەرایەتیکردنی سیاسی دەکرێ. چونکە لەکاتێکدا سیاسەتی ئەو حزبانەی ناونرابوون ڕأسترەوەو و چەپڕەو هیچ کێشەو ململانێیەکی دیار لەنێوانیاندا نەبوو، هوشیاریەکی زۆر لای ڕای گشتی هەبوو بەوەی ململانێی کۆمەڵگەیی نێوان چەپ و ڕاست هەر بەردەوامە. دەشێ سەربەخۆیی تەواوی حزبە سیاسیەکان لایەنی ئیجابی هەبێ، کاتێ سنوربەندی کۆمەڵگەییان کاڵدەبێتەوەو زیاتر لە ڕەوانبێژی ئاخاوتنەوە نزیکن نەك پراکتیك. بەڵام

لەڕووی مەبدەئییەوە زیانیان زیاترە لە سوودیان. دیموکراسی ئەمریکی هێزی پەیداکرد کاتێ بەم دواییانە حزبی دیموکرات سنوری کۆمەڵگەیی خۆی دیاریکرد. لێرەوە شکستی گەورەی حزبی سۆشیالیستی فەرەنسا زیاتر پەرەدەستێنێ گەر بەخێرایی هەنگاونەنێ بەرەو دیاریکردنی سنورێکی کۆمەڵگەیی نوێ، یان گەر بە ڕاشکاوی گرنگترین گرفتە کۆمەڵگەییەکان لە گۆشەنیگای خۆیەوە دیاری نەکاو شێوازی چارەسەرکردنی ئەو گرفتانە نەخاتەڕوو.

ئەوەی گۆڕانی بەسەردێ پاشکۆیەتی پێویستی هێزە سیاسیەکان نیە بۆ داخوازییە کۆمەڵگەییەکان، بەڵکو سروشتی ئەو داخوازیانەیە بەدیاریکراوی. کاتی خۆی حزبەکان نوێنەرایەتی چینە کۆمەڵگەیەکانیان دەکرد، بەڵام لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا نۆێنەرایەتیان بەرفراوان بووەو پڕۆژەکانی ژیانی کۆمەڵگەییش دەگرێتەوە، بگرە نوێنەرایەتی بزاوتە کۆمەڵگەییەکانیش دەکەن. بیرۆکەی چینی کۆمەڵگەیی پێشتر شوناسی لەو لێکچواندنە وەردەگرت کە لە یەك کاتدا لە نێوان دۆخێکی کۆمەڵگەیی دیاریکراوو هێزێکی چالاکی کۆمەڵگەیی‌و سیاسیدا سازیدەدا. چونکە کرداری چینایەتی‌و پەیوەندیەکانی بەرهەمی کۆمەڵگەیی لەیەکدی نەدەترازان، هەروەك چۆن لای ڕاستڕەوەکان بیری لیبراڵی لە یاساکانی بازاڕ ناترازێ. ئەم دەستنیشانکردنە "بابەتی"یە بۆ هێزە کۆمەڵگەییە چالاکەکان لە لاوازبووندایە، بێ‌لەوەی ئەو لاوازبوونە ببێتەهۆی وازهێنان لەو پەیوەندییە پێویستەی لەنێوان هەڵبژاردنە سیاسیەکان و بەرژەوەندی هێزە کۆمەڵگەییە چالاکەکاندا هەیە یان دەسبەرداربوون لەو بەهایانەی کە بەگوێرەی پێگەی ئەو هێزانە لە دەسەڵاتدا دیاریدەکرێن، بەپێچەوانەوە، کاتی خۆی دەستنیشانکردنی "بابەتیانە" بۆ هێزە کۆمەڵگەییە چالاکەکان مافی پاوانکردنی مانای کاری دەستەجەمعی دەبەخشیە حزبەکان، بەو حوکمەی گوزارشتیان لە "هوشیاری چینە کۆمەڵگەییەکان بەرامبەر خودی خۆیان" دەکرد. بەڵام کاتێ کاری کۆمەڵگەیی لە داواکردنی ئازادیدا بەرجەستەدەبێ، یان دەبێتە بەرگریکردن لە ژینگەو ئاووهەوا، یان خەبات دژی "بەبازاڕیکردنی" سەرجەم لایەنەکانی ژیان، لەکاتێکی وادا بەپێچەوانەوە بەرپرسیار دەبێ لەئاست مانای تایبەتی خۆیدا. بگرە دەشێ ببێتە حزبێکی سیاسی، یان بایەخەکانی خۆی بسەپێنێ بەسەر حزبێك لەو حزبانەدا کە پشتیوانی لێدەکاو پێگەی بەهێزتر دەکا.

هەرەسهێنانی ڕژێمە سۆشیالیستەکان، لە کۆمۆنیزمی لینینیەوە تا سۆشیالیستی دیموکراتی، بەر لەهەر شتێك بەهۆی بەزۆر بەستنەوەی بزاوتی کرێکارانەوە بە حزبێکی دیاریکراوەوە ڕویدا، سەرەتا ئەو حزبانە شۆڕشگێڕ بوون بەڵام دواتر بوونە خودی دەوڵەت. ناکرێ دیموکراسی نوێنەرایەتیکردن لەئارادا بێ، بەبێ بوونی ئەو هێزە کۆمەڵگەییە چالاکانەی کە لەتوانایاندایە مانا بە کارو چالاکیەکانی خۆیان ببەخشن و ئەو مانایە لە حزبە سیاسیەکان وەرنەگرن. ئەمە ئەو بابەتەیە کە هزری دیموکراسی، یان بەلانی کەمەوە دیدی ئێمە بۆ ئەو هزرە لەگەڵیدا ناکۆکە، ناکۆکیەك لەگەڵ جاکوبیەتی (یەعقوبیەت)ی فەرەنسی، بەشێوەیەکی تایبەتی‌تریش لەگەڵ لینینیزمدا، ئەو دوو ڕەوتەی کە دەبێ وەك دوو هێزی دژ بە دیموکراسی تەماشابکرێن، جا بەهۆی دیدی گشتییانەوە بێ یان بەهۆی کردەوە مێژوییەکانیانەوە بێ. دیموکراسی

بەشێوازە فەرەنسییەکەی یان بەو جۆرەی لە ئەمریکای لاتین هەیە، هەروەها ڕژێمی شۆڕشگێری سۆڤێت کە دەسبەجێ پەیوەندی خۆی بە دیموکراسییەوە پچڕاند، دووچاری مەترسیەکی گەورە دەبنەوە کە بریتیە لە کورتکردنەوەی هێزە کۆمەڵگەییەکان بۆ جەماوەر، یان بۆ کەرەستەگەلێکی سیاسی، لەوێشەوە بۆ لەناوبردنی خۆبەخۆ" چونکە کاری کۆمەڵگەیی دەلکێندرێ بە ڕەفتاری سیاسییەوە. ئەو جۆررە ڕەفتارانەش گەر سەربگرن دەبنە خاوەنی چەکەکانی دەسەڵات، لەبەرامبەریشدا ئەو هێزانە نامێنن کە توانای سنوردارکردنی ڕەفتاری سیاسییان هەیە.

بەڵام ئەم ڕەخنانە، چەندە مایەی مەترسی بن، نابێ بمانخەنە هەمان ئەو هەڵەیەوە کە پێشتر خۆمان لێ پاراست، واتە تەماشاکردنی ئەو جۆرە دیموکراسییەی کە بە دیموکراسی فەرەنسی ناودەبرێ وەك جۆرێکی تایبەتی پەراوێزخراو. چونکە ئەو دیموکراسییە ئەو بایەخە مێژوییەی نەدەبوو گەر دەرەنجامی کۆمەڵگەیی پۆزەتیڤی نەبوایە لەپاڵ کاردانەوە سیاسیە مەترسیدارەکانیدا. پەنابردنی ئەو دیموکراسییە بۆ گەل کاری دیموکراسی بەستەوە بە بەرەنگاربوونەوەی ڕاستەوخۆی هەموو جۆرەکانی نایەکسانی کۆمەڵگەییو دەسەڵاتی پارە. زەینیەتی یەکسانی کە کۆماریخوازە فەرەنسیەکان بانگەشەیان بۆ کرد گەشەیدا بەو قوتابخانە ڕەسمییەی کە ویستی ڕێنماییەکانی خۆی لەنێو ئەندامەکانی کۆمەڵگەدا بڵاوبکاتەوە. لێرەوە ئەو حکومەتانەی کە بەمجۆرە لە دیموکراسی گەیشتبوون هەوڵیاندا کاری خۆیان ببەستنەوە بە بەرژەوەندیەکانی نەتەوەوە، هەرچەندە ئەمە وتەزایەکی سیاسییە بەڵام کۆمەڵگەییشەو بارکراوە بە چەند پرنسیپێکی گشتی، لەو دروشمەدا دەردەکەوێ کە دەڵێ: ئازادی، یەکسانی، برایەتی. گەر مرۆڤ ڕەخنەش لە ئایدیۆلۆجیای کۆماری سێیەم و ئایدیۆلۆجیای ڕژێمە نەتەوەییە -مىللییە لاتینیە ئەمریکیەکان- بگرێ، بەو پێیەی ناچنە بەرەنگارییەکی ڕأستەقینەوە لەگەڵ زوڵم و بەربەستە کۆمەڵگەییەکاندا، بەڵام هەر ناتوانێ جۆری دیموکراسی فەرەنسی لە هەموو بەها ئیجابیەکانی داماڵێ. بەڵکو ڕاستر ئەوەیە بووترێ دیموکراسی فەرەنسی زیاتر لە خزمەتکردنی چینی ناوەڕاستەوە نزیکە، وەك فەرمانبەرو توێژەکانی سەر بە دەوڵەت -لە ئەمریکای لاتین هەر وەك لە فەرەنسا- و کەمتر لە خزمەتکردنی گەل و ئەو خەڵکانەوە نزیکە کە بە وریاییو بەجۆرێکی شەڕانگیزانە مامەڵەی لەگەڵ دەکردن هەروەك مامەڵەکردنی لەگەڵ نوخبە دەسەڵاتدارەکانی پێشو، بەڵام بەربەستە کولتوریەکان لەنێوان چینەکاندا لە بەریتانیای مەزن زیاتر بوون لەوانەی لە فەرەنسا هەبوون. کۆمەڵگەی ئینگلیزی ماوەیەکی درێژتر مۆرکی چینی ئۆروستوکراتی پێوە مابوو کە شۆڕش نەیڕوخاندبوو. ئیدی هەموو جۆرێك لە جۆرەکانی دیموکراسی خاڵی لاوازو ڕەگەزی بەهێزیشی هەیە. ئەو مافەشمان نیە تەنها یەکێك لەو جۆرانە بسەلمێنین و بڵێین لەگەڵ سروشتی دیموکراسی گشتیدا دەگونجێ.

## گەندەڵی سیاسی

چی ڕوودەدا کاتێ هێزە سیاسییە چالاکەکان گوێ نادەنە داخوازیی هێزە کۆمەڵگەییە چالاکەکان؟ هێزە سیاسیەکان کاتێ هاوسەنگییان بەمجۆرە تێکدەچێ، بەلای دەوڵەتدا دایدەشکێننەوە، بەمەش یەکەمین مەرجی بوونی دیموکراسی لەناودەبەن کە

بریتیه له سنوردارکردنی دەسەڵاتی دەوڵەت. بەڵام گەر ئەو دۆخە ڕوونەدا، ئەوا کۆمەڵگەی سیاسی دەتوانێ خۆی ڕزگاربکا لەو پەیوەندیانەی کە لەیەك کاتدا دەیبەستێتەوە بە کۆمەڵگەی مەدەنیو دەوڵەتیشەوە. ئیدی هیچ ئامانجێکی نامێنێ جگە لە کارکردن بۆ سەقامگیرکردنی دەسەڵاتی تایبەتی خۆی. واتە ئەو دۆخەی کە لەگەڵ بارتیتۆکرازیا[1] دەگونجێ، یان حزبۆکراتی، کە ئیتالیەکان لە دژی خراپەو زیانەکانی دەوەستنەوە. ئەو دۆخە بووەهۆی گەڕانەوەی حوکمی ڕای گشتی تا ئاستێکی زۆر لە چەندین دەوڵەتی ئەوروپاییو ئەمریکای لاتین، هەر لە پیرۆوە تا بەرازیل و لەوێشەوە تا ئەرجەنتین.

ڕای گشتی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ باس لە گەندەڵی دەکا. لە ڕاستیدا ئەم وشەیە ڕاسترین گوزارشتە گەر بڕوامان وابێ دیموکراسی پێویستە نوێنەرایەتیکار بێ، هێزە سیاسیەکان و بە تایبەتیش حزبەکان، پێویستە لە خزمەتی بەرژەوەندیە کۆمەڵگەییەکاندا بن نەك لە خزمەتی خۆیاندا. ئەمە لەکاتێکدا گەر گەندەڵی شەخسی سەرکردە سیاسیەکان بخەینە ئەولاوە، ئەو گەندەڵیەی کە لە ئیتالیا گەیشتە ئەوپەڕی، بەڵام لە وڵاتەکانی دیکەی ئەوروپا بەشێوەیەکی کەمتر بڵاوبۆوە، لە کاتێکدا ئەو دیاردەیە لە زۆربەی وڵاتانی تری جیهاندا جگە لە ئەوروپا تەشەنەی کردووە، هەر لە ژاپۆنەوە تا ئەمریکا، لە جەزایرەوە تا ڤنزوێللا. مەترسیدارترین جۆرەکانی گەندەڵ دژی دیموکراسی ئەو جۆرەیە کە وا لە حزبە سیاسیەکان دەکا داهاتێکی زۆر بۆ خۆیان خڕبکەنەوە بەجیا لە خواستی ئەندامەکانیان، بەجۆرێك ئەو حزبانە دەتوانن کاندیدەکانی خۆیان بۆ هەڵبژاردن دیارییبکەن و بردنەوەیان بۆ مسۆگەر بکەن و پرنسیپی هەڵبژاردنی فەرمانڕەوایان لەلایەن فەرمانڕەواییکراوانەوە پێشێل بکەن. ئایا دەکرێ باس لە دیموکراسی بکەین لەکاتێکدا هەڵبژاردن بەپێی ڕۆڵی ڕۆتن برۆگز[2] ئەنجامبدرێ، ئەو ڕۆڵەی لە ئینگلتەرا لە سەدەی نۆزدەدا پێڕەوکرا، یان بەپێی بەخشینەوەی پارەوپول بەسەر پارێزگا گوندنشینەکاندا وەك ئەوەی لە ژاپۆن کرا، یان ئەو دۆخەی لە ئیتالیا ڕوویدا کاتێ حزبەکان بەشێکی زۆری گرێبەستی دەزگا گشتیەکانیان بۆ بەرژەوەندی ئابوری خۆیان خستەگەڕ؟ ئەوەبوو لە نیسانی 1993 دا، بە دەسپێشخەرییەك لەلایەن ماریۆ سینییەوە، ئیتالیەکان ناڕەزاییان لەئاست ئەو سیستەمەدا دەربڕی کە وڵاتەکەیانی کردبوە "تانجانتۆپۆلی *Tangentopoli*" واتە ئەو وڵاتەی کە بەرتیلی تێدا بەربڵاوە. ئەوەش دەسپێشخەرییەك بوو بۆ بەرگریکردن لە دیموکراسی کە هەرچەندە هەموو گرفتەکانی سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی ژیانی سیاسی چارەسەر ناکا، بەڵام ڕەنگە ببێتەهۆی دامەزراندنی هاوپەیمانی سیاسی ئەوتۆ کە هەڵبژاردنی ڕاستەقینە بۆ دەنگدەرەکان دەستەبەردەکا.

کەس نکوڵی لەوەناکا دیموکراسی بەبێ حزب و بێ بوونی هێزی سیاسی چالاك و ڕاستەقینە بوونی نیە، هەروەك چۆن مەحاڵە مرۆڤ بەشێویەکی جدی باس لە دیموکراسی ڕاپرسیخواز بکا. بەڵام حزبۆکراتی، دیموکراسی لەناودەبا چونکە ڕۆڵی لە نوێنەرایەتیکردندا لێوەردەگرێتەوە، سەرەنجام یان دەبێتەهۆی پاشاگەردانیو بێسەروبەری، یان باڵادەستی گروپە ئابووریە دەسەڵاتدارەکان و هەموان چاوەڕوانی ئەوەدەکەن دکتاتۆرێك دەستوەرداتە دۆخەکە. مەترسی حزبۆکراتی ئەوکاتە پەرەدەستێنێ کە وڵات هەوڵی تێپەڕاندنی

قۆناغی کۆمەڵگەی پیشەسازی دەداو هێزە کۆمەڵگەییە چالاکەکانیش دەچنە قۆناغی لاوازیو لەبەریەکهەڵوەشانەوە. لە ساتەوەختێکی هێندە سەختیشدا ئەگەرێکی زۆر لەئارادایە کە تێگەیشتن لە دیموکراسی تەنها لە تێگەیشتنێکی دامودەزگایی پەتیدا قەتیس بکرێ، یان لە تەنها بازاڕێکی سیاسی کراوەدا کورتبکرێتەوە، کە ئەویش دەبێتەهۆی بۆپاشەوەچون و داڕمانی. بەڵام ڕەخنەگرتن و ناڕەزایی دەربڕین لە سیستمی حزبایەتی تایبەتمەندیی خۆی هەیە کاتێ بانگەشە بۆ ئەوە دەکا دامودەزگا ئازادەکان بنکەی نوێنەرایەتیکردنی خۆیان وەرگرنەوە، کە هەندێ جار بەڵکو زۆرجار لەدەستی دەدەن.

## بزاوتە کۆمەڵگەییەکان و دیموکراسی

بەڵام لە هەمان کاتدا ئەم شێوازی نوێنەرایەتیکردنە ئەوە دەخوازێ کە ئارەزوی خۆنوێنەرایەتیکردن لەلایەن هێزە کۆمەڵگەییەکانەوە لەئارادابێ، واتە گەمەی سیاسیو بڕیاری زۆرینە پەسەندبکەن. چونکە زۆربەی کردەوە دەستەجەمعیەکان هەڵگری سروشتێکی ترن. بەو مانایەی داخوازیی هێزە کۆمەڵگەییەکان لەلایەن سیستەمەوە وەڵام نادرێنەوە، جا بەهۆی سنورداریو ئیفلیجیو نابوتیی سیستەمەوە بێ لەلایەن دەوڵەتێکی دەسەڵاتگەرەوە، یان لەبەرئەوەبێ کە خودی ئەو داخوازیانە قابلی دانوستان نەبن بەڵکو ئامرازی خوسازکردنی ئەو هێزە دیاریکراوانە بن کە ئامانجیان ڕماندنی ڕەوتی دامودەزگاییە. کەلێنێکی بەرفراوانیش هەیە لەنێوان ئەو دوو دۆخەو ئەو دوو ئایدیۆلۆجیایەدا کە ئەو دوو ئەگەرە شیدەکەنەوە. خۆسازدانی دەستەجەمعی لەلایەکەوە شێوەیەکە لە ڕۆچون و داچوون کە دامودەزگاکان لەتوانایاندا نیە چارەسەری بکەن، لە لایەکی تریشەوە زادەی کۆششێکی رادیکاڵ یان شۆڕشگێڕانەیە و ئاراستەی ئەو دەزگایانە دەکرێ کە پارێزەری بەرژەوەندیە باڵادەستەکانن کە تەنها لەڕێگای زەبروزەنگەوە دەڕمێن. بەڵام هیچ کام لەم دوو چالاکییە دەستەجەمعیە لە هزری دیموکراتیەوە سەرچاوەناگرێ. جائیدی ئەو چالاکیە دەستەجەمعیە جۆرێك بێ لە داچونی چارەسەری دامودەزگایی بۆ قەیرانەکان، یان مایەی گۆڕانێکی بنەڕەتی بێ لە کۆمەڵدا. ئەم دەرەنجامە نێگەتیڤە دەبێ یارمەتیدەر بێ بۆ جیاکردنەوەی ڕوونی ئەو دوو جۆرەی چالاکی دەستەجەمعی کە لەلایەکەوە بزاوتە کۆمەڵگەییەکان سازیدەدەن، بەلانی کەمەوە بەپێی ئەو مانا وردەی کە پێویستە بەو وتەزایە بدرێ، لەلایەکی تریشەوە دەخرێتەگەڕ لەپێناو هەموارکردنی فۆرمی بەکارهێنانی کۆمەڵگەیی بۆ ئەو بەها گرنگانەی کە بەناوی ئاراستە کولتوریەکانەوە لەلایەن کۆمەڵگەوە پەسەنددەکرێن. وەك ئەوەی بزاوتی کرێکاری بەخۆوەی بینی کاتێ بەناوی پێشکەوتن و بەرهەمهێنانەوە دژایەتی سەرمایەداری کرد. بەگوێرەی ئەو دەستنیشانکردنەوەی پێشەوە، پێویستە بزاوتی کۆمەڵگەیی خاوەنی بەرنامەیەکی سیاسی بێ، چونکە لەکاتێکدا هەوڵ بۆ بەرژەوەندییە تایبەتەکانی خۆیدەدا، بانگەشە بۆ چەند پرنسیپێکی گشتیش دەکا. بزاوتەکانی کرێکاران، ڕزگاری نیشتمانی، فێمێنیزم، ژینگەپارێزیو ئەو بزاوتانەی کە بەرهەڵستکاری ڕژێمە کۆنەکان و ئەو بزاوتانەی کاریگەرییان لە ئاین وەرگرتووە... ئەو دۆخە دەیانگرێتەوە. بەڵام ئێمە ناتوانین ناوی بزاوتی کۆمەڵگەیی لەو هەڵچونانە بنێین کە قابلی

دانوستان نین، یان ئەو ئاستەی ڕەتکردنەوە کە لە هەموو فشارێکی کۆمەڵگەییدا هەیە، چونکە ناکرێ ئاراستەی چالاکی کۆمەڵگەیی لە سنوری چارەسەری دامودەزگایی کێشەکاندا، لە دۆخێکی دیاریکراودا، دەستنیشان بکرێ. هاوکات چالاکی کۆمەڵگەیی  کە جۆرێك لە دابڕانی تێدایە لەگەڵ هەر دۆخێکی باودا ناتوانێ هێزە کۆمەڵگەییە چالاکەکان دیاریبکا. بەڵکو دۆخەکان بەشێوازێکی سەربازی وێنادەکا، (بۆ نمونە) باس لە شەڕی ناوخۆ، یان قەیرانێك، یان دەسەڵاتێکی ستەمگەر دەکا، ئیدی ئەو دۆخە ستراتیجێکی نوێ دێنێتە ئاراوە بۆ گرتنەدەستی دەسەڵات، ئامانجە کۆمەڵگەییەکەش دەبێتە هێنانەدی کۆمەڵگەیەکی هاوجۆر لەپێناو دوورخستنەوەی دوژمن و خائینەکان. وەسفکردنی دۆخێك لە دۆخەکان یان چالاکیەك لە چالاکیەکان بەوەی شۆڕشگێڕانەیە، تەنها لەدایکبوونی دەسەڵاتێکی دەسەڵاتگەری لێدەکەوێتەوەو هیچی تر.

بەپێچەوانەوە، بزاوتی کۆمەڵگەیی‌و دیموکراسی هاوشانی یەکدین. لێکترازان و هاودژی لەنێوانیاندا نیە. ئەو سیستەمە سیاسیەی کە بزاوتی کۆمەڵگەیی تەنها وەك گوزارشتکارێکی توندی ئەو داخوازیانە دەبینێ کە جێبەجێکردنیان مەحاڵە، ناونیشانی نوێنەرایەتیکردن لەدەستدەدا هەروەك چۆن متمانەی دەنگدەرانیش دەدۆڕێنێ. لە زۆر وڵاتدا، نەك تەنها وڵاتە ئەوروپیەکان، بینیمان ئەوەی ناونرا پێداویستیەکانی دۆخی نێودەوڵەتی‌و زەرورەتی کەم مەسرەفی‌و سك هەڵگوشین بووەهۆی دژایەتیکردنی داخوازیەکان بەوپێیەی ناواقعین و هەڕەشە لە کرێکاران و ئاسایشی نیشتمانی دەکەن. ئەو فەرمانڕەواییەی هەوڵدەدا پاساو بۆ کارەکانی خۆی بدۆزێتەوەو شەرعیەتیان پێببەخشێ بەوەی پێداویستی‌و ناسکی دۆخ بکاتە بیانو، مۆرکی دیموکراتی لەدەستدەدا، تەنانەت گەر نەرم و لیبراڵیش بێ. لەلایەکی ترەوە هیچ بزاوتێکی کۆمەڵگەیی بوونی نیە گەر لە چالاکی کۆمەڵگەییدا ئەو ئامانجانە دیاری‌نەکا کە بەهاو بەرژەوەندیەکانی کۆمەڵگە بەگشتی دەسەلمێنن، هەروەها نابێ ژیانی سیاسی کورتبکاتەوە بۆ ململانێی نێوان کامپ و چینەکان، بەجۆرێك ململانێکان ڕێکبخاو پەرەشیان پێبدا. بزاوتە کۆمەڵگەییەکان تەنها لە کۆمەڵگە دیموکراتیەکاندا پێکدێن، چونکە هەڵبژاردنی سیاسی ئازاد بەسەر هەموو هێزێك لە هێزە کۆمەڵگەییە چالاکەکاندا ئەوە دەسەپێنێ کە هەوڵ بۆ خێری هاوبەش بدەن و هاوکاتیش بەرگری لە بەرژەوەندیە تایبەتەکانی خۆیان بکەن. هەربۆیە بزاوتە کۆمەڵگەییە مەزنەکان هەمیشە دروشمی گشتییان بەرزکردۆتەوە وەك ئازادی، یەکسانی، مافی مرۆڤ، دادپەروەری‌و هاوکاری، بەمەبەستی دامەزراندنی پەیوەندی ڕاستەوخۆو خێرا لەنێوان چالاکییە کۆمەڵگەیی‌و بەرنامە سیاسیەکەیدا.

زۆر بەڕوونی پەیوەندی نێوان وتەزای بزاوتی کۆمەڵگەیی‌و دیموکراسی‌و بەرگری لە مافە بنەڕەتیەکانی مرۆڤ ڕووندەبێتەوە کاتێ هاودژی لەنێوانیان و لەنێوان ململانێی چینەکاندا دەدۆزینەوە. چونکە ململانێی ناوبراو بەو بابەتە زۆرانە بارگران کراوە کە دەربارەی حەتمیەتی مێژویی، یان سەرکەوتنی ئەقڵ وتراون، ئەو بابەتانەی کە وەك گریمانە خراونەتەڕوو سەبارەت بە ڕاپەڕینی میللی دژی ئەو باڵادەستییەی کە لە ستەمدا وێنەی نیە جگە لەو نائەقڵانیەتەی کە لەیەك کاتدا کاربۆکەرو هۆکاریشیەتی. هەر ئەو دۆخە بوو ڕاستەوخۆ بووەهۆی چالاکی شۆڕشگێڕانە زیاتر لەوەی ببێتەهۆی بنیاتنانی

دامودەزگای دیموکراتی. گۆڕینی ئەم وتەزایە بۆ وتەزای بزاوتی کۆمەڵگەیی ئاماژەیەك بوو بۆ هێنانەئارای سۆسیۆلۆجیایەکی دیاریکراو (سۆسیۆلۆجیای چالاکی مێژویی بگرە خودی مێژویی) کە جێگەی تیۆری مێژوی گرتەوە، هەروەها سۆسیۆلۆجیای ئازادی کە شوێنی بە سۆسیۆلۆجیای حەتمیەت چۆڵکرد. بزاوتی کۆمەڵگەیی هەمیشە لەسەر بنەمای ئازادکردنی هێزی کۆمەڵگەیی چالاك دادەمەزرێ نەك بنیاتنانی کۆمەڵگەیەکی ئایدیاڵ، یان سروشتی بەمانایەك لە ماناکان، یان چوونەناو کۆتایی مێژوی مرۆیی یان بەر لە مێژوی مرۆیی. چالاکی کرێکاران کاتێ بەرگریی لە سەربەخۆیی کرێکاران کرد لە ئاست ئەقڵانیەتی خاوەن کارەکاندا گەیشتە لوتکەی خۆیو بزاوتێکی کۆمەڵگەیی پێکهێنا – لەو کاتەوەی کتێبی "هوشیاری کرێکاری"م لە ساڵی 1966 دا نوسیوە ئەم خاڵەم ڕوونکردۆتەوە–. بانگەشەخوازانی ململانێی چینەکان دەربارەی ناکۆکیەکانی سەرمایەداریو ناسکبوونەوەی (دۆخ) قسەدەکەن، لە هەوڵی ڕوخاندنی ڕوخێنەرو ڕەتکردنەوەی ڕەتکردنەوەدان. هەربۆیە کۆشش بۆ گرتنەدەستی دەسەڵات دەکەن. بەڵام بزاوتی کۆمەڵگەیی بەپێچەوانەوە بزاوتێکی مەدەنییە، بزاوتێکە بۆ سەلماندن و پەسەندکردن بەرلەوەی بزاوتێ بێ بۆ ڕەخنەو ڕەتکردنەوە. هەربۆیە دەشێ ببێتە پرنسیپێك بۆ سەرلەنوێ بنیاتنانەوەیەکی لەسەرخۆ، کە لەپاش بڕیارو مشتومڕ، دەسدەداتە بنیاتنانی کۆمەڵگەیەك کە لەسەر بنەماکانی دادپەروەریو ئازادیو ڕیزگرتن لە بوونەوەری مرۆیی دادەمەزرێ، تەواو ئەو بنەمایانەی کە دیموکراسییان لەسەر دادەمەزرێ.

پێویستە بیرۆکەی بزاوتی کۆمەڵگەیی بەتەواوی جیاببێتەوە لە بیرۆکەی زەبروزەنگ. چونکە بیرۆکەی زەبروزەنگ لەوپەڕی ناکۆکیدایە لەگەڵ دیموکراسیو بزاوتە کۆمەڵگەییەکاندا، بەڵام بە ناخی پەیوەندیەکاندا ڕۆچووە. دەسەڵاتی سیاسی، هەروەها باڵادەستی کۆمەڵگەیی، بەشێوەیەکی گشتی ملکەچی یاسا دەزگاییەکان نین. توانای بڕیاردانی ستەمکارانەی ئەوتۆیان هەیە کە بەتەواوی ڕەتناکرێنەوەو نکوڵیان لێناکرێ. بابەتگەلێکی وەك بەرژەوەندی باڵا، ڕێوشوێنی ئیلزامی، مافی بەخشین و مەحسوبیەت و دەستەگەری... ئەو بابەتانەن کە بەگوێرەی دۆخە جیاوازەکان هەندێجار نێگەتیڤ و هەندێجار پۆزەتیڤن، کە لەتوانای سەرۆك دەوڵەت یان تاقە دەزگایەکدایە پێڕەویان بکا، وەك بەرپرسیارێتی میللیو بڕیاری تاکڕەوانە لەیەك کاتدا. چونکە ئەو کەسەی کە دەسەڵات دەگرێتەدەست مەرج نیە پابەندبێ بە سیستەمی دانوستانی کۆمەڵگەییو سیاسییەوە تەنها پابەندبوونێکی بەشەکی (جزئی) نەبێ، کەسێکە کاری خۆی لەگەڵ بازاڕێکی دیاریکراودا بەپەیوەندی لەگەڵ وڵاتانی تردا ئەنجامدەدا. بەوپێیەی دەوڵەت تەنها سیستامێکی سیاسی یان فەرمانڕەوایکردنی ئەو دەزگایانە نیە کە دانوستانە دەستەجەمعیەکان جڵەویاندەکەن، داخوازی توێژە ستەملێکراوەکان یان دوورخراوەکان لە دەسەڵات ڕەهەندێکی توندوتیژی سروشتی وەردەگرێ. بەڵام خەسڵەت و تایبەتمەندی دیموکراسی بریتیە لە سنوردارکردنی زەبروزەنگ، هەروەك چۆن بریتیە لە سنوردارکردنی دەسەڵاتی ڕەها. (ڕەنگە هەندێجار) زەبروزەنگ ببێتە کارێکی ناچاری، بەو پێیەی گەر کۆمەڵگە بەسەر دانوستانی ناوەکیدا داخرێ بەرەو

ئیفلیجبون دەڕوا، چونکە لەکاتی نەبوونی گوشاری دەرەکیدا سازشکردن دەبێتە کارێکی مەحاڵ. بەڵام کاردانەوەکە پێچەوانە دەبێ کاتێ بەربەرەکانێی نێوان زەبروزەنگی باڵادەستەکان و زەبروزەنگی ستەملێکراوەکان، تەنانەت لەکاتی سازش و هودنەشدا، دەبێتەهۆی لەباربردنی دیموکراسی، هەروەها لەناوبردنی ئەو بزاوتە کۆمەڵگەییانەی، کە لە ستراتیجێکدا بەنددەکرێن و ناچاردەکرێن نکوڵیبکەن لەهەر پەنابردنێك بۆ بەرژەوەندی هاوبەش و خێری گشتی.

## ڕژێمە دیموکراتییە زۆر ئەقڵانیەکان

جارێکی دی، دیموکراسی وەك سیستەمێك دەبینینەوە کە ناوبژیوانی سیاسی لەنێوان دەوڵەت و هێزە کۆمەڵگەییە چالاکەکاندا سازدەدا، نەك وەك فۆرمێك بۆ تەگبیرکردن لە کاروباری کۆمەڵگە. فیکری لیبراڵی پێناسەی دووەمیانی پێباشە کە لە قۆناغی پاش توتالیتاریزمدا بەشێوەیەکی بەڵگەنەویست توانای سەرنجڕاکێشانی هەیە، ئەو قۆناغەی، سەرەڕای بوونی ژمارەیەکی زۆری ڕژێمی دەسەلاتگەر، ئێستا تیای دەژین. بەڵام ئەم پێناسە سنوردارە دیموکراسی دوچاری مەترسی دەکاتەوە. چونکە لەوەدەچێ کۆمەڵگە دەوڵەمەندەکان توانای شیکردنەوەو چارەسەرکردنی گرفتە کۆمەڵگەییە دیارو ئاشکراکانی خۆیانیان نەمابێ، چونکە چیتر نایانەوێ لە کێشە بناغەییەکانی نێوان بەرژەوەندیەکان و هزرە پێچەوانەکان بدوێن. ئەو وێنەیەش کە باڵدەکێشێ بەسەر ژیانی کۆمەڵگەییدا وێنەی (مینیستریم)[3]ێکی گەورەیە، وێنەی چینی ناوەڕاست کە زۆرینەی هەرەزۆری دانیشتوان لەخۆدەگرێو پەراوێزخراوەکانی قوربانی دەستی بێکاریو نەشارەزاکانیش لەیەك کاتدا دەچنەوە سەری. قوربانیانی ڕەتکردنەوەی زۆرینە بۆ هەندێ لە کەمینەکان و قوربانیانی کێشەو قەیرانە شەخسیەکان. ئیدی کۆمەڵگا یەك پارچە دەبێتە کێبڕکێی ماراسۆنێکی گەورە: لە ناوەڕاستدا ژمارەیەك خەڵکانی کێبڕکێخواز (منافس) ڕادەکەن و سات لەدوای سات خێراتر دەچنە پێشێ، لەپێشەوەی ماراسۆنەکەش ژمارەیەك ئەستێرەی دیار (خەڵکی بەناوبانگ) سەرنجی جەماوەر بۆ لای خۆیان ڕادەکێشن، لەدوای دواوەش خەڵکانێك هەن کە بەدخۆراکیو بێدەرامەتی ماندووی کردوون، ماسولکەو دەمارەکانیان گرژبۆتەوەو دڵئێشە لە پاڵەوانیەتێکە دوایخستوون. نمونەی ئەو کۆمەڵگەیەی کە ئێستا لە ئەمریکای لاتین و ئەوروپای پاش کۆمۆنیستیو وڵاتە دەوڵەمەندەکانی خۆرئاوا بەدی دەکرێ، ململانێو زەبروزەنگ بەرهەمدێنێو مۆرکی کۆمەڵگەیی لەو وڵاتانە دادەماڵێ. خەیاڵگەی کۆمەڵگەییمان لێوانلێوە لە زەبروزەنگ و تاوان یان لە ڕەگەزی شەڕانگێزی، کە زۆرینەی خەڵکانێك ئەنجامیدەدەن تامەزرۆن بۆ ئاسایش و (کۆکۆنینگ)[4]. لێرەدا ئێمە گەڕاوینەتەوە بۆ ئەو وێنەیەی کە کۆمەڵگەی بۆرجوازی لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەدا بۆ خۆی دەیکێشا ، کاتێ بۆرجوازی هەستیدەکرد لەژێر هەڕەشەی "چینە خەتەرناکەکان"دایە، چونکە گوێی نەدەگرت بۆ داخوازی "چینە ڕەنجدەرەکان". دیموکراسی دووچاری لاوازی دەبێتەوە کاتێ زیادەڕۆیی دەکرێ لە خستنەڕووی مەترسی ئەو کێشانەی پێویستیان بە چارەسەر هەیە. هەروەها دیموکراسی نکوڵی لەخۆیدەکا کاتێ تەنها هەستوسۆزی مرۆیی دەردەبڕێ، لە کاتێکدا کێشەکان پێویستیان بە دەستێوەردانی خێرا هەیە، وەك ئەوەی لە بۆسنە ڕوویدا، لەپێناو

سنوردانان بۆ ئەو سیاسەتانەی بنەماکانی دیموکراسی لەناودەبەن.

وا ڕاهاتوین قسە لە کەمینەکان و پەراوێزخراوەکان و بگرە قسە لە گۆشەگیریو دوورخستنەوە بکەین، تا ئەو ڕادەیەی لەبیرمانچۆتەوە ئەم وشانە بەشداریدەکەن لە نمایشکردنی کۆمەڵگەیەکی بێگەرد لە هەر جۆرە ململانێیەکی بنەڕەتی، بەجۆرێك دیموکراسی تەنها کورتدەبێتەوە بۆ ڕاییکردنی ئەو پەیوەندیانەی کە لەنێوان داخوازیە کۆمەڵگەییە پەرت و لاوازەکان و پێداویستیە تەکنیکیو ئابوریەکاندا هەیە کە کەس توانای بەرەنگاربوونەوەیانی نیە مەگەر تەنها ئەو کاتەی کە توانای کێبڕکێ لەدەستدەدا.

ئازادییە دیموکراتیەکان بۆ دواوە گەڕاونەتەوە چونکە بۆ چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵگەییە سەختەکان ناخرێنەگەڕ. ڕەنگە ئەم ڕەخنە لەخۆگرتنە سوودی هەبێ گەر بەشداری بکا لە بەخشینی بڕێك لەو دانەوێڵەیەی پێویستی بە هاڕین هەیە بە ئاشی دیموکراسی، گەر هانمان بدا بۆ ئاشکراکردنی ململانێ گرنگەکانی کۆمەڵگەکەمان و (پرسیار) دەربارەی سروشتی ئەو بزاوتە کۆمەڵگەییانەی کە پێویستە دواسات حزبە سیاسیەکان وەڵامی بدەنەوە. ئایا گەر مرۆڤێك پەیوەست بێ بە بیرۆکەی دیموکراسییەوە هێندە بەسە تەنها بانگەشە بۆ کۆمەڵگەیەکی دەوڵەمەند و کراوەو هەمەجۆر بکا، ئەو داخوازیانەش بکاتە دەرەوەی گۆڕەپان کە ڕەنگە ئەمڕۆ گرنگترین داخوازی بن ؟. بەهەمان شێوە، لە سەدەی نۆزدەدا مشتومڕی سیاسی لەنێوان کۆنەپارێزو لیبراڵیەکان، عەلمانیەکان و کاتۆلیکەکان، پادشاییەکان و کۆماریەکان... بووەهۆی لاوازبوونی دیموکراسی، چونکە ئەو مشتومڕانە نامۆو دوور بوون لە داخوازیی کرێکاران و داخوازیە لەپێشینەکانی ئافرەتان.

گەر ڕۆشنبیران ڕۆڵێك بگێڕن کە ڕۆڵی سیاسیەکان تێپەڕێنێ، ئەو گرەوە کۆمەڵگەییو ڕۆشنبیریانە بهێننە ئاراوە کە هەر سیاسەتێکی دیموکراتی پێویستی پێیانە، ئەوا ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕن لە پڕکردنەوەی کەلێنەکاندا. پێکەوەگرێدانی بزاوتە کۆمەڵگەییە دیموکراتیەکان بابەتێکی نوێی ئەوتۆیە کە تا دوێنێیەکی نزیکیش نکوڵی لێدەکراو لەلایەن کرێگرتەکانی دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا، ناسیۆنالیستە دەسەڵاتخوازەکان و پشتیوانانی جەنگی شۆڕشگێڕانەوە ڕەتدەکرایەوە، جگە لەوانەی کە زیاتر پشتیان بە قەبەکردنی ئابوری دەبەست نەك وتووێژی سیاسیو داخوازی کۆمەڵگەیی لەپێناو بەرزڕاگرتنی یەکێتی کۆمەڵگەو کامڵبوونی.

گرفتێك کە لەڕیزی پێشەوەی هەموو گرفتەکانەوەیە، بریتیە لەوەی هەموو داخوازیو ناڕەزاییو تێزە تۆباویەکان کە هانی کۆمەڵگە دەدەن بۆ چاکسازی لە هوشیاریو کێشەکاندا بە ئاراستەی سیتەمی سیاسیدا ببرێن. ئێمە لەسەر هەموو ئاستەکان کێشەمان بەدەست کەمبوونەوەی ململانێوە هەیە. دۆخێکی لەمجۆرە کۆتێك لە زەبروزەنگ دەئاڵێنێ لەدەوری ئەو سیستەمە سیاسیەی کە پێیوایە خۆی سەلامەتەو لە کێشە بەدوورە، چونکە ئەو سیستەمە داخوازیەکانی ناوخۆ دەکاتە هەڕەشەی دەرەکیو زیاتر گرنگی بە ئاسایش دەدا نەك دادپەروەری، زیاتر کار بۆ خۆگونجاندن دەکا نەك یەکسانی. (بەڵام) دیموکراسی ناتوانێ بەرگری لەخۆی بکا گەر توانای کەمکردنەوەی ستەم و زەبروزەنگی نەبێ.

**دیموکراسی و گەل:**

گەر پێویست بێ دەسەڵاتی دیموکراتی نوێنەرایەتی بەرژەوەندیی زۆرینە بکا، ئەوا بەر لە هەر شتێك ئەو نوێنەرایەتیکردنە گوزارشت لە "چینە گەورەکان لەڕووی ژمارەوە" دەکا، واتە وەك ئەوەی ئەو دەسەڵاتە لە پەیوەندییدا بە توێژەکانی گەلەوە خۆی پێناسەی خۆیبکا، ئەو توێژانەی کە نەك تەنها لەڕووی ژمارەوە زۆرینەن، بەڵکو زیاتر گوێڕایەڵن بۆ ئەو بڕیارانەی کە لەلایەن نوخبەکانەوە دەردەچن. ئایا پەیوەندیی ڕاگەیەندراوی نێوان دیموکراسیو گەل پەیوەندییەکی پێویست نیە بۆئەوەی پێناسەی دیموکراسی بەبێ سیفەتی نوێنەرایەتیکردن ئەنجام نەدرێ؟ واتە بۆ ئەوەی تەنها نەبێتە هەڵبژاردنی ئازادانەی فەرمانڕەواکان، چونکە لەکاتێکی وادا دیموکراسی تەنها دەبێتە کێبڕکێ لەنێوان ژمارەیەك لەو فەرمانڕەوایانەی کە هەموویان سەر بە نوخبەی دەسەڵاتدارن (بەڵام سەرلەنوێ لە وێنەی توێژی تایبەتدا جواندەکرێنەوە؟ لەڕاستیدا بیرۆکەی دیموکراسی هیچ ڕۆژێ لەڕۆژان بیرۆکەیەکی بێلایەن نەبووە. ئایا ئەو مشتومڕەی کە لە ئەنجومەنە گشتیەکانی فەرەنسا لە ساڵی 1789دا ئەنجامدران و بوونەهۆی سەرکەوتنی دەنگدانی فەردیی بەسەر دەنگدانی دەستەجەمعیدا، سەرەتای مشتومڕە دیموکراتییە گرنگەکان نەبوون؟. کاتێ بەشێوازێکی دیموکراتیانە گۆڕانکاری لە کۆمەڵگە دەستەجەمعیە پلەبەندەکاندا ئەنجامدەدرێو تا ببنە کۆمەڵگەی تاکگەر، ئەوا ئەو گۆڕانە لە بەرژەوەندیی ئەو کەسانەدایە کە توانایان نیە دەسەڵات یان دەرامەتی مادی یان ڕەمزی بگرنەدەست. بیرۆکەی "توێژی تایبەت"[(5)]، یان بیرۆکەی ستەمی زۆرینە کە تەواوکەریەتی، ئەو دوو بیرۆکەیەن کە پێگەیەکی مەرکەزییان پێبڕا لە پرۆسەکانی بیرکردنەوە و مشتومڕدا، وەك ئەوەی لەکاتی دانانی دەستوری ئەمریکا هاتنەگۆڕێ، یان لەکاتی شیکردنەوەی لیبراڵی بۆ شۆڕشی فەرەنسی قسەیان لێکرا. ئەو دوو بیرۆکەیە لەڕووی مەبدەئییەوە دژی زەینیەتی دیموکراتین و هەرزوو بوونەهۆی دروستبوونی ئەو ڕژێمەی کە باجێکی دیاریکراو دەسەپێنێ بەسەر دەنگدەردا تا مافی هەڵبژاردنی هەبێ. لە رۆژگاری ئەمڕۆدا هیچ کەس ناوی دیموکراتی نانێ لەو رژێمەی کە هەوڵی بەیاساییکردنی دیموکراسی دەدا، هەروەها چیتر ناتوانین، بەهۆی کاریگەریی کۆنەپارێزییەوە، ئەوە قبوڵبکەین کە جەستەی هەڵبژاردن بەجۆرێك بەیاساییو سنوردار بکرێ کە ئافرەتانی لێ دووربخرێنەوە، ئەو دۆخەی کە بووەهۆی ئەوەی کۆمەڵگەکانمان لە کاری سیاسیدا مۆرکێکی نادیموکراتی وەرگرن و دژبوونێکی سەختی خستە نێوان ژیانی گشتیو ژیانی تایبەتی، چونکە ژیانی گشتی بەجۆرێك بەیاسایی کرا بووە موڵکی پیاوان، بەڵام ئافرەتانی لە جیهانی رۆشنبیریو دروستکردنی کەسایەتیدا بەندکرد کە دەبوو زەینیەتی دیموکراتی ئەو کارە نەکا. دەکرێ ئەمڕۆ پرسیارێکی دیکەش لە وێنەی پرسیاری پێشومان بخەینەڕوو سەبارەت بەو کوڕو کچە گەنجانەی تەمەنیان لەخوار هەژدە ساڵەوەیە، واتە ئەو کەسانەی کە لەچەند کایەیەکی بەرخۆریدا، وەك سینەما و گۆرانیو تەلەفزیۆن و جلوبەرگ، بەشێکی گەورەی بازاڕ پێکدێنن. دوورخستنەوەی ئەوانە لە ژیانی سیاسی مۆرکێکی نادیموکراتی دەبەخشێ بە ژیانی گشتیمان، هەرچەندە دەستنیشانکردنی ئەندازەی ئەو مۆرکە کارێکی سەختە، چونکە بەکۆیلەکراوەکان تاوەکو ئێستا هێزێکی کۆمەڵگەیی چالاکیان پێکنەهێناوە، کارێك کە ئافرەتان

سەکەوتنیان تێدا بەدەستهێنا بەڵام گەنجان هێشتا ئەو سەرکەوتنەیان بەدەست نەهێناوە. داخۆ کەسێك هەبێ بڕوای وابێ دەنگدانی ئەو گەنجانەی تەمەنیان لەنێوان 15و 18 ساڵیدایە، کاریگەری نەبێ لەسەر سیاسەتی ئابوری، بەتایبەتی لە وڵاتانێکی وەك ئەوروپای ناوەڕاست کە ڕێژەی بێکاری گەنجان تیایاندا لە ئاستێکی زۆر بەرزتردایە تا بێکاری گشتی؟.

ئەوەی فشارێکی "میللی" دەبەخشێتە بیرۆکەی دیموکراتی، بریتیە لە دژایەتیکردنی جیاوازیە کۆمەڵگەییەکان بەپێی سەرەتاکانی یەکسانی. ئەو هەڵگەڕانەوەیەی کە بەسەر پلیکانەی پلە کۆمەڵگەییەکاندا هات – کە زۆرجار سیفەتی نوێنەرایەتی دەپۆشێ – بەناوی یەکسانی لە مافەکاندا، نەك تەنها نەبوەهۆی دۆزینەوەی بەرکەوتێکی سیاسی جیاواز لە بەرکەوتی کۆمەڵگەیی، بەڵکو خودی کۆمەڵگەی گۆڕی. چونکە یەکسانی لە مافەکاندا دەبێتە بیرۆکەیەکی تەمومژاویو هیچیتر گەر تەرجەمەنەکرێ بۆ چەند گوشارێك بەئاراستەی یەکسانی لەسەر زەمینی واقع، بە ئاراستەی "جۆرێك لە جۆرەکانی چونیەکیی لە بارودۆخدا" هەروەك جان جاك رۆسۆ وتوویەتی.

ئەم بانگەوازانە پێویستن تا بەشێوەیەکی ئیجرایی پەتی لە دیموکراسی نەگەین. هەروەها بۆ ڕۆشنکردنەوەی ڕوبەرێکی فراوانی مێژوی سیاسی لە کیشوەری کۆن و چەند بەشێکی تری جیهانیش، تەنانەت بەئەندازەیەکی کەمتریش بۆ مێژوی وڵاتە یەکگرتوەکان بەو پێیەی وڵاتێکە لەسەر بیرۆکەی یەکسانی دامەزراوەو خاوەنی هیچ میراتێکی دەرەبەگایەتیو پادشایەتی نیە.

بەڵام تەنها ئەم شیکردنەوانە بەس نین، بەڵکو پێویستە بەشێوازێکی سیاسیی ڕاستەوخۆ بپرسین: ئایا ئەو بیرۆکەو هێزە سیاسیانەی ئاراستەی گەل دەکرێن هەمیشە بیرۆکەو هێزی دیموکراتین. وەك دەزانین ئەم پرسیارە وەڵامێکی سەلبی دەخاتەوە. چونکە زۆرجار دیموکراسی بەناوی چەپ و گەل و چینی کرێکارانەوە، بەڵکو بەناوی خودی دیموکراسییەوە لەناوبراوە. چەپی ئەوروپیو ئەمریکای لاتین بەجۆرێکی هێندە قووڵ بەسەرخۆیاندا دابەش بوون کە مشتومڕەکانیان دەربارەی دیموکراسی زەبروزەنگی ئاشکرای لێکەوتەوە. جگە لەوەی خودی وشەکە هەر لە دێر زەمانەوەو لە زۆر وڵاتدا مایەی کێشەو مشتومڕ بووە. هەندێك باسیان لە دیموکراسی بۆرجوازی یان رواڵەتی کردوە، حزبە کۆمۆنیستەکان خەباتیان بۆ دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا کردووە، جەنگی پارتیزانی لە ئەمریکای لاتین و ئەفریقیا کاری جەماوەریی ڕەتکردەوەو هەموو توانای خۆی خستەگەڕ نەك بۆ ئامادەسازیی میللیو دامەزراندنی حزبێکی پێشەنگ وەك ئەوەی لینین، بەڵکو بۆ پەلاماردانی ڕاستەوخۆی دەوڵەت بەو پێیەی ئەڵقەیەکی لاوازە لە زنجیری دەسەڵاتی ئیمپریالیزم. پاشان جەنگی پارتیزانی شارەکان، جا بەشێوازە ئیتالیەکەی بووبێ یان ئەڵمانیەکەی، هەمان ئەو شیکردنەوانەی پێڕەوکراو هەوڵی تۆقاندنی دەسەڵاتداران درا بۆ لاوازکردنیان و ئازادکردنی ئیرادەی شۆڕشگێڕانە کە پێویستە لای جەماوەر هەبێ. چەپ چەپێکی دیموکرات نیە گەر بڕوای بە گەشەی ناوەکی نەبێ، گەر تازەکردنەوە نەبەستێتەوە بە پەیوەندییە سیاسیو کۆمەڵگەییە چینایەتیەکانەوە، دەکرێ بەشێوەیەکی مارکسیانە یان سۆشیال_ دیموکراتیانە یان تەنانەت لیبراڵیانە

گوزارشت لەم دۆخە بکەین. لینین وتەنی، زەبروزەنگی شۆڕشگێڕانە دەگرێتەبەر گەر دەرگاکانی گۆڕان بەڕووی دەزگاکاندا داخراوبن. بەهەمان شێوە سەبارەت بە پیشەسازی، کاتێ "بۆرجوازی نیشتمانی" دوچاری لاوازبوون دەبێتەوە، لە بەرامبەریشدا دەوڵەتی دەسەڵاتگەر ئەو ئەرکە ئەنجامدەدا، وەك دەوڵەتەکەی بسمارك. لە هەردوو دۆخەکەشدا پرسیارێك لەگۆڕێدایە سەبارەت بەوەی ئایا پەنابردن بۆ زەبروزەنگ فێڵێکە لە فێڵەکانی مێژوو کاتێ هوشیاری دەربارەی زەرورەتی گەیشتن بە دیموکراسی لەئارادایە؟ یان تەنها ئەو هۆکارەیە کە دەبێتە ئامانج بۆ تازەکردنەوەی ئابوری کە داهاتی خۆبنیاتنان و خۆبەهێزکردن دەبەخشێتە دەسەڵاتی ڕەهای دەوڵەت. گەر بگەڕێینەوە بۆ ئەو نمونەیەی باسمانکرد، دەبینین پەنابردن بۆ گەشەی ئابوریی ناوەکیو بۆ دیموکراسی لە ئەڵمانیای پاش بیسمارك پاش ماوەیەك ئەنجامدرا، بەڵام لە رژێمی سۆڤێتیدا هیچ هەوڵێك بەو ئاراستەیەدا نەخرایەگەڕ تا کرانەوەکەی گۆرباچۆڤ.

گەلان دەسبەرداری بێدارکردنەوەی دیموکراتی بوون، بگرە دژی ئەو جۆرە دیموکراسییەن کە دەوڵەت دەکاتە فاکتەری ئیرادەی گۆڕانە مێژوییەکان و دەیخاتە سەروو هێزە کۆمەڵگەییە چالاکەکان و پەیوەندیەکانیانەوە، جا ئیتر ئەو پەیوەندیانە پەیوەندیی ململانێ بن یان دانوستان و هاریکاری. ئەو شیکردنەوەی "چەپ" دەگرێتەوە بەهەمان شێوە "ڕاست"یش دەگرێتەوە. چونکە زۆرجار مەترسی شۆڕش کراوەتە بیانو بۆ پشتگیریکردنی رژێمێکی دیکتاتۆری. بەڵام بەهەمان شێوە دژایەتی دیموکراسی کراوە، ئیتر بۆ پاراستنی پلەبەندیی کۆمەڵگەیی بووبێ یان پاراستنی هێزەکانی یەکخستنی کولتوری (بەو بیانووەی) لەژێر هەڕەشەدان، وەك ئەوەی سالازار و فرانکۆ و پیتان کردیان، یان پێڕەوکردنی پرۆسەیەکی تازەگەریی دەسەڵاتخواز، وەك پرۆسەی سیانتیفیکۆس[6] لە مەکسیك لە سەردەمی بۆرفیریۆ دیاز-دا، یان پرۆسەی تازەکردنەوەی کۆریای باشور یان بەرازیلی سەردەمی "ئیستادۆ نۆڤۆ"[7] و دیکتاتۆریەتی سەربازی. هەموو رژێمە دەسەڵاتگەرەکان ئەو پاساوەیان هێناوەتەوە کە کۆمەڵگەکانیان پێویستیان بە پێگەیشتن و کاملبوون هەیە، یان باسیان لەو مەترسییە دەرەکیو ناوەکیانە کردووە کە مایەی هەڕەشەن. هەموو ئەو رژێمانە کۆمەڵگەکانیان خستۆتە بەردەم دوو هەڵبژاردن: یان دەوڵەت، یان پاشاگەردانیو داگیرکاری دەرەکی. ئەمەش تەنها ئەو مانایە دووپاتدەکاتەوە کە دیموکراسی پەیوەستە بە خەملینی بەرژەوەندییە کۆمەڵگەییەکانەوە، هەروەها بە توانایان لە نوێنەرایەتیکردندا. رژێمە دەسەڵاتگەرەکان هەمیشە بیانوویان هێناوەتەوە بەوەی کە هێزە کۆمەڵگەییە چالاکەکان پەرت و لەبەریەکهەڵوەشاوەن، سەندیکاکان لاوازن، حزبەکان توشی گەندەڵ و دابەشبوون بوونەتەوە، جگە لەوەی مەترسی داگیرکاریی دەرەکیو مەترسی قەیرانە ئابووریەکانیان کردۆتە بیانو، تا پاساو بۆ هەموو ئەو کارو کردەوانە بدۆزنەوە کە پێڕەوی دەکەن. بوونی ئەم جۆرە رژێمانەو کارو کردەوەکانیان، بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئەوە دەسەلمێنێ کە پەیوەندیەکی پتەو لەنێوان دیموکراسیو هێزە کۆمەڵگەییە چالاکەکاندا هەیە. لە خودی ئەوروپا، تێبینی دەکرێ دیموکراسی بەرەو لاوازبوون و نەمان دەڕۆیشت کاتێ مشتومڕ

دەربارەی بەرهەمی کۆمەڵگەیی باڵی کێشابوو بەسەر خەبات دەربارەی پەیوەندییەکانی بەرهەمی کۆمەڵگەیی. گرنگیدان بە کاری سیاسی، واتە پەیوەندیکردن بە دەوڵەتەوە، ئەوەی مارکس بە نەخۆشییەکی سەرەکی لەقەڵەمی دەدا کە ژیانی سیاسی فەرەنسا لە سەردەمی شۆڕشەوە بەتایبەتی لە ساڵی 1848و لە سەردەمی کۆمۆنەی پاریسدا تووشی ببوو، ئەو دۆخەی ناومان نا یەعقووبیەت، بووەهۆی لەڕو لاوازبوونی ئەو دیموکراسیەی فەرەنسا کە زۆرجار رژێمە ڕاپرسخوازەکان دەیانڕوخاندن. هێندەیشی نەمابوو دیموکراسی فەرەنسی، لە دوێنێیەکی نزیکدا، بڕووخێ گەر جەنەراڵ دیگۆل نەبوایە کە خاوەنی مەیلێکی دیموکراتی توند بوو. ئەو کاتانەی مشتومڕ دەربارەی ئاین، یان قوتابخانە، یان دەربارەی پاشایەتی یان کۆماریخوازی کراوە، واتە دەربارەی ئەو بابەتە گشتیانەی کە پەیوەندییان بە سەرلەبەری کۆمەڵگەوە یان کولتورەوە هەیە، کەسانی مشتومڕکار خەون بە نمونەیەکەوە دەبینن کە هاوڕەگەزیو هاوجۆریی تەواو باڵ بکێشێ بەسەر کۆمەڵگەدا، یان دواجار بەدوای ئامرازی پاکتاوکردنی کۆمەڵگەدا دەگەڕێن، وەك لە قسەیەکی ترسناکی میلۆسۆڤیج–دا هات و بە ئاگرو ئاسن و لاقەکردنیش جێبەجێی کرد. سیستەمی سیاسی هۆکارێکە بۆ دامەزراندنی پردی پەیوەندیی نێوان کۆمەڵگەی مەدەنیو دەوڵەت" گەر بەلای دەوڵەتدا شکاندیەوە ئەوا دەبێتە دەسەڵاتگەر، جائیدی وێنەیەکی بیرۆکراتی وەرگرێ یان داپڵۆسێنەر یان سەربازی. بەڵام گەر بەلای کۆمەڵگەی مەدەنیدا دایشکێنێتەوە، دەبێتە دیموکراتی کە هەندێجار توانای پەیوەندیکردن بە دەوڵەتەوە لەدەستدەداو دەچێتە دۆخی یاخیبوونەوە وەك پەرچەکردارێك لەئاست ئەو دەوڵەتەدا کە دژی دیموکراسییە، یان لەئاست کردارێکی ئۆلیگارشی یان تەکنۆکرات یان سەربازی. دیموکراسی لەیەك کاتدا پێویستی بە ئازادی هەڵبژاردنە سیاسیەکان و نوێنەرایەتیکردنی فەرمانڕەوایان بۆ بەرژەوەندی زۆرینە هەیە. کارێکی بێهودەو مەترسیدارە بایەخ بە تەنها یەکێك لەو دوو توخمە بدرێو زاڵ بکرێ بەسەر ئەوی تریاندا. هەر دوێنێ، دەبوو بەر لەهەموو شتێك ئەو کەسانە بەئاگابێنینەوە کە بەرگرییان لە دەسەڵاتی میللی دەکرد، دەسەڵاتێك پێیوابوو هەڵقوڵاوی گەلێك لە گەلان یان نەتەوەیەك لە نەتەوەکانە، دەبوو بەئاگایان بێنینەوە کە دیموکراسی بەبێ بوونی فرەیی سیاسیو هەڵبژاردنی ئازاد بوونی نییە. هەروەها ئەمڕۆش دەبێ لە زۆر وڵاتانی جیهاندا مرۆڤ نیگەران بێ لەئاست لاوازیی پەیوەندیی نێوان هێزە کۆمەڵگەییە چالاکەکان و بکەرە سیاسیەکان. لاوازییەك کە دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆی سەرەکی: یان لەبەر ئەوەیە کە داخوازییە کۆمەڵگەییەکان تەمومژاویو توندوتۆڵ نین، ئەوەش حاڵی زۆربەی ئەو وڵاتانەیە کە لە وەرچەرخانێکی خێرادا دەژین لە شێوازێکی کۆمەڵگەییەوە بۆ شێوازێکی تر" یان لەبەر ئەوەیە کە حوکم و ڕای گشتی لەژێر باری گرفتێکدا دەناڵێنن کە کۆمەڵگەیی نیە بەڵکو نێودەوڵەتییە. ئاشکرایە چەندین رژێمی دەسەڵاتگەر هەن، لە باشورو خۆرهەڵات، کە دەسەڵاتی خۆیان بەناوی خەباتەوە دژی "کامپی ئیمپریالی" دەسەپێنن. بەڵام وڵاتە دیموکراتیە خۆرئاواییەکان، ئەوانیش بەجۆرێك لەجۆرەکان کەوتنە داوی لەمجۆرەوە. ناسیونالیزم و داگیرکاریی کۆلۆنیالیو پاراستنی سەروەریی ئیمپراتۆریاو گەڕان بەدوای هاوڕەگەزی کۆمەڵگەدا، ئەو وڵاتانەیان، بەتایبەتی بەریتانیای مەزن و وڵاتە

یەکگرتوەکان و فەرەنسایان بەئاقارێکی پێچەوانەی دیموکراسیدا برد. ئەڵبەتە دیموکراسی بەقاڵبدراوی مایەوە لە سەردەمی هەردوو ئەو دوو جەنگەدا کە فەرەنسا لە هیندی چینیو جەزایر بەرپایکرد، هەروەها لە سەردەمی جەنگی ئەمریکا لە ڤێتنامدا. بەڵام بایەخەکە لەوەدا بەرجەستەدەبێ کە پەیوەندی لەنێوان دەسەڵاتی سیاسیو ئەو داخوازیە کۆمەڵگەییدا هەبێ کە زۆرینە دەیخاتەڕوو. لێرەوە دیموکراسی ناگاتە لوتکەی گەشەی خۆی تەنها لەکاتێکدا نەبێ هێزە کۆمەڵگەییەکان و هێزە سیاسیە چالاکەکان لە پەیوەندیدابن لەگەڵ یەکتر، ئیدی سیفەتی نوێنەرایەتیکردن مسۆگەردەبێ بەمەرجێ ئەو سیفەتە پەیوەست بێ بە سنوردارکردنی دەسەڵاتەکان و هوشیاری هاوڵاتیبوونەوە. دیموکراسی لە سەرکەوتنی کامپێکی کۆمەڵگەیی یان سیاسی دیاریکراودا کورتنابێتەوە، هەروەك چۆن لە سەرکەوتنی تەنها چینێکدا کورتنابێتەوە.

## پەراوێزەکان

(1) *Partitocrazia* لە دەقەکەدا بە ئیتالی هاتووە، واتە حوکمی حزب یان حزبۆکراتی.

(2) *Rotten boroughs* لە دەقەکەدا بە ئینگلیزی هاتوە، واتە کڕینی (هەندێ شمەکی تایبەت) لە شارە ئینگلیزیە بچوکەکاندا.

(3) *mainstream* لە دەقەکەدا بە ئینگلیزی هاتوە، واتە شەپۆلی بەهێز کە توانای ڕماڵینی هەیە.

(4) *Cocooning* لە دەقەکەدا بە ئینگلیزی هاتوە، واتە گەڕانەوە بۆ خودو خۆپاراستن لە مەترسییە دەرەکیەکان.

(5) *Saior Pars* واتە توێژی تایبەت.

(6) *Cientificos* لە دەقەکەدا بە ئیسپانی هاتوە.

(7) *Estado novo* لە دەقەکەدا بە ئیسپانی هاتوە، واتە قۆناغی نوێ.

## سەرچاوە

ألان تورين، ماهي الديمقراطية حكم الأكثرية أم ضمانات الأقلية. ت: حسن قبيسي.(بيروت: دار الساقي، 1995)، ص 73-89.

# مێژووی فەلسەفییانەی بیرۆکەی کۆمەڵگای مەدەنی

**رۆری ئۆبرین**

**لە ئینگلیزییەوە: ئاوات ئەحمەد**

ئەمەی خوارەوە نیگایەکی کورتە بۆ بیرکردنەوەی هەندێك لەو فەیلەسوفە کاریگەرانەی بە درێژایی سەردەمەکان بایەخیان داوە بەوەی کە گەلان چۆن دەتوانن بە باشترین شێوە پێداویستییەکانی تاك بەجێ بگەیەنن و لە هەمان کاتیشدا ئامانجە دەستەجەمییەکانیش جێبەجێ بکەن. وا گریمانە کراوە کە کاتێك خەڵکی ناو کۆمەڵگا بە شێوازێکی مەدەنییانە مامەڵە لەگەڵ یەکتریدا دەکەن، ئەوا ئەوەی سەرەوە بە باشترین شێوە پیادە دەکرێت.

## سەردەمی کلاسیك

### سۆکرات[1]

زیاتر لە دوو هەزار ساڵ لەمەوبەر، فەیلەسوفە کلاسیکییەکان خەریکی تاوتوێ کردنی ئەو چەمکانە بوون کە لە ژیانی ناو دەوڵەتشارەکانی[2] یۆناندا باو بوون. خەڵك چۆن دەتوانن ژیانێکی چاك بەسەر ببەن.

لە کاتێکدا کێشمەکێشێك هەیە لە نێوانی پێداویستییەکانیاندا وەك تاك و پێداویستییەکانی کۆمەڵگاکەیاندا؟ بە پێی گێڕانەوەکانی ئەفلاتون، سۆکرات بانگەشەی بۆ ئەوە دەکرد کە پێویستە ئەو مەسەلانە بە ئارگیومێنتی[3] ئاشکراو جەماوەریی چارەسەر بکرێن و شێوازی دیالەکتیك[4] بەکار بێنن، کە بریتیە لە شێوازێك لە دیالۆگی عەقڵییانە، کە تێیدا پێشنیارەکان مشتوماڵ دەکرێن بۆ ئەوەی راستی بدۆزنەوە، ئیتر بەمشێوەیە بەردەوام دەبن تا دەگەنە بۆچوونێك کە رەتکردنەوەی بۆ نیە.

### ئەفلاتون[5]

ئەفلاتون پێناسەی دەرونی مرۆڤ، یاخود کەسێتی مرۆڤی کردووە، کردوویەتی بە سێ بەشەوە: ئارەزوو، کە بە دوای تێرکردنی جەستەدا دەگەڕێت، رۆح کە داوای سەنگینیی کۆمەڵایەتی دەکات، هەروەها عەقڵ، کە ئەمیان بۆ راستی دەگەڕێت. تاکی دادپەروەر ئەو کەسەیە کە عەقڵی، بە یارمەتی رۆحێکی بەهێز، بەسەر داواکارییەکانی ئارەزوودا زاڵ دەبێت. کۆمەڵگای دادپەروەر بریتیە لەو کۆمەڵگایەی تێیدا تاکەکان خۆیان تەرخان دەکەن بۆ چاکەی گشتی، مەشق لەسەر نیکییەکانی[6] دانایی، جوامێریی، میانڕۆیی و دادپەروەریی دەکەن، هەروەها ئەو رۆڵە پیشەییەش دەبینن کە تێیدا شارەزان. دەوڵەتی نمونەیی لای ئەفلاتون لە لایەنی پادشایەکی فەیلەسوفەوە بەڕێوە دەبرێت، کە بە باشترین شێوە بڕیارەکانی بۆ چاکەی گشتی تەرخان دەکات.

### ئەرەستۆ[7]

لای ئەرەستۆ باشترین دەوڵەت ئەوەیە کە چینی ناوەڕاست سیاسەتەکەی بەڕێوە ببەن، کە ئەمان لە خواستە تایبەتییەکانیاندا میانڕۆترن، زیاتر مەیلیان لە یەکسانێتییە، لە چاو دەوڵەمەندەکان یان هەژارەکاندا. بەڵام مادام چینی بچکۆلەی ناوەڕاست بە دەگمەن دەتوانێت رووبەڕووی حەزو ئارەزووی دەوڵەمەندەکان یان هەژارەکان ببێتەوە، ئەوا هەوڵ دەدات شێوەی ئۆلیگۆپۆڵی[8] (فەرمانڕەوایی لە لایەنی کەمینەیەکی دەوڵەمەندەوە) یان دیموکراسی (فەرمانڕەوایی زۆرینەی هەژار) پیادە بکات.

ئەرەستۆ دەڵێت، لای ئۆلیگۆپۆڵی، دیموکراسی زیاتر پەسەندەو دوو لایەنی ئازادیی دابین دەکات. یەکەمیان ئەوەیە پێویستە تاکەکان دەرفەتی ئەوەیان هەبێت بەشداریی بکەن لە فەرمانڕەواییدا، ئەویش بەوەی کاروباری پۆستە گشتییەکان بگرنە دەست. پێویستە یاساکان بریتی بن لە سەرەنجامی لێکۆڵینەوەو مشتوماڵکردنی گشتی لە نێوانی خەڵك خۆیاندا نەك بە تەنیا شارەزا و پسپۆڕەکان، چونکە خەڵکی لە توێی دەمەتەقێکردنەوە بەهرەی پراکتیکی خۆیان پێش بخەن و زامنی رازیکردنی هەموو بەشەکانی کۆمەڵگا بکەن. دووەمیش ئەوەیە کە، خەڵك کە پێویستە بە شێوەیەکی دروست ملکەچی یاساکان بن، دەشبێت بتوانن بەو شێوەیە بژین کە خۆیان دەیانەوێت، ئازاد بن لەوەی دەوڵەت دەست وەربداتە کاروباریانەوە. بۆیە پێویستە خەڵکی بە یەکسانی مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت.

ئەرەستۆ زانینی زانستی کە سەرقاڵی شتە سروشتییەکانەو بە زۆریی لە رێگای بنەما تیورییەکانەوە دادەڕێژرێت، جیا دەکاتەوە لە زانینی پراکتیکی، کە ئەمیان بایەخ دەدات بە ئاکارێتی و عەقڵانێتی هەڵس و کەوتی مرۆڤ. چالاکییە مرۆییەکان بە پێچەوانەی جێگیریی سروشتەوە، شتێکە ناتوانرێت پێشبینی بکرێت، بە تەنیا لە توێی تاقیکردنەوەوە لێی تێدەگەین، نەك دەرەنجامە تیورییەکان. بۆیە ناتوانرێت لە توێی تیورییەکی ساز و رێکوپێکەوە هەڵبسەنگێنرێت، وەك چۆن تیورییە نمونەییەکەی ئەفلاتون دەیکرد.

بەڵکو بە تەنیا لە تویێی بیناکردنی خەسڵەتە عەقڵییەکانەوە دەبێت کە ئەوانیش خۆیان لە خۆیاندا بەشێکن لە ئەزمونی بوون.

## سەدەکانی ناوەڕاست

### سانت ئۆگەستین[9]

سەدەیەك دوای ئەوەی مەسیحییەت بوو بە ئاینی ڕەسمی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی، سانت ئۆگەستین "شاری خودا"[10]ی نوسی، کە تێیدا باسی باوەڕبوون بە یاسای سروشتی کرد بۆ کۆمەڵگا، کە لەسەر بنەمای عەقڵ دامەزراوە، ئەمەی کرد بە پاشکۆی باوەڕ بوون بە یەزدان. ملکەچکردن بۆ ئیرادەی یەزدان، وەك ئەوەی دامودەزگاکانی مەسیحییەت لە ڕێگەی تۆقاندنەوە ڕاڤەیان کردووە، بۆ ئەوەیە کە ئازار و ئەشکەنجەی هەتا هەتایی مرۆڤ لە بەرامبەری گوناحەکەی یەکەمیدا[11]، کورت بکرێتەوە بۆ ئەم ئەشکەنجەیەی دونیا. ئیتر لە سەدەکانی دواتری فیۆدالیزمدا[12]، ئەمە بوو بە بناغەی یاسا و ڕێساکان.

### تۆماس ئەکوینی[13]

لە سەدەی سێزدەهەمدا، تۆماس ئەکوینی لە سەر بناغەی دیسان دۆزینەوەی کارەکانی ئەرەستۆ، جارێکی تر عەقڵی کردەوە بە هاوشانی باوەڕ، وتی دەشێت بە شێوەیەکی عەقلانییانە لە هەڵس و کەوتی دروستی مرۆڤ بکۆڵینەوە، ئەویش لە تویێی لێکۆڵینەوەی یاساکانی سروشتەوە، بەڵام ئەم کارە تەنیا شانبەشانی یاسا ئاسمانییەکان دەکرێت کە یەزدان دایڕشتوون. کتێبی پیرۆز[14] بەها ئاکارییەکان دەخاتە ڕوو، کە ڕێنمایی مرۆڤ دەکەن بۆ لێکدانەوەی پرەنسیپەکانی یاسای سروشتی لە پێکهێنانی چەند یاسایەکی تایبەت بە مرۆڤدا. بۆیە ئامۆژگارییەکەی ئینجیل بۆ "خۆشویستنی دراوسێ" ڕێنماییەکە بۆ ناسینەوەی ئەوەی کاتێك مرۆڤ ڕێز لە یاسا هاوبەشەکانی نێوانی خۆیان دەگرێت، ئەوکاتە لە باشترین حاڵەتیدا دەبێت، ئیتر دەستی دەگات بەو یاسایانەی کە بە یەکسانی مامەڵەی هەموو هاوڵاتییان دەکات.

### مارتن لۆسەر[15] و جۆن کالڤین[16]

لە سەرەتای سەردەمی ڕێنیسانسدا[17]، مارتن لۆسەر و جۆن کالڤین وەك ناڕەزایی دەربڕین دژی دەسەڵاتی کەنیسەی ڕۆمان کاسۆلیك[18]، ئاینی پرۆتستانتیان[19] هێنایە کایەوە، کە بە بڕوای ئەوان کەنیسەی ڕۆمان کاسۆلیك تووشی گەندەڵی ببوو. یەکەمین بەشداریکردن لە ئایدیای کۆمەڵگای مەدەنیدا، بریتی نەبوو لە گرتنەوەی جێگەی دەوڵەت، بەڵکو بریتی بوو لەوەی کە پێویستە خەڵك سەربەست بن لە هەڵبژاردنی پێوەستبوونی ئاینیی خۆیاندا، ئەمە لە کاتێکدایە کە ئاینەکە خۆی بانگەشە بۆ بەزەیی و چاکەکاریی دەکات لەگەڵ دراوسێکاندا.

## سەردەمی هزر

### تۆماس هۆبز[20]

تۆماس هۆبز لە ماوەی شەڕی ناوخۆی ئینگلتەرەدا ژیاوە (1642–1651)، کە پادشاو پشتیوانیلێکەرەکانی دەجەنگان بۆ حکومەتە ترادیسیۆنەکە لە کەنیسەو دەوڵەتدا، دژی

پشتیوانیلێکەرانی پەرلەمان کە ئەمان داوای گۆڕانکاریی رادیکالانەیان دەکرد لە ئاییندا، هەروەها دەسەلاتی زیاتریشیان دەویست بۆ ئاستی نەتەوەیی. هۆبز لەو بڕوایەدا بوو کە لە حاڵەتی سروشتیدا، خەڵك هەموویان یەکسان بوون بە یەکتریی، بەلام لە ململانێی لەمەڕ سەرچاوەکاندا کە پەرت و بلاو و دەگمەنەکاندا وای لێکردوون لە کۆمەڵگایەکدا بژین کە "هەمووان دژی هەمووان بن". سەرەنجامیش ژیان کەرت و پەرت و هەژار و دزێو و کێویی و دڕندەو کورتخایەنی لێدەرچوو". بە درك کردن بەوەی کە دەوڵەتێکی ئاوا پڕ لە کێشمەکێشی بەردەوام خەبات لە پێناوی هێزی تایبەتیدا دەبێتە هۆی سنورکردنی پەرەسەندنەکان و سامانی کۆمەلایەتی لاواز دەبێت، ئیتر خەڵك بە دوای بناغەی نوێتردا دەگەڕێت بۆ کۆمەڵگا کە تێیدا نیکییە مەدەنییەکان لە یاسای سروشتی داڕنراون، کە یەکەمیان ئەوەیە هەموو تاکێك بە دوای ئاشتیدا دەگەڕێت. پاشان لە فەرمانڕەوایی ئینجیلیش دابڕان، کە دەڵێت وەك چۆن رێز لە مافەکانی خۆمان دەگرین، ئاواش پێویستە رێز لە مافەکانی ئەوانیتر بگرین.

هۆبز لە ژێر کاریگەریی کاردانەوەی گەشەکردنی مامەڵە ئابورییەکان لە کۆمەڵگادا، وتی پێویستە پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکان لەسەر بناغەی یەکسانیی و متمانەی ئاڵوگۆڕ دابمەزرێن، هەروەها پێویستە هەموو تاکێك"پابەندی ئەو پەیمانانە بێت کە بەستوونی"کە با بڵێین پێویستە ئەوانە لە ناو رێکەوتننامەو گرێبەستەکانی خۆیاندا بژین. بەلام لەبەر ئەوەی هەندێجار خەڵکی بە هەڵەدا دەچن، پێویستە بە رەزامەندیی خەڵکی دەوڵەتێك بخوڵقێنرێت بۆ پاراستنی ئاشتی و زامنکردنی ئەو شتانەی بینا کراون. پێویستە دەوڵەت بێلایەن بێت بۆ ئەوەی مافی هەموو هاولاتیان زامن بکرێت، هەوەها بۆ ئەوەی بەرژەوەندیی تاکێك یان گروپێك لەسەر حیسابی تاکێك یان گروپێکی تر گەشە نەکات. دوای رەزامەندیی گشتی دەوڵەت یاخود گرۆپی گشتی، کە هۆبز ناوی لێناوە لیڤیاتان (بە ناوی درنجە دەریاییەکەی ناو ئینجیلەوە)، خوڵقێنراوە، کە رێگە نادات هیچ هەڕەشەیەك بکرێتە سەر ئاسایشی گشتی، دەبێت هەموو ناڕەزاییەکی سیاسیش بگرێتەوە. هەموو دەسەلاتە یاسادانەرە شەرعییەکان و دەسەلاتەکانی جێبەجێکردن لەسەر یەك تاکە جەستە دەزگا پیادە بکرێت. ئیتر ئەو دەزگایە پەرلەمان بێت، یاخود پادشایەك بێت، پێویستە دەسەلاتی ئەوەی هەبێت کە بەسەر تەنانەت پێڕەوە ئاینییەکانیش و باوەڕەکانیشدا دەستی بڕوات.

### جۆن لۆك[21]

جۆن لۆك کە تەنها چەند دەهەیەك دوای ئەوە نوسیویەتی، پێی داگرت لەسەر ئەوەی کە پێویستە دەسەلاتی دەوڵەت سنور بکرێت بۆ ئەوەی نەتوانێت هەڕەشە لە مافە بنەڕەتییەکانی هاولاتییان بکات. ئەو پێشنیاری کردووە کە پێویستە دەسەلاتەکانی دەوڵەت سنور بکرێن، بەوەی دابەش بکرێن بۆ سێ توخمی بنەڕەتی کە دوو بەشی جیا وەئەستۆیان دەگرن. لقی یاسادانان بایەخ دەدات بە دانانی یاسا، لە کاتێکدا لقی جێبەجێکردن بەرپرسیارە لە وەزیفەکانی خستنەگەڕی یاساو سەرقاڵبوونی سیاسەتی دەرەوە. ئەو بیرۆکەکەی خۆی لەسەر

بناغەی ئایدیای یاسا سروشتییەکانی یەزدان دارِشت، کە گریمانەی ئەوە دەکات کە هاولآتییانی تاک وەکو مرۆڤ چەند مافێکی سروشتییانەیان هەیە کە کەس بۆی نییە لێیان زەوت بکات، وەك مافی پاراستنی ژیان، ئازادی، هەروەها موڵکایەتی. ئەو نیکیی لێبوردەیی، کە نیکییەکی سروشتییە، پێش خست بۆ ئەوەی باوەڕو هەڵسوکەوتەکانی ئەوانیتریش بگرێتەوە، بەوەی نابێت مافی کەس لەو بارەیەوە پێشێل بکرێت. بۆیە، رایگەیاند کە تاکەکان بۆیان هەیە پێکەوە کۆببنەوەو کۆمەڵەو گرووپ دروست بکەن، بە سەرپشکیی خۆیان پەیوەندیی ساز بکەن، بێ ئەوەی کەنیسەکان حەقیان هەبێت بەسەریانەوە، هەروەها دەوڵەتیش چ دەسەلآتێکی بەسەر پێرەوە ئاینییەکاندا نیە.

(لێرەدا پێویستە هەڵوەستەیەك بکەین و وەسفی هەندێك لەو گۆڕانکارییانە بکەین، کە لە سەدەی هەژدەیەمدا لە کۆمەڵگادا روویاندا. ئەوە سەردەمی رۆشنگەری[22] بوو، کە تێیدا لە ژێر کاریگەیی پێشکەوتنی عەقلانییەت[23] و فیزیاو ماتماتیکدا، فەیلەسوفان پەرەیان دا بە ئایدیا فەلسەفی و سیاسییەکانیان. هەروەها سەردەمی وەرچەرخانی کۆمەلآیەتی و شۆڕشی پیشەسازی[24] بوو، کە تێیدا پەرەسەندنی زانست و تەکنەلۆجیا، بەرهەمێنان و گواستنەوەو پەیوەندیکردنیان پێشخست. لە راستیدا، ئەمە بووە هۆی بەرینبوونەوەی بازرگانیی نەتەوەیی و نێونەتەوەیی، لەپاڵ گەشەکردنی سیستمە دارایی و ئابورییەکاندا، ئیتر چینێکی بە دەسەلآتی بازرگانەکان سەری هەڵدا. ئەمەش یاریدەی زیاتربوونی دانیشتوانی ناو شارەکانی دا، کار زیاتر و زیاتر دابەش بوو، نایەکسانێتی کۆمەلآیەتی گەشەی کرد، سەرەنجامەکەی بووە هۆی ئەوەی کرێکاران و کارگەران لە رەوشێکی سەخت و نارەحەتدا بژین).

## سەردەمی رۆشنگەری

### جان جاك رۆسۆ[25]

لە ناوەڕاستی 1700 کاندا، جان جاك رۆسۆ هەوڵیدا خەڵك قایل بکات بەوەی لۆك و هۆبز بایەخی زیاد لە پێویستیان داوە بە مافی تاکەکان، کە بووەتە هۆی ئەوەی بە دوای بەدەستێنانی کەلوپەلی تایبەتیدا رابکەین و دەوڵەت دەست وەرنەداتە کاروبارمانەوەو چاکەی گشتی و نیکیی مەدەنیمان بیر بچێتەوە. ئەو هەستی کرد گەشەکردنی دابەشبوونی کار، بووەتە هۆی قووڵکردنەوەی نایەکسانیی سروشتی و لوتکەکەشی بریتی بووە لە دامەزراندنی چینی بازرگان و بازاڕکار و چینێکی خاوەن موڵك کە دەستیان بەسەر سەر باقی دیکەی کۆمەڵگادا گرتووە. ئەم چینە، بۆ خۆلادان لە مەترسی جەنگی ناوخۆ، هەوڵیداوە تورەیی هەژاران بە دامەزراندنی سیستمێکی کۆمەلآیەتی نوێ هێمن بکاتەوە، کۆمەڵگایەکی مەدەنی کە یەکسانی و ئازادی بۆ هەمووان دابین دەکات.. رۆسۆ دەڵێت، بەلآم ئەمە فێڵێك بوو بواری رەخساند بۆ دەوڵەمەندەکان تا ئەو نایەکسانییەی نێوانی هەژاران و خاوەن ئیمتیازەکان بپارێزن بە گریمانەکردنی ئەوەی هەر کەس ئازادە ئەو ئیمتیازانەی دەست بکەوێت. هەروەها لەبەر ئەوەی هەژاران ئەم چەشنە بەرێوەبردنەیان پەسەند کرد، ئیتر ئارەزووی

ڕاپەڕینیان نەما. ڕۆسۆ ئەو بیرۆکەیەی داهێنا کە پەیمانی کۆمەڵایەتی بریتیە لە هۆکارێك کە بەهۆیەوە هاوڵاتییان چاکەی گشتی دەکەن بە شتێکی زۆر لەبەرچاو گیراو. ئەمەش بەوە دەبێت کە هەر کەسێك دەسبەرداری هەندێك لە مافەکانی تاك ببێت لە پێناوی کامەرانیی کۆمەڵ و مافی ژیانی پێکەوەیی خۆش. دەوڵەت بریتیە لە مەیدانی پێناسەکردنی سروشتی چاکەی گشتی و ئازادی مەدەنی ئەو کاتە سەر هەڵدەدات کە هەموو خەڵك ئامادە بن تا ئیرادەی گشتی جڵەویان بکات. خەڵکانی گشتی ئەوانەن کە یاساکان دادەنێن، بۆیە ئەوان ئەو یاسایانە دادەنێن کە سەرەنجامەکانیان دەگاتە دروستبوونی تاکی میانڕۆ و سامانیش بەشێوەیەکی یەکسان پەرەدەسێنێت و متمانەو دڵنیایی بڵاو دەبنەوە.

بیریارە ئیرلەندییەکانی سەردەمی ڕۆشنگەریی، بەشێوەیەکی تایبەتی دەیڤید هیۆم، ئادام فێرگەسۆن و ئادام سمیس، پێکەوە پێشەکییە فەلسەفییەکانیان بۆ بازرگانێتی سەرمایەدارانە دارِشت.

### دەیڤید هیۆم[26]

دەیڤید هیۆم لە لێکۆڵینەوەکەیدا دەربارەی سروشتی مرۆڤ، ئارگیومێنتی لەسەر ئەوە کردووە کە عەقڵ و ئاکارێتی هیچ یەکێتییەکیان لە نێواندا نیە، خەڵك ئامانجی خۆیان لەسەر بنەماکانی ئاکارێتی دادەمەزرێنن، بەڵام عەقڵ بەکاردەهێنن بۆ ئەنجامدانیان. سیٚ یاسا بنەڕەتییەکەی هیۆم بۆ وەگەڕخستن ـ سەقامگیرێتی موڵکایەتیکردن، گوێزانەوەی موڵك بە ڕەزامەندیی، هەروەها بردنە سەری بەڵێنەکان ـ ئەمانە نەریتی مرۆڤانەن و لەسەر بنەمای یاسای سروشتی دانەمەزراون. ناواخنی ئەم بیرۆکەیە زۆر قووڵ بوو، گەیاندینیە سەر بیرۆکەی ئەوەی کە خەڵك، بە بەکارهێنانی هۆشیان بۆ ئەوەی دوای بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان بکەون، سەرەنجام بەرژەوەندیی کۆمەڵگاش وەکو گشت بەدیی دەهێنن. خەڵك یاسای زەمین دادەنێن و شوێنی دەکەون، ئەمەش بۆ ئەوە نیە کە خزمەتی چاکەیەکی گەردوونییانەی پیٚ بکەن، بەڵکو بۆ ئەوەیە بە شێوەیەکی وریاو ڕۆشن بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان پێشبخەن و زیادی بکەن.

### ئادام فێرگەسۆن و ئادام سمیس

فێرگەسۆن و سمیس هەردوکیان پێیان وابوو کە پێویستیی پرەنسیپی کۆمەڵگای مەدەنی ئاکارێتییەکی تایبەتی بووەو لەسەر درکپێکردنی گشتی ڕاوەستاوە، لە توێی پێوەستەکانی ویژدانەوە پەیوەندیی پێوە کراوە. ئەم هەڵوێستە بنەڕەتییە ئادام سمیسی نەگێڕایەوە لەوەی جەخت بکات کە بەهۆی شوناسی تاك و ئەو دەسەڵاتەی لە بەها درکپێکراوەکانی تردا هەیە لە ناو پانتاییەکانی ئاڵوگۆڕدا، ئەگەر دەوڵەت دەست نەخاتە ناو کاروباری بازاڕەوە ئەوا ڕەوشی تەواوی کۆمەڵگا باشتر دەبێت.

### ئەمانوێل کانت[27]

پرەنسیپی سەرەکی کانت لەمەڕ کۆمەڵگای مەدەنی بریتی بوو لەوەی کە پێویستە خەڵکی وەکو ئامانج مامەڵە لەگەڵ خەڵکی تردا بکەن، نەك بە مەبەستی ئەوەی ئامانجی ئەوانیتر بێت. بە

واتایەکی تر، پێویستە گرنگی بدەین بەوەی کە چۆن ئەوانیتر سوود لە هەڵسوکەوتی ئێمە وەردەگرن، نەك تەنیا چۆن بەکاریان بهێنین بۆ سوودی خۆمان، پێویستە دڵنیا بین لەوەی کە هەر هۆکارێك بەکاردەهێنین بۆ گەیشتن بە بەرژەوەندی خودی خۆمان، دەست وەرنەداتە مافی ئەوانی ترەوە بۆ شوێنکەوتنی بەرژەوەندی خۆیان. هەروەها لە کاتێکدا کانت لە نکولیکردن لە ئێتیك[28] و ئاکاردا هیوّمی لە ناو زەمینەی تایبەتیدا پەرچ دەکردەوە، گۆڕەپانێکی گشتی بۆ گوتاری عەقڵانی و رەخنەیی خۆشکرد کە بایەخدەدات بەو ئامانجانەی کە دەوڵەت وەئەستۆی گرتوون. لەم بارەیەوە، ئەو یەکەمین کەس بووە کە پیشنیار بکات کە پێویستە کۆمەڵگایەکی مەدەنیی وەزیفیی ماوەیەك لە دەوڵەتەوە دوور بێت.

## سەدەی نۆزدەهەم

### ج . و . ف . هێگڵ[29]

لە سەرەتای سەدەی نۆزدەدا، ج . و . ف . هێگڵ لە ناو رەوتە مێژووییەکاندا، شوێنپێی پەرەسەندنی ئایدیای کۆمەڵگای مەدەنی هەڵگرت و جەختی کردە سەر بنەماکانی وەك دەسکردێکی مرۆۋ نەك وەك واقیعێکی میتافیزیکی کە پێشتر لەناو سیستمی سروشتیدا بوونی هەبێت. ئەویش، ئەندیشەی کۆمەڵگای مەدەنی وەك جوغزێکی جیا لە دەوڵەت کرد، کە تێیدا خەڵکی هەم کارگەرن و هەم سەرفکەری کاری خەڵکن. خەڵك تێدەکۆشن وەکو سەرفکار یەکسان بن بەوانیتر، بۆ تێرکردنی پێویستی دانپیانانی ئەوەی کە پێویستە کاڵای تایبەتی بەکاربهێنن. بەمەش، پێداویستییەکان زیادیان کرد، هەمەچەشنی کاڵاکان زیادیان کرد، جۆرەها چەشنی کاریش زیادیان کرد. خەڵك لە دابەشکردنی کاردا، بەشێوەیەکی ئاڵوگۆڕ پشت بە یەکتریی دەبەستن. زیاتر شارەزا بوون و بەهاکانیان زیاتر بوون، بەڵام ئەم پەرەسەندنە تەکنیکییە مەسرەفی بەرهەمهێنانی کەم کردەوەو ئامێرەکان جێگەی کرێکارانیان گرتەوە. بە لای هێگڵەوە، پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە ناو بونیادی کۆمەڵایەتیدا بوونیان هەیە کە چینی کشتیاران، کارسازان، هەروەها چینی خزمەتگوزارانی مەدەنی دەگرێتەوە، کە ئەمیان بیرۆکراتەکانی چینی ناوەڕاستی خوێنەوار دەگرێتەوە کە وا گریمانە دەکرێت تەرخان بن بۆ خزمەتی چاکەی هەمووان. هەموو ئەم شتانە پێشگریمانەی کۆمەڵگایەکی مەدەنین کە بەرامبەری دەوڵەت دەوەستێتەوە، کە تێیدا بەرژەوەندییە زۆرەکان ململانێی یەکتریی دەکەن، بەشێوەیەکی گشتی بەبێ گوێدانە چاکەی گشتی. هێگڵ بۆ زامن کردنی ئەوەی کە بەرژەوەندییەکی دیایکراو بەسەر ئەوانیتردا زاڵ نابێت جیاکارییەکەی هیوّم و کانتی لە نێوانی هزری گشتی و ئاکارێتی تایبەتیدا رەتکردەوە، بیرۆکەی کارگە وەك شوێنی بەیەکگەیشتنی ئیرادەی تاك و ئیرادەی گەردونیی کۆمەڵگای کورت کردەوە، ئەو جۆرە ئیرادەیە توخمە پراکتیکیەکان و ئێتیکییەکان لە ناو یەك شێوەی هزرکردندا یەکدەخات کارگە لە توێی ئیعتیراف بەیەك کردنی پێداویستییەکان بەشداریکردنەکان، هەروەها، دەلاڵەکانی نێوان بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی ئەندامەکانی کۆمەڵگا و بەرژەوەندییە گەردونییەکانی دەوڵەتەوە، بوار بۆ ژیانی گشتی

دەرەخسێنێت. کەواتە کارگە، لە رۆڵە نێوانسازێتییەکەیدا، ئەرکی ئەوەشی هەیە مەشق بکات، وەک چۆن بەها مەدەنییەکانیش فێر دەکات، وەک هۆکارێکی پێشخستنی چاکەی گشتی، بەڵام ئەوە دەوڵەتە کە ناوبژیوانی کۆتایی ئاکارێتییە، بۆیە، ئاراستە ئاکارییە پێویستەکان بۆ کۆمەڵگای مەدەنی فەراهەم دەکات.

### ئەلەکسی دی تۆکیڤیل

ئەلەکسی دی تۆکیڤیل سۆسیۆلۆجیست و سیاسەتمەدارێکی فەرەنسی بوو، کە شیکردنەوەیەکی هاوچەرخی بۆ کۆمەڵگای ئەمریکایی کرد لە سەرەتاکانی دەوڵەتی دیموکراسییەوە. وا هەستی کرد کە ئەمریکییەکان ئەکشنی خۆیان لەسەر دوو چەمکی بەرایی دامەزراندووە، تاکگەرایی و یەکسانێتی. لەکاتێکدا کە تۆکیڤیل هەستی کرد کە زیادەڕۆیی لە تاکگەراییدا دەبێتە هۆی خۆپەرستییەکی بەربڵاو و نیکییە مەدەنییەکان تێکدەشکێنێت، دانیش بەوەدا دەنێت کە ئەمریکییەکان بە پەرەپێدانی یەکسانێتی جوانییان پاراستووە، لە توێی هەستکردن بە یەکسانێتی لەگەڵ ئەوانیتردا کە بوار بە پێداویستییە ئاڵوگۆڕە بەرێزەکانی خەڵک دەدات، ئەوانەی پێویستن بۆ هاندانی بەشدارییەکی سەرکەوتووانەی گشتی لە ژیانی سیاسیدا. ئەمە خۆی لە مەیلی هاونیشتمانیبووندا بەیان دەکات بۆ پێکهێنانی گروپ و کۆمەڵە خۆبەخشەکاندا. تاک تەنیا وەک بەشێک لە گرووپ دەتوانێت درک بەوە بکات کە بەرژەوەندی خۆیان بە بایەخدان بە بەرژەوەندییەکانی ئەوانیتر خزمەتی دەکرێت. بەشێکی زۆری ئەم سەرکەوتنەی سیستەمی سیاسی ئەمریکی لەسەر درککردن بە فرەیی حکومەتی لۆکاڵ راوەستاوە، کە رێگە بە بەشداریکردنی زیاتری جەماوەر دەدات لەو مەسەلانەدا کە پەیوەندییان بە هەمووانەوە هەیە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تۆکیڤیل لەوە دەترسا کە ملنانی ئەمریکییەکان بەرەو دەسکەوتی ئاڵوگۆڕ وایان لێدەکات بایەخیان بە کاروباری گشتی نەمێنێت، هەروەها زرنگانە درک بەو درزە شاراوانە دەکات کە بەهۆی گەشەکردنی سامان و دەسەڵاتەوە لە نێوانی چینی دارادا چینی کارگەراندا دروست دەبێت.

### کارل مارکس

کارل مارکسیش بایەخی داوە بە گەشەکردنی دەسەڵاتی چینی داراو بە سامان. گەرچی باوەڕی وابوو کە دیموکراسی باشترین شێوازی دەوڵەتە، بەڵام هەستی کرد کە هێگڵ بەشێوەیەکی نادروست دەوڵەت ئایدیاییی دەکات، بەهەڵە گریمانەی کردووە کە دەشێت تۆنی ئاکاریی کۆمەڵگا ساز بکرێت و لە نێوانی بەرژەوەندییە ناکۆکەکاندا، زامنی چاکەی گشتی بکرێت. مارکس هەستی کرد کە رەهەندی تایبەتی کۆمەڵگای مەدەنی بەهێز سیمای گشتی بەزاندووە، کە لە کۆمەڵگایەکی بە بازاڕکراودا، سەرەنجامی بە زیاد جەختکردن لەسەر مافەکانی تاکەکان دەکەوێتەوە بۆ ئەوەی شوێنی بەرژەوەندی خۆیان بکەون و ئەمەش لەگەڵ شلکردنەوەی مافەکانی هاوڵاتیاندا بۆ شوێنکەوتنی بەرژەوەندییە بازرگانییەکان، جووت دەبێت.

بیری کردەوە، خەڵک لە ناو کۆمەڵگایەکدا کە پێشوەخت مۆرکی سیستەمی بەرهەمهێنان و

سەرفکردنی پێوە لکاوە، ئەوەندە نامۆ دەبن کە دەسبەرداری پێشخستنی بەهرەو تواناکانی خۆیان وەکو مرۆڤ دەبن. کە دەبن بە گەرد و لەوانیتر غەریب دەبن، ئیتر کەمتر ئارەزووی ئەوە دەکەن پەرە بە نیکییە مەدەنییەکان بدەن، زیاتر حەزدەکەن وەکو هۆکار مامەڵە لەگەڵ ئەوانیتردا بکەن، نەك وەك ئامانج. لە ئابوریی بازاڕی سەرمایەدارییدا، کە هانی هەڵپەکردن بۆ پارە دەدات، چاوچنۆکی بەهایەکی باو دەبێت. هەستکردنی تاك بە بەرژەوەندی تایبەت و شوناسی خۆی کەمتر لەسەر بەها تراديسيۆنییەکان رادەوەستێت، زیاتر لەسەر پیشەو داهات و مۆڵکایەتی رادەوەستێت.

لە سایەی سەرمایەداریدا خاوەنە دەوڵەمەندەکانی هۆکارەکانی بەرهەمهێنان وەکو کالاّ مامەڵە لەگەڵ کرێکاراندا دەکەن، وەکو ئامێر وەگەڕخەر لەناو سیستمێکی تۆکمەی پیشکەوتووی بەرهەمهێنانی کەل و پەلدا بەکاریان دەهێنن. بڕی بەهای زێدە لە کارگەرەکانیان دادەڕنن و ئەو سەرمایەیە بەکاردەێنن بۆ دەوڵەمەندکردنی خۆیان و فراوانکردنەوەو پێشخستنی کاروبارەکانیان. هەتا ئەم موغامەرانە گەشە بکەن، لە مەیدانی ململانێی نێودەوڵەتیدا، ئەوان زیاتر بۆ بەرژەوەندی نەتەوەیی گرنگ دەبن . مارکس دەڵێت، مانای ئەمە ئەوەیە کە دەوڵەت زیاتر مەیلی لەوە بووە کە بەرژەوەندی ئەوان بپارێزێت دژی بەرژەوەندی کرێکاران. لە سایەی سەرمایەدارێتیدا، ئەم بالاّدەستییەی چینێك بەسەر چینێکی تردا شتێکی خۆ لێلانەدراوە و بەردەوامیش دەبێت هەتا شۆڕشێك سەرهەڵدەدات و کۆمەڵگای فرەچین لەناو دەبات و لەوێدا کۆمەڵگای مەدەنی راستەقینە باڵ دەکێشێت.

## سەدەی بیستەم

### جۆن راول

جۆن راول یەکێکە لە سەرەکیترین بیریارە سیاسییەکانی ئەم سەدەیە. بەشداریکردنە سەرەکییەکەی لە چەمکی کۆمەڵگای مەدەنیدا، بریتیە لە مێژووی دادپەروەریی. بۆ دامەزراندنی گۆشەنیگایەکی ستاندارد کە بە هۆیەوە دادوەرییکردنی نیکیی مانای تەرخانکردنی ئەوە دەگەیەنێت کە راول پێی دەڵێت کالاّی بەرایی، وەك مافەکان، دەسەلاّتەکان، دەرفەتەکان، داهات، سامان، هەروەها بنەماکانی ڕێزگرتن لە خود، ئەو گریمانەی "پەردەی نەزانیی" یەك دەکات کە وا دەکات پایەو رەوشی مرۆڤ لە ژیاندا نەزانراو بێت. ئەمە وا دەکات کە بڵێین بڕیارەکانی دابەشکردنی کالاّ بەراییەکان لەسەر بنەماکانی بەخشینی ژیانێکی ئابڕومەند بۆ ئەوانەی لە خراپترین حاڵەتی شیاودان، دەدرێن، چونکە رەنگە بڕیاردەرەکان بۆیان دەربکەوێت کە لە ژێر پەردەکەدا خۆشیان هەر لە هەمان رەوشدا دەژین.

لەپاڵ پرەنسیپی سەربەستی یەکساندا، کە مافی هەمووان بۆ دەنگدان و وەرگرتنی پۆستە گشتییەکان و ئازادیی ئاخاوتن و ویژدان و بیرکردنەوەو کۆمەڵە دروست کردن دەگرێتەوە، مافی موڵکایەتیکردنی تایبەتی بە پێی یاساش دەگرێتەوە، ئەو پرەنسیپێکی تریش زیاد دەکات کە بریتیە لە دەرفەتی یەکسان بۆ کێشمەکێشکردن بۆ

هەر پلەیەك لەناو كۆمەڵگادا. ئەم پرەنسیپانە ئایدیاكەی راول دیاریی دەكەن لەمەڕ "لیبرالیزمی سیاسی" كە تێیدا جیهانی سیاسی كە پێكهاتووە لە دەزگا گشتییەكان و بونیادە كۆمەڵایەتییەكان، جیادەكاتەوە لە جیهانی نا- گشتی نا - كەلتوریی، كە تێیدا خەڵكی لە توێی چەندان كۆمەڵەی جیاجیاوە بەپێی پێڕەوە ئاكارییەكانی نێوانیان لەگەڵ یەكترییدا كارلێكدەكەن. نابێت رێگە بە سەرهەڵدانی هیچ بەهایەك بدرێت لە نا - گشتییەوە ببێت بە بنەمای دادپەروەریی، چونكە دەوڵەتەكە دەكات بە رژێمێكی سەركوتكەر.

بۆ زامنكردنی بەهاكانی دیموكراسییەكی دەستوریی، كە راول هەست دەكات باشترین چەشنی حكومەت بێت چونكە رێگە بە فرەیی و سەقامگیرییش دەدات، پێویستە هامڕایی دەستوریی و گوتاری گشتی دەربارەی بابەتە سیاسییەكان و تامەزرۆیی بۆ چارەسەری كێشەكانیش، لە توێی مافە یەكسانەكانەوە ئەنجام بدرێت.

## پەراوێزەكانی وەرگێڕ

1–**سۆكرات** *Socrates* (470 . 399 پ.ز) یەكەمینی ئەو سێینە فەلسەفییە گرنگەیە كە بنەماكانی فەلسەفەی خۆرئاوایان داڕشتووە. سۆكرات و قوتابیەكەی (ئەفلاتون) و قوتابی قوتابییەكەی(ئەرەستۆ)، سۆكرات فەلسەفەی برد بەرەو لێكۆڵینەوە لەژیان و چالاكییەكانی مرۆڤ، هەربۆیە سیسیرۆ دەربارەی دەڵێت سۆكرات فەلسەفەی لە ئاسمانەكانەوە داگرت بۆ سەرزەوی. دواجار بەتاوانی بێباوەڕی و تێكدانی رەوشتی لاوانی ئەسینا حوكم دەدرێت و دەرمانخوارد دەكرێت.

2–**دەوڵەتشار** *City-State* حكومەتێكی خۆبەخۆ ئیكتیفاكەرو ناوەندێكی شارنشینەو بە شێوەیەكی گشتی چواردەوری بە ناوچەیەكی گوند نشینی سەربەخۆ گیراوە. شارەكانی یۆنانی دێرین لەم چەشنە ئیداریە بوون، لەوانە ئەسینا، كە سەربەخۆییەكی سیاسیی تەواوی هەبوو. رۆمانیش لە سەرەتاكانیدا دەوڵەتشار بووە. لە ماوەی هەرەسهێنانی ئیمپراتۆرییەتی رۆمانی تادەگاتە سەدەی نۆزدەیەم، زۆرێك لە شارەكانی باكوری ئیتالیا، وەك فلۆرەنسەو جەنەوا، دەوڵەتشار بوون. هەروەها شەش حەوت شاری باكوری ئەڵمانیاش وەك دەوڵەتشار ناسراون، لەوانە برێمێن و هامبۆرگ كە تا سەدەی نۆزدەیەم شتێك لە سەربەخۆیی خۆیانیان پاراستبوو.

3–**ئارگیومێنت** *argument* گەرچی دەتوانین لە زمانی كوردیدا وشەی مشتومڕ بەرامبەری ئەم زاراوەیە دابنێین و تا رادەیەكی زۆریش ماناكە دەپێكێت، لە زۆر شوێنیشدا وامان كردووە. وەلێ ئەم زاراوەیە لە ئاخاوتن و دانوساندنە فەلسەفییەكاندا زۆر دوبارە دەبێتەوە، بۆیە جێی خۆیەتی وشەكە بێتە ناو زمانەكەمانەوەو خوێنەری كورد پێی ئاشنا ببێت، بە تایبەتی لەم دواییەدا كە هەندێك لە نوسەرانیش وەكو خۆی بەكاری دەهێننەوە. لە زمانی فەلسەفەدا زاراوەكە مانایەكی بەرینی هەیە، بەڵام دەتوانرێت بوترێت كە لە زمانی فەلسەفەدا زاراوەكە بۆ دەربڕینێك یان تێزێكی لۆجیكییانە بەكاردەهێنرێت كە دەرەنجامێكیشی لەگەڵدایە، واتە بیركردنەوەو ئاخاوتنێكی عەقڵانییانە كە لە پێشەكییەكەوە یان چەند پێشەكییەكەوە دەستپێدەكات و دەگاتە پێشكەشكردنی بەڵگەو دەستاوێژ بۆ دەرەنجامێكی چاوەڕوانكراو یان چاوەڕوان نەكراو.

4–**دیالەكتیك** *Dialectic* لە فەلسەفەدا، بریتیە لە میتۆدی لێكۆڵینەوەی سروشتی راستیی بەهۆی شیكردنەوەی رەخنەییانەی چەمكەكان و

گریمانەکانەوە. یەکێك لە نمونە هەرە زووەکانی میتۆدی دیالـەکتیکی، بریتیـە لـە دایلۆگـەکانی ئـەفلاتون، کـە تیایانـدا هـەوڵ دراوە لەراسـتیی بکۆڵرێتـەوەو لەشـێوەی پرسـیارو وەڵامـدا دەمەتەقێیـەك دروسـت بکرێـت. وەلێ ئەرەسـتۆ پێـی وابـووە کـە دیالـەکتیك بریتیـە لـە گـەڕان بەدوای بنەما فەلسەفییەکانی زانستدا، بۆیە ئەو زاراوەی دیالـەکتیکی زیـاتر بـەمانای هاومانایـەك بـۆ زانسـتی لۆجیك بەکارهێناوە.

5–**ئـەفلاتون** Plato (circa 428-c. 347 bc) **فەیلەسوفێکی** یۆنانییـە، یەکێکـە لـە کاریگـەرترین و ئەفرێنـەرترین بیریارەکانی فەلسـەفەی خۆراوا. ئـەفلاتون لـە خێزانێکـی ئەریستۆکراسـی ئەسـینایيدا لـەدایك بـووە، دەڵـێن ئەریسـتۆنی بـاوکی نـەوەی دوایـین پادشـای ئەسـینایە، دایکیشـی خزمـی سۆڵۆنی یاساناس بووە. منـداڵ بووە کە باوکی مردووەو دایکی شووی کردۆتەوە بە پیلامپس کە هاوکاری پێرکلیسی سیاسـەتمەدار و پیـاوی دەوڵـەت بـووە. لـە لاویـدا حـەزی لـە سیاسـەت بـووە، بـەڵام سیاسەتمەدارانی ئەسینا تووشی بێئومێدییان کـردووەو رای گۆڕیـوە. سـەرەنجام دەبێـت بـە قوتـابی سـۆکرات و پاشان گەورەترین تۆمارکەرو لێکدەرەوەو گەشـەپێدەری فەلسەفەی مامۆستاکەی. فەلسەفەی سۆکرات شیوازێکی دیالـەکتیکی هەیـە، مشـتومڕو دەمەتـەقێ و پرسـیار و وەڵامە. هەتا ساڵی 399 کە تێیدا سۆکرات دەرمـانخوارد دەکرێت، لەگەڵ مامۆستاکەیدا دەمێنێتـەوە، پاشان روو دەکاتە ئیتایا و سیسیلی و ئینجا میسر. دوای گەشت و گەڕانێکی زۆر لەساڵی 387 ی پێش زاییندا لە ئەسینا ئەکادیمیاکـەی دادەمـەزرێنێت، کـە بـە یەکـەمین زانکـۆی مێژووی ئەوروپا لـە قەڵـەم دەدرێت. ئەکادیمیا پێڕەوی خوێنـدنی تایبـەتی خـۆی هـەبوو، بابەتگـەلێکی وەکـو ئـەناتۆمی، بـایۆلۆجی، ماتماتیـك، تیـوری سیاسـی، فەلسەفەی تێدا دەوترایەوە. دیارترین قوتابی ئەکادیمیا ئەرەسـتۆیە کـە دواتـر قوتابخانـەی سـەربەخۆی خـۆی دادەمـەزرێنێت. نوسـینەکانی ئـەفلاتون هـەموویان لـە شـێوەی دایالۆگـدان، لـەو دایالۆگانـەدا ئایـدیاو چـەمکە فەلسەفییەکان دەخرێنە بەر لێپرسینەوەو تاقیکردنـەوەو رەخنەیان لێدەگیرێت. سەرجەمی کارەکانی ئەفلاتون 35 دایـالۆگ و 13 نامـەن، کـە گومـان لـە خاوەنـدارێتی هەندێکیان دەکرێت. دایالۆگەکانی ئەفلاتون دەکرێن بە سێ کۆمەڵـەوە: سـەرەتا و ناوەڕاسـت و کۆتـایی، بەشـی کۆتاییـان زیـاتر شـێوەی پەخشـانی وەرگرتـووە. لـە دایالۆگـەکانی سـەرەتایدا پێڕەویـی لـە شـێوازە دیالەکتیکییەکـەی سـۆکرات دەکـات، لـە زۆرینەیانـدا سـۆکرات پرسـیار لـە کەسـێك دەکـات کـە خـۆی بە دانا دادەنێت، لەچیدا شارەزایت و پاشان لە رێگـەی پرسـیار و وەڵامـەوە دەری دەخـات کـە دانـا نیـە. هەنـدێك لـەم دایالۆگانـە بـریتین لـە: خارمیـدس: میـانڕۆیی، لیسـیس: هاوڕێیـەتی، لاخـیس: ئازایـەتی، پرۆتاگۆراس: فێرکردنی فەزیلەت، یـوتیفرۆن: سروشـتی ئاینـداریی، هـەروەها کتێبـی یەکـەمی کۆمـار: دادپـەروەریی. پاشـان دایالۆگـەکانی ناوەڕاسـت هـی ئـەو ماوەیـەن کـە لـە رووی فەلسـەفییەوە گەشـە دەکـات و تێڕوانینی فەلسەفییانەی خۆی دەبێت، بەڵام هێشتا هـەر سـۆکرات کاراکتـەری سـەرەکیی دایالۆگەکانـە، لەوانـە: گۆرگیـاس: رەوانبێـژیی، ئـەپۆڵۆجی: داکۆکییەکـەی سـۆکرات لەبـەردەمی دادگـادا، مینـۆن: زانـین، کریتـۆن: هەڵنـەهاتنی سـۆکرات، قایـدۆن: رۆح، سـیمپۆزیەم: خۆشەویستی.

6–**نیکی** *virtue* بە یۆنانی دێرین پێی دەوترێت ئارێتێ *arete* ئەوپەڕی چاکی، حاڵەتی بونەوەری مردە کە خۆی لە خۆیدا شایستەی ستایش کردنە، ئەو حاڵەتەیە کە ئەگـەر یـەکێك هـەیبێت بـە چـاك دادەنرێـت، چـاودێریی دادپەروەرانەی یاساکان، ئەو خەسڵەتەی کە تێیدا ئەو کەسەی چاکە بەو پەڕی نایاب دادەنرێت، ئەو حاڵەتـەی کە دڵسۆزی بۆ یاساکان بەرهەم دەهێنێت. وشـەی نیکی

و گەردانەکانی (نیك، نیکبوون..) وشەگەلێکی ئاڤێستایی ڕەسەنن.

7–**ئەرەستۆ** Aristotle (384-322 BC)، فەیلەسوف و زانای گریکیی بەناوبانگ، لەگەڵ ئەفلاتون و سۆکراتدا بە دامەزرێنەری فەلسەفەی خۆراوا لە قەڵەم دەدرێن. ئەرەستۆ کوڕی نیقۆماخۆسی پزیشکی تایبەتی پادشای مەکدۆنیە بووە، لە شاری ستاگیرا لەدایك بووە، لە تەمەنی حەڤدەساڵییدا چۆتە ئەسیناو لەبەردەستی ئەفلاتوندا بووە بە قوتابی و هەتا مردنی مامۆستاکەی لە ئەکادیمیاکەی ئەودا ماوەتەوە. سەرەتا زۆر بە مامۆستاکەی سەرسام بووەو بە رۆحێکی ئەفلاتونییانەوە دەینوسی و نوسینەکانیشی لە شێوەی دیالۆگدا بوون، هەندێك پەرەگرافی ئەو دایلۆگانەمان پێگەیشتووە، بە تایبەتی ئۆدامس کە باسی هەستی ئایینی دەکات و دەگاتە ئاستی تەسەووف. مشتومڕێکی زۆر لە نێوانی ئەرەستۆ و ئەفلاتوندا سەری هەڵداوە، بە تایبەتی دەربارەی مەسەلەی ئیدیاڵەکان، کە ئەفلاتون پێی وابووە خۆیان لە خۆیاندا بوونیان هەیە، بەڵام ئەرەستۆ دەیووت وا نییە بەڵکو بە تەنیا وێنەن و شتەکانیش کە ماهییەتن لەو وێنانەدا ماقووڵ دەبن، واتە هەموو شتێك لە مادەو وێنە پێکدێت. دوای مردنی ئەفلاتون دەچێت بۆ ئەکسۆس و قوتابخانەی تایبەتی خۆی دادەمەزرێنێت، پاشان قوتابخانەکەی دەبات بۆ میتیلینا و هوتا ساڵی 342 لەوێ دەمێنێتەوەو پاشان دەبێت بە مامۆستای ئەسکەندەر کە ئەو کاتە سێزدە ساڵان بوو، لەو ماوەیەدا کتێبی مەسەلە هۆمیرییەکانی نوسی. پاشان لە ساڵی 335 –334 دا دەگەڕێتەوە بۆ ئەسیناو قوتابخانەیەك دادەمەزرێنێت کە بە ناوی لۆکییۆنەوە شۆرەتی پەیدا کرد. کتێبی سیاسەتی ئەرەستۆ بەرامبەری کتێبی کۆماری ئەفلاتون دەوەستێتەوە لە گرنگییدا. یەکێك لە نوسراوە هەرە گرنگەکانی بریتیە لە ئۆرگانون Organon، کە بە مانای ئامێر دێت و بریتیە لە نامەیەك دەربارەی لۆجیك. هەروەها دەربارەی فیزیك و فەلەکناسیی و ئاکارو سیاسەت و گیانەوەران و ڕووەکسازیی و میتافیزیکیش کتێبی لێ جێماوە.

8–**ئۆلیگۆپۆڵی** Oligopoly ڕەوشێکی ئابوورییە کە تێیدا بەرهەمێکی تایبەتی لە لایەنی چەند سەرچاوەیەکی زۆر کەمەوە دابین دەکرێت، بە جۆرێکی وا کە جۆرە ڕەفتارێك لە یەکێکیانەوە ڕوودات، یەکسەر کار دەکاتە سەر بەرهەمەکەو بەهای بەرهەمەکە. بۆیە یاساکانی دابینکردن و داوا کردن لە کێبڕکێی ئۆبلیگاپۆڵییانەدا بەشێوەیەکی جیاوازتر کار دەکەن.

9–**ئۆگەستین ، سانت** Augustine،(354-430) Saint ، مەزنترین قەشەی لاتینیە، دیارترین سەرکردەی کەنیسەی خۆراوایە. سەرەتای ژیانی زۆر بە بەرەڵایی و بێباوەڕی بەسەر بردووە. بەڵام دوایی پەشیمان بۆتەوەو لەکتێبی دانپیانانەکانیدا باسی ئەو قۆناغەی ژیانی خۆی کردووە. بۆماوەی دوازدە ساڵ لەگەڵ کچێکدا پەیوەندییان هەبووە، بێ ئەوەی مارەی بکات، کوڕێکیشی لێی دەبێت.

10–**شاری خودا** City of God (413-26) کتێبێکی نێوداری سانت ئۆگەستینە کە تێیدا فەلسەفە تیۆلۆجییەکەی خۆی بۆ مێژوو دەخاتە ڕوو. ئەم کتێبە لە 22 بەش پێکهاتوو، دە بەشیان تەرخانن بۆ مشتومڕ و شەڕە گوتاری یەکێتی بوون. دوانزە بەشەکەی تر تەرخانە بۆ ڕەگ و ڕیشە و پەرەسەندن و چارەنوسی کەنیسەو وەکو جێگرەوەیەکی گونجاوی فرەخودایی لە قەڵەمی دەدات.

11–**گوناحی یەکەم** Original Sin لە **تیۆلۆجیای** مەسیحیدا، بریتیە لە ئەنجامدانی گوناحەیەکی گەردونیی کە لە سەرەتای ئەفراندنی مرۆڤدا، لە ناو بەهەشتدا، لە چەشنی مرۆڤ وەشاوەتەوە، ئەو گوناحە دراوەتە یەکەمین مرۆڤی دروستکراو، واتە ئادەم. لە

پێڕەوی مەسیحیدا، وەك جۆرێك لە جۆرەكانی نامۆبوون و بێئاگابوون لە یەزدان دادەنرێت.

12–**فیودالیزم** (**دەرەبەگایەتی**) Feudalism بریتیە لەسیستمێكی پەیوەندییە سیاسیی و سەربازییەكان، كە بەپێی پەیمانێك دامەزراوە، لەنێوانی خێزانە خانەدانەكانی ئەوروپای خۆراوادا، لەتوێی سەدەكانی ناوەڕاستدا. فیودالیزم لەسەر بنەمای قۆرخكردنی ناوچەیەك راوەستاوە، كە بەناوی موڵكەوە دەدرێ بەوانەی كاری تێدا دەكەن و كرێیان لێ وەردەگیرێت، هەروەها لەكاتی شەڕو شۆڕەكانیشدا جوتیارەكانی سەر زەوییەكە بەكار دەهێنرێن بۆ خزمەتی ئاغاكەیان.

13–**ئەكوینی**، **سانت تۆماس** Aquinas، Saint Thomas (1225-1274) هەندێكجار بە ناوی دكتۆری ئینگلیزیی یان میری تۆزەرانەوە بانگ كراوە. فەیلەسوف و ئاینزایەكی ئیتالییە، كارەكانی كاریگەرییەكی زۆریان لەسەر فەلسەفەی سكولاستی هەبووەو یەكێكیشە لە سەركردەكانی كەنیسەی رۆمان كاسۆلیك.

14–**كتێبی پیرۆز** Bible، بریتیە لە كتێبی ئاینیی جولەكە( تەورات) و مەسیح ( ئینجیل ). تەورات و ئینجیل لەیەكتریی جیاوازن. تەورات سی و نۆ كتێبە و هەموویان لەئەسڵدا بەزمانی عیبریی نوسراون، جگە لەچەند بەشێكی كەمی كە بەزمانی ئارامیی نوسراوە . ئینجیل دوو بەشە، پەیمانی دێرین و پەیمانی نوێ كە بیست و حەوت كتێبە. پەیمانی دێرین لەلایەنی دوو قوتابیی مەسیحەوە نوسراوەتەوە، كە ئەمیان بەتۆزێك لێ زیادكردنەوەوە، لەگەڵ حەوت كتێبی تردا، تەورات پێكدەهێنن.

**15–لۆسەر، مارتن** Luther،(1483-1546) Martin ئاینزایەكی ئەڵمانییە، سەركردەیەكی ناسراوی جولانەوەی ریفۆرمسازییە، دامەزرێنەری پێڕەوی پرۆتستانتیزمە. كاریگەریی زۆری لەسەر ئایین و سیاسەت و ئابوریی و رۆشنبیری جیهانیی داناوە. ئینجیلی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی ئەڵمانی و كاریگەرییەكی زۆری هەبووە لەگەشەكردنی زمانەكەدا. لۆسەر نكولیی لەوە دەكات كەپیاوانی كەنیسە نێوەندێك بن لەنێوانی یەزدان و مرۆڤدا. لۆسەر یەكێكە لەناوە هەرە درەوشاوەكانی مێژووی نوێی ئەوروپا.

16–**كالڤین**، **جۆن** Calvin،(1509-1564) John تیۆلۆجیستێكی فەرەنسییە، ریفۆرمكارێكی ناو كەنیسەیە، مرۆڤدۆست و سەرپەرشتیاری كەنیسەیە. دامەزرێنەری پێڕەوی پرۆتستانتیزمە كە بە گەورەترین ریفۆرم دادەنرێت لە مێژووی باوەڕی مەسیحییدا.

17–**رێنیسانس** Renaissance، بریتیە لەزنجیرەیەك لە جولانەوەی ئەدەبیی و كەلتوریی لەهەرسێ سەدەی 14،16،15، دا. ئەم جولانەوانە لەئیتالیاوە سەریان هەڵداو، بەرەو ئەڵمانیا، فەرەنسە، ئینگلتەرەو بەشەكانی تری ئەوروپا تەشەنەیان كرد. لێكۆڵینەوەی ژیارە مەزنەكانی یۆنانی دێرین و رۆمانەكان، بوون بەهۆی ئەوەی كەلتوری تایبەتی خۆیان بەرهەم بهێنن و ببن بەكێباری ئەو ژیارە دێرینانە. بیركردنەوەی ئەو بیریارانە كەوتە ژێر كاریگەریی مرۆڤدۆستییەوە . هیومانیزم، كە جەخت دەكاتە سەر بایەخی تاك. هیومانیستەكانی رێنیسانس باوەڕیان وابوو كە دەتوانرێت لەرێی رۆشنبیریی كلاسیكەوە كۆمەڵگای مرۆڤایەتی پێش بخرێت. ئەم رۆشنبیرییە سەرچاوەی خۆی لەتێكستە دێرینەكانەوە وەرگیراوەو جەخت دەكاتە سەر شیعرو مێژوو. رەوانبێژیی، لەگەڵ فەلسەفەی ئاكارییدا.

18–**كاسۆلیك، كەنیسەی رۆمانیی** Roman Catholic Church، بریتیە لەفراوانترین بەشی ئاینی مەسیحی، لەو مەسیحییانە پێكهاتووە كە ملكەچن بۆ دەسەڵاتی پاپای رۆما. وشەكە لە وشەی katholikos ی یۆنانییەوە هاتووە، كە مانای گەردونیی یان جیهانیی دەگەیەنێت و هەر لەسەرەتاكانی ئاینی مەسیحییەوە بەكارهاتووە، ئەوكاتەی كە تاكە كەنیسەی مەسیحیی بووە.

19–**پرۆتستانتیزم** Protestantism، یەکێکە لە سێ لقە سەرەکییەکەی ئاینی مەسیحی، کە دوانەکەی تر کاسۆلیك و ئارسۆدۆکسن. پرۆتستانتیزم لەسەدەی شازدەیەمدا، وەکو جوڵانەوەیەکی ریفۆرمکار لەناو کەنیسەی خۆراواییدا، دەستی پێکردووە. مەبەستی سەرەکیشی بریتی بوو لەژیاندنەوەی دابونەریتە رەسەنەکانی مەسیحییەت.

20–**هۆبز، تۆماس** *Hobbes*،*(1588-1679)* *Thomas* فەیلەسوف و سیاسیی نێوداری ئینگلیزە، لە زانکۆی ئۆکسفۆرد خوێندویەتی و بە ئەوروپادا گەڕاوە، لە پاریس مارسین و لە ئیتالیا گالیلۆی ناسیوە. فەلسەفەیەکی سروشتی لەسەر بنەمای یاسای هەستەکان دارشتووە، بە بڕوای ئەو زانین لە ئەزمونەوە پەیدا دەبێت و هەستیش پرەنسیپی زانینی پرەنسیپەکانەو زانستیش لەمەوە گەشە دەکات. دیارترین نوسراوی کتێبی لیڤیاتانە ــــ 1650 "وشەکە مانای درندە یان دێو دەگەیەنێت و مەبەستی لێی هێمای هێزە"، هاونیشتمانی ـ 1642، دەربارەی جەستە ـ 1655،

21–**لۆك، جۆن** Locke،(1632-1704) John فەیلەسوف و ئابوریناس و سیاسەتمەدارێکی ئینگلیزییە، لە خێزانی پیاوێکی دارتاشدا لەدایك بووە، زانستی پزیشکیی خوێندووەو رازگری ژمارەیەك سیاسەتمەداری سەردەمی خۆی بووە، سەفەر و گەڕانی زۆر بووە. دامەزرێنەری قوتابخانەی ئەزمونگەرییە. دیارترین نوسراوی بریتیە لە"وتارێك دەربارەی تێگەیشتنی مرۆیی. 1650"، وتارێك دەربارەی لێبوردەیی ــ 1869، پاشان هەر لە هەمان ساڵدا لێکۆڵینەوەیەکی دەربارەی حکومەتی مەدەنیی نوسیوە. بە بڕوای لۆك ئەزمون تاکە سەرچاوەی بیرە.

22–**سەردەمی رۆشنگەری** Age of Enlightenment ئەم زاراوەیە بەکارهێنراوە بۆ پێناسەکردنی ئەو مەیلەی لە بیرکردنەوەو نوسینی بیریارەکانی ئەوروپاو کۆلۆنییە ئەمریکییەکاندا، لە ماوەی نێوان سەدەی هەژدەیەم و دوای شۆڕشی فەرەنسیی برەوی هەبووە. زاراوەکە لە لایەنی نوسەرانی سەردەمەکە خۆیەوە بەکارهێنراوە، ئەوان لەو بڕوایەدابوون کە بەهۆی عەقڵ و زانست و رێزگرتنی مرۆڤایەتییەوە، لە وڵاتانی بیرە تاریك و نادانەکانەوە، بەرەو رۆشنایی هاتونەتە دەرەوە.

23–**عەقلانییەت** Latin ratio) Rationalism،("reason")، لەفەلسەفەدا، بریتیە لەسیستمێکی بیرکردنەوە کە جەخت دەکات لەسەر رۆڵی عەقڵ لەپەیدا کردنی زانیندا، لەپاڵ ئەزمونگەراییدا empiricism، کە ئەمیان جەخت دەکاتە سەر رۆڵی ئەزمون و تاقیکردنەوە، بەتایبەتی دەرکی هەستی .perception . دەتوانین بڵێین عەقلانییەت لەنزیکەی هەموو قۆناغەکانی فەلسەفەی خۆراواییدا ئامادەیی هەبووە. بەڵام بەشێوەیەکی سەرەتایی لە رینیە دیکارتی فەیلەسوفی سەدەی حەڤدەیەمی فەرەنساوە، ناسنامەی خۆی وەرگرتووە.

24–شۆڕشی **پیشەسازیی، شۆڕشی** Industrial Revolution بریتیە لە جێگرتنەوەیەکی بەرفراوانی ئیشی دەست و ماسولکە، بەئیشی ئامێر، ئەمەش لەسەدەی هەژدەیەمەوە لەبەریتانیا دەستی پێکردووەو، هەتا ئەمڕۆش لەهەندێك ناوچەی سەرزەوییدا بەردەوامیی هەیەو تەواو نەبووە. شۆڕشی پیشەسازیی، بەرەنجامی ژمارەیەکی زۆر گۆڕانکاریی بنچینەیی و پەیوەندیدار بوو، کە ئابوریی کشتوکاڵیی گواستەوە بۆ ئابوریی پیشەسازیی. زۆرینەی گۆڕانکارییە یەکسەرییەکان لە سروشتی بەرهەمهێناندا روویاندا: چی بەرهەم دەهات، هەروەها لەکوێ و چۆن، ئەو شتانەی بەبڕێ کەم و لەناو ماڵ و دوکانەکاندا بەرهەم دەهاتن، وایان لێهات لەناو کارگەکاندا بەرهەم بهێنرێن. بەرهەمداریی و کاریگەریی تەکنیك بەشێوەیەکی زۆر دراماتیکی پەرەیان سەند، لەبەشێکدا بریتی بوو لەئەنجامی پیادەکردنی زانیارییە

زانستییەکان و زانینە پراکتیکییەکان، لەبەشەکەی تریشیدا بەرەنجامی کۆکردنەوەی هێزێکی کاری زۆر بوو لەناوچەیەکی دیاریکراودا.

25–**رۆسۆ، جان جاك** *Jean Jacques (1712-،Rousseau 1778)* فەیلەسوف و تیوریستی سیاسیی نێوداری فەرەنسایە، نوسینەکانی بە یەکێك لە هۆیەکانی هەڵگیرسانی سۆڕشی فەرەنسە دادەنرێن. لە 28 ی حوزەیراندا لە جنێڤ لەدایك بووەو لە 2 ی تەموزدا لە ئێرمۆنڤێلی فەرەنسا مردووە. باوکی سەعاتچی بووە، باپیری رەوکردوویەکی فەرەنسایی پرۆتستانت بووە، ناوی ئیسحاق بووەو کچێکی خەڵکی جنێڤی هێناوە کە ناوی سۆزان بیرنار بووەو بەسەر رۆسۆوە رۆیشتووە. رۆسۆ نوێنەری باڵی چەپی لایەنگیرانی رۆشنگەریی فەرەنسییە، وەکو فەیلەسوف و زانای سۆسیۆلۆجیاو زانای ئیستاتیکاو رۆماننوس ناسراوە.یەکێکیشە لە گرنگترین تیوریستانی بواری پەروەردە. بانگەشەی کردووە بۆ باوەڕبوون بە یەزدان و نکولیکردن لە سرووش. نوسینە سەرەکییەکانی بریتین لە : وتارێك دەربارەی نایەکسانێتی لە نێوانی مرۆڤەکاندا ــ 1755، پەیمانی کۆمەڵایەتی ــ 1762، ئەمیل یان دەربارەی پەروەردە ـ 1762.

26–**هیوٚم ، دەیڤید** Hume،(1711-1776) David ،Hume ، (1711-1776) David، مێژوونوس و فەیلەسوفێکی سکۆتلەندییە، کاریگەریی هەبووە لەسەر پەرەسەندنی هەردوو پێڕەوی کۆمان و ئەزمونیی. هیوٚم نەچۆتە قوتابخانەوە لەماڵەوە خوێندوویەتی و لە تەمەنی دوازدەساڵیدا چۆتە زانکۆی ئێدینبۆرگ، هەروەها تەندروستییشی باش نەبووە. دیارترین نوسراوی بریتیە لە نامەیەك دەربارەی سروشتی مرۆڤ، A Treatise of Human Nature لەسێ بەرگدا لە ماوەی نێوان ساڵانی 1739ـ 1740دا نوسیویەتی . پاشان لەساڵی 1741ـ 1742دا دووبەرگی ئاکاری سیاسیی بڵاوکردەوە.

27–**کانت، ئەمانوێل** Kant،(1724-1804) Immanuel ، فەیلەسوفێکی ئەڵمانییە، بەڕای زۆر لەبیریاران مەزنترین فەیلەسوفە لەسەردەمی مۆدرێندا. دەرچووی زانکۆی کینگسبورگەو فیزیاو ماتماتیکی خوێندووە، پاشان بۆ ماوەی پازدە ساڵ دەرسی وتۆتەوە. سەرەتا زانست و فیزیای دەوتەوە، پاشان وردە وردە وانەکانی فراوان کردەوەو، زوربەی لقەکانی فەلسەفەشی گرتەوە. لەمیانەی نوسین و وانەکانییەوە شۆرەتێکی باشی پەیدا کردووە، بەڵام هەتا ساڵی 1770 کورسی ئوستادێتیی لەزانکۆ بەدەست نەهێناوە، کە دەبێت بەپرۆفیسۆری لۆجیك و میتافیزیا، ماوەی بیستوحەوت ساڵی دواتر لەسەر وانەوتنەوەی ناو زانکۆ بەردەوام بووە. وانە نا ئاینییەکانی کانت، کە زیاتر لەسەر عەقڵانییەت دامەزرابوون، نەك سروش یان وەحیی ئاینیی، تووشی چەند قەیرانێکیان کرد لەگەڵ حکومەتەکەی پروسیاداو، لەساڵی 1792دا، پادشا فرەدریکی دووەم فەرمانی پێدەکات کە نابێت دەربارەی بابەتە ئاینییەکان وانە بڵێتەوە یان بنوسێت. کانت بۆ ماوەی پێنج ساڵ گوێڕایەڵی ئەم فەرمانە دەبێت، دوای ئەوە پادشا دەمرێت، بۆیە دیسان تێهەڵدەچێتەوە. ساڵێك دوای خانەنشین بوونی ، واتە لەساڵی 1798دا، پۆختەی بۆچوونەکانی خۆی لەمەڕ ئایین بەچاپ دەگەیەنێت.. لەساڵی 1781دا کتێبی رەخنەگرتن لەعەقڵی پەتی Critique of Pure Reason بەچاپ دەگەیەنێت، کە بەگرنگترین کتێبی ئەو دەژمێردرێت.

28–**ئێتیك** ethika (Greek ،Ethics from ethos،"character"،("custom"" بریتیە لەپرەنسیپەکان یان ستاندەردەکانی هەڵسوکەوتی مرۆڤ، هەندێکجار پێی دەوترێت مۆراڵ . ئاکار mores (Latin،("customs" ، هەروەها بەلێکۆڵینەوەی ئەو پرەنسیپانەش دەوترێت، بۆیە هەندێکجار پێی دەوترێت فەلسەفەی ئاکاریی. مۆراڵی.

29–**هێگڵ، جۆرج ولیەم فریدیریك** *Georg ،Hegel Wilhelm Friedrich (1770-1831)*، فەیلەسوفێکی ئایدیالیستی ئەڵمانە، یەکێکە لە هەرە کاریگەرترینی فەیلەسوفەکانی سەدەی نۆزدە. لە شتوتگارت لە دایك بووە، باوکی فەرمانبەری باج بووە، لە ژینگەیەکی پرۆتستانتی خاوێندا پەروەردە کراوە، هەرزوو لە قۆناغی خوێندنی سەرەتاییەوە، شارەزای فەلسەفەی کلاسیکی یۆنان و رۆمان بووە. باوکی هانی داوە ببێت بە ئاینزا، لە ساڵی 1788 دا، پەیوەندیی کردووە بە پەیمانگای ئاینیی سەر بە زانکۆی توبینکێنەوە. لەوێ پەیوەندیی هاوڕێیەتی لەگەڵ هۆڵدرینی شاعیر و شلینگی فەیلەسوفدا بەستووە. دوای ئەوەی کۆرسی فەلسەفەو تیۆلۆجیای تەواو کرد، بڕیاری دا نەچێتە ناو دەزگای ئاینییەوە. لە ساڵی 1793 دا بوو بە مامۆستای تایبەتی لە بەرلین و سویسرە. لە ساڵی 1797 دا پۆستێکی هاوشێوەی لە فرانکفۆرت وەرگرت. دوو ساڵ دواتر باوکی مرد و کاروباری ئابوریی خێزانەکەی بەسەر ئەمدا جێهێشت. لە ساڵی 1801 دا چوو بۆ زانکۆی جین، لەوێ هەم دەشیخوێند و هەم دەشینووسی و سەرەنجام بوو بە وانەبێژ. لە جین کتێبی فینۆمینۆلۆجیای عەقڵی تەواو کرد ـ 1807، کە یەکێکە لە هەرە گرنگترین کتێبەکانی. هەتا ئۆکتۆبەری 1806 لە جین مایەوە، کاتێك فەرەنسییەکان شارەکەیان داگیر کرد ناچار بوو هەڵبێت. باوکی میراتییەکی ئەوتۆی بۆ جێنەهێشتبوو، بۆیە بە ناچاری دەستی دایە کاری رۆژنامەگەریی لە رۆژنامەی *Bamberger Zeitung* دا، لە ناوچەی باڤاریا، حەزی لەو کارە نەبوو، بۆیە گواستیەوە بۆ نۆرنبێرگ و بۆ ماوەی هەشت ساڵ بەڕێوەبەری قوتابخانە بوو. لە ساڵی 1813 دا کتێبی زانستی لۆجیکی چاپ کرد، لە ساڵی 1816 دا پۆستی پرۆفیسۆری فەلسەفەی لە زانکۆی هایدلبێرگ پەسەند کرد، پاشان کتێبی ئینسایکلۆپیدیای زانستە فەلسەفییەکانی چاپ کرد ـ 1817. ساڵی دواتر لە زانکۆی بەرلین وانەی وتەوە. لە ساڵی 1821 دا کتێبی فەلسەفەی مافی چاپکرد. دوای مردنی زۆرێك لە کتێبەکانی تری بڵاو کراونەتەوە، لەوانە: فەلسەفەی هونەرە جوانەکان 1835 – 1838، چەند وانەیەك دەربارەی مێژووی فەلسەفە 1833 1836، چەند وانەیەك دەربارەی فەلسەفەی ئایین ـ 1832، چەند وانەیەك دەربارەی فەلسەفەی مێژوو ـ 1837. ئەم کتێبانە لە وانەکانییەوە کۆکراونەتەوە..

## چاوگەکان


DeLue، Steven M.، Political Thinking، Political Theory، and Civil Society، Allyn and Bacon، Boston، 1997

Seligman، Adam B.، The Idea of Civil Society، Macmillan Inc.، New York، 1992


## سەرچاوە


www.web.ca/robrien

February 1999

## مێژووی فیکری سیاسی لە سەدەی بیستەمدا

لە عەرەبییەوە: سەردەم

*The Cambridge History of Twentieth Century Political Thought*
*Terence ball and Richard Bellamy*
*Cambridge University Press, 2003*
*P. 808*

لە نوسینی ئەم کتێبەدا دوو توێژەری پسپۆڕ لە بواری سیاسەتناسیدا بەشداربوون، ئەوانیش بریتین لە: "تێرنس پۆڵ و ریچارد بیلامی". هەردوو نوسەر لەم بەرهەمەدا مێژووی فیکری سیاسی لە سەدەی بیستەمدا دەخەنە ڕوو.

وەك ئاشکرایە سەدەی بیستەم گەشەکردنی ئایدیۆلۆژیا سیاسیە مەزنەکانی وەك: (فاشیزم و نازیزم و کۆمۆنیزم و لیبرالیزم)ی بەخۆیەوە بینی. ئەڵبەتە ئێمە تەواوی ئەم بزاوتانە ناخەینە یەك ڕیزەوە، بەڵام هەندێك توێژەری هاوچەرخ خەریکن کۆمۆنیزم لە ڕیزی فاشیزم و نازیزمدا دادەنێن، بەو پێیەی قوربانیەکانی دەستی کۆمۆنیزم هیچی لە قوربانیانی فاشیزم و نازیزم کەمتر نییە. لەم ماوەیەی پێشودا کتێبێك بە ناوی (کتێبی ڕەشی کۆمۆنیزم)ەوە دەرچوو، تیایدا هاتووە کە ژمارەی قوربانیەکانی (کۆلاك) و ئەوانی تر لە سەد ملیۆن کوژراو کەمتر نییە. هەرچۆنێك بێت ئەوا ئەم کتێبە دوور و درێژی، ڕەگوڕیشەی ئەو بزاوتانە و چۆنیەتی دروستبونیان و هێز و توانایان لەوەی ملیۆنەها گەنج مۆبێلیزە بکەن، دەخاتە ڕوو.

کارێکی ئاسانە گەر سەرکۆنەی ئەم یان ئەو بزاوتی ئایدیۆلۆژی بکەین، بەڵام ئەوەی پرسیاری سەرەکیە ئەوەیە کە: بۆچی ئەم بزاوتانە توانیان لە ساتەوەختێکی مێژوودا، مۆبیلیزەی گەنجانی ئەوروپا بکەن لەناو ڕیزەکانی خۆیاندا؟ چۆن توانیان ئەو گەنجانە وا لێبکەن بڕوا بە بیروبۆچونەکانیان بهێنن، لە کاتێکدا ئەو تێزانە بارگاوین بە توندوتیژی و توندڕەوی؟ ئەم پرسیارە بەسەر ئەو بزاوتە توندڕەوانەشدا جێبەجێ دەبێت کە هەنوکە لە جیهانی ئیسلامیدا هەن. کەواتە مەسەلەکە تەنها پەیوەندی بە ئیدانەکردن و لایەنگیرییەوە نییە، بەڵکو پەیوەندی بە تێگەیشتنەوە هەیە.

ئێمە دەمانەوێت لەوە بگەین کە بۆچی بزاوتێکی ئایدیۆلۆژی سەرکەوتن بەدەست دێنێ، بەڵام پاش ماوەیەك شکست دێنێ و پاشەکشە دەکات؟ ئەو هۆکارە دەرونی و کۆمەڵایەتی و ئایدیۆلۆژیانە چین دەبنە مایەی سەرکەوتنی یان سەرنەکەوتنی؟

هەرچۆنێك بێت، ئەم بزوتنەوانە لە سەدەی بیستەمدا شوێنی ئایینیان گرتەوە لە ئەوروپادا و پاش پاشەکشەی مەسیحیەت کە ئایینی تەقلیدی خۆرئاوایە، بەرەبەرە لیبرالیزم و سوسیالیزم و نازیزم و فاشیزم و کۆمۆنیزم شوێنیان گرتەوە، ئەمەش بۆ خۆی شتێکی سروشتییە، لەبەرئەوەی نابێت مەیدانەکە بە چۆڵی بمێنێتەوە.

هەردوو نوسەر "تێرنس پۆڵ و ریچارد بیلامی"، بە درێژی باس لە گەورە تیۆرسینانی فیکری لیبرالیزم دەکەن، نمونەکانیان وەك: ئابوری ناسی بەریتانی "کینز" و سیاسەتناسی فەرەنسی "ریمۆن ئارۆن" و بیریاری ئەمریکایی "جۆن ڕۆلس" و چەندانی تر.

هەرچەندە لیبرالیزم فەلسەفەی تایبەتی خۆرئاوایە، بەڵام لە دوای ئەو سوسیالیزم وەکو پەرچەکردارێك لە بەرامبەریدا دروست بوو، لەبەرئەوەی لیبرالیزم بوو بە ئایدیۆلۆژیایەکی تایبەت بە چینی بۆرژوازی یاخود سەرمایەداری، واتە خەسڵەتی ڕادیکاڵی و شۆڕشگێڕانەی خۆی لەدەست دا، ئەو خەسڵەتەی لە سەرەتادا و لە کاتی بەگژاچوونەوەی کڵێسا و سستمی فیودالیزمدا هەڵگری بوو، بەڵام پاش ئەوەی ئەوروپا پڕ بوو لە کۆمپانیا و چینی کرێکاریش زیادی کرد، ئیتر پرۆسەی چەوساندنەوە دەستی پێکرد و فەلسەفەی لیبرالیزمیش بە بەهانەی گەشەپێدانی ئابوری وڵات کەوتە پاساودانەوەی ئەو مەسەلەیە لێرەوە ئیتر ئایدیۆلۆژیای لیبرالیزم ئەو ئاقارە مرۆگەریەی لە دەستدا کە لە سەردەمی ڕۆشنگەریدا هەڵگری بوو، لەبەر ئەم هۆیەش سوسیالیزم وەك ئایدیۆلۆژیایەکی ئەلتەرناتیڤ کە بایەخ بە مافەکانی چینە زۆرلێکراوەکانی کۆمەڵ دەدات بە تایبەتی چینی پرۆلیتاریا، هاتە ئارا. دەتوانین بڵێین ململانێی نێوان لیبرالیزم و سوسیالیزم، مێژووی سەدەی بیستەم هەر لە سەرەتایەوە تا هەرەسهێنانی کۆمۆنیزم و ڕوخانی دیواری بەرلین لە ساڵی 1989، ڕەنگ ڕێژ دەکات.

**سەرچاوە**

بیان الكتب، ژمارە 279، بەرواری 2003/9/8

## بەرهەمی نوێ
## دیکارت

هاری براکین

لە عەرەبییەوە: سەردەم



نوسەری ئەم کتێبە پرۆفیسۆر هاری براکینی پسپۆڕە لە مێژووی فەلسەفەی فەرەنسیدا، کتێبێکی تازەیە بۆ خوێنەری ئینگلیزی لەسەر ناودارترین فەیلەسوفی دنیا(اینیە دیکارت)، گومان لەوەدا نییە کە فەلسەفەی دیکارتی هەموو سەدەی هەڤدەهەمی داگیرکردو کاریگەریی لەسەر گەورە فەیلەسوفانی وەك مابرانش، سبینوزا، لایبتز دانا.

لە سەرەتای کتێبەکەدا نوسەر کورتە ژیاننامەیەکی ئەم فەیلەسوفە باس دەکات کە بۆ ماوەیەکی زۆر دنیای پڕکردبوو، دیکارت لە ناوچەی بواتیەی خوارووی فەرەنسادا ساڵی 1596 لە خێزانێکی تا ڕادەیەك ژیان باشی چینی خانەدانە بچووکەکاندا لەدایك بوە. ساڵی 1604 چۆتە قوتابخانەی یەسوعیەکانەوە. لەگەڵ ئەوەدا کە مامۆستاکانی خۆی خۆشویستووە بەڵام بەرنامەی خوێندنی بەدڵ نەبوەو ڕەخنەی لێگرتووە، کە پاشان لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا (وتارێك دەربارەی میتۆد) بڵاوی کردۆتەوە. لە کتێبەکەدا دەڵێت فێرکردنی فەلسەفەو لۆژیك بە شێوازێکی سکۆلایی، دووبارە بوونەوە، بەتاڵ و وشك بوە. مەبەستی ئەو فێرکردنە بووە کە لە سەدەکانی ناوەڕاست باو بوون، لەوێدا هەندێك ڕەگەزی فەلسەفەی ئەریستۆتالیسی تێکەڵ بە ڕەگەزی باوەڕی

مەسیحیەت کراوە. دیکارت لە وانەکاندا حەزی بە ماتماتیك بوە چونکە فێربوونی وابەستەی دەقی لاهوتیەتی مەسیحی نەبوە.

دیکارت فەیلەسوفێك نەبوە لە بورجێکی عاجیەوە دوور لە دنیا دانیشتبێتو خۆی لە خەڵکی دابڕیبێتو بفەلسەفێنێ، بەڵکو فەیلەسوفێك بوە لە ناو خەمو خەونی سەردەمەکەیو لەگەڵ کێشەکانیدا ژیاوە، چوەتە ناو سوپاوەو فێری شمشێر وەشاندن بوە، تەمەنی بیستو دوو ساڵ بوە کە لە هۆڵەکاندا چوەتە ناو لەشکری میرمۆریس دوناسۆ وەو ساڵی داهاتوویش لە لەشکری میری ناوچەی باخییرا لە ئەڵمانیا خۆی ناونووس کردوە. هەر لە هەمان ساڵداو لە رۆژی 10ی نۆڤەمبەری ساڵی 1619 دا سروشێکی بۆ هات، تووشی گرفتێکی دەروونی یان سوفیگەریەکی توند هات کە بەرئەنجامەکەی دۆزینەوەی حەقیقەتێکی مەزن بوو. لەو کاتەدا هەستی کرد کە پێویستی بە تەریکیو تەنیایی هەیە تا کارە گەورەکانی بە ئەنجام بگەیەنێت، تەواو وەك ئەو تۆڵەی لە ناوەوەیدا هەست بە ژان دەکاتو بە دوای شوێنێکی هێمندا وێڵە تا منداڵەکەی ببێت.

بەرهەمی تێڕامانەکەی ئەو کتێبە مەزنە بوو کە بەرنامەیەکی عەقڵانی بە خۆراوا بەخشیو دەست گیرۆییەکی گەورەی سەرکەوتنو پێشکەوتنی کرد لە بواری زانستو تەکنەلۆژیادا. مەبەستمان لە کتێبەکە (وتارێك دەربارەی میتۆد)ە کە راستەوخۆ بە فەرەنسی نوسیویەتی، واتا بە زمانی ڕەمەکیو ساکاری خەڵکی، یان ئەوەی لەو سەردەمەدا وای پێ دەوترا، چونکە لە هەموو ئەوروپاو زانکۆکانیدا ئەوەی کە باو بوو فەیلەسوفەکان بە لاتینی دەیاننووسی کە زمانی زانستو بیربوو وەلێ دیکارت بە ڕاستی دیموکراتی بوو، پێی خۆشبوو کتێبەکەی بگاتە هەموو خەڵکی، ئەوانەی خودا ئاوەزی پێبەخشیون کە بەشێکیان ئافرەتانە، ئەگەر بە لاتینی بینوسیایە زانا رووناکبیرە گەورەکان نەیاندەبینی: واتا دەستەبژێرە کەمایەتیەکەی فەرەنسا و ئەوروپا.

لە ساڵی 1641دا دیکارت کتێبێکی تری گرنگی بڵاو دەکاتەوە: تێڕامانە میتافیزیکیەکان. ساڵی 1644 کتێبی سێیەمی بە ناوی بنەماکانی فەلسەفە نووسی، کتێبەکەی پێشکەش بە ئەلیزابیتی میری بۆهیمیا کرد. پاشان لە نێوان دیکارت و شاژنی سوید کریستین دا نامە ئاڵوگۆڕکرا و شاژن جەختی لێکرد بۆ دیدەنیی بچێتە سوید و لە دواییدا دیکارت بڕیاری لەسەر چوونەکەی دا. ئەو نەیدەزانی کە ئیدی لەو سەفەرە ناگەڕێتەوە، چونکە بەهۆی سەرمای زۆری سویدەوە نەخۆش کەوت و ساڵی 1650 لە تەمەنی پەنجا و چوار ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

لە سەرەتای کتێبی (وتارێك دەربارەی میتود)ەوە دیکارت دەڵێت: ئێمە هەموومان عەقڵمان هەیە، بەڵام هەموومان نازانین بە راست و دروستی بەکاریبێنین. بۆیە دیکارت گەڵاڵەی میتۆدەکەی خۆی کرد بۆ ڕابەری کردنی خەڵکی لە بەکارهێنانی عەقڵدا بەڕاسترین ڕێگا. فەلسەفەی دیکارت فەلسەفەیەکی شۆڕشگێڕیە، ئەویش بەهۆی ئەو میتۆدەوە کە لە جەخت و وردەکاری زانستی ماتماتیکەوە وەریگرتبوو.

لە پێش دیکارت باوەڕی ئەرەستۆ باو بوو کە تێکەڵ کرابوو بە فەلسەفەی سکولایی سەدەکانی ناوەڕاست، کە کلتور

و هەیبەتی کۆنەکان دەسەڵاتیان بەسەر بیرەکەدا گرتبوو، بەڵام دیکارت دەرگای لەسەر بیری ئازاد و تێگەیشتنی عەقڵانیی بۆ دیاردەکان کردەوە، لەبەرئەوەی دیکارت سەرسووڕماوی بەڵگە درەوشاوەکانی ماتماتیك بوو خەونی بە میتۆدێکی گەردونیەوە دەبینی کە لەسەر بەڵگەی ئاوەز و لۆژیك بنیات نرابێت. میتۆدەکەی دیکارت لەسەر چوار کۆڵەکە دامەزرابوو: روونیەکی تەواو، شیکردنەوە، پێکهاتەیی، ئامار یان ژماردن، رەنگە ئێستا ئەم بنەمایانەمان بە سادەو تەنانەت ساکاریش بێتە بەرچاو، بەڵام دەبێت ئەوە لە یادنەکەین کە ئێمە باسی نزیکەی چوار سەد ساڵ لەمەوپێش دەکەین و، ئەو میتۆدەی لە سەردەمی دیکارتا باوبووە تاڕادەیەکی زۆر کۆن و تەقلیدی بووە. بۆیە دەڵێین میتۆدی دیکارت لەو کاتەدا شۆڕشگێڕانە بووە، چونکە پشتی بەو بەها کۆنانە نەبەستوە کە لە سەرەوە سەپێنراون، بەڵکو و بنیاتەکەی لەسەر عەقڵی مرۆڤ و هەستی راست و دروست بووە. لەبەرئەوە مرۆڤ، هەر مرۆڤێك توانای بیرکردنەوە و تێگەیشتنی هەیە نەك تەنیا کۆنەکان و کاهین و پاپا و تەنانەت ئەرەستۆیش.

بەم جۆرە دیکارت مرۆڤی ئەوروپایی لە پێش دادوەریی و زانستە پروپووچەکان کە چ بەڵگەیەکی لۆژیکیان لە دواوە نییە، ئازاد کرد.

### سەرچاوە

بیان الکتب 2004/5/17

## بەعەرەبکردن و بەڕۆژئاوایی کردن

عەلی حەرب

لە عەرەبییەوە: عەدالەت عەبدوڵڵا



ئەمە زەمەنی ڕۆژئاوایە بەڵکو زەمەنی، وەك دەڵێن، بە ئەمریکاییکردنە. باوابێ، یان ئەمە ئەوەیە کە ئێستا هەیە. زەمەنیش خۆی ڕۆژانێکە لە نێوان خەڵکدا دەستاودەستی پێ دەکرێت. زەمەن بە ڕۆیشتن و سوڕی خۆی، خەڵکانێك سەروەر دەکا و خەڵکانێکی تریش سەرشۆڕ، کۆمەڵێك بەرز دەکاتەوە و کۆمەڵێکی تریش دادەگرێ، نەتەوەیەك پێش دەخا و نەتەوەیەکی دی دەباتە دواوە.

ئێمەی عەرەبیش سەردەمێکمان لە زەمەن بەسەردا تێپەڕی کە تیایدا هەژموون و شکۆمەندیی خۆمان هەبووە، سەرکەوتبوویشین بەسەر تەواوی نەتەوەکاندا. دوای ڕووداوی قورئانی و هەربەهۆی قورئانەوە توانیمان جیهان بگرین و دەست بەسەر وولاَت و پادشاکانیدا بگرین، بەمەش زمان و وێژەو شەریعەتی خۆمان بەسەر ئەوانەدا سەپاند کە باوەڕیان بە بانگەوازەکەمان کرد و وەڵامی پەیامەکەیان دایەوە یان بەسەر ئەوانەی کە کەوتنە ژێر دەسەڵاتمان دوای ئەوەی بەسەریاندا سەرکەوتین. ئێمە فۆرمەکانی خۆمان بەسەر نەتەوە و میللەتگەلێکدا دابڕی کە هێشتا، تا هەنووکە، بە ناوەکانی ئێمە ناوی منداڵەکانیان دەنێن و بە زمان و ئایەتەکانی ئێمە

پەیڕەوی لە سرووت و بۆنە ئاینییەکانیان دەکەن. لەو ڕۆژگارەدا قەدەر وای بۆ نووسین هەموو شتێك بکەین بە عەرەبی بە بواری پیرۆزگەرایی و غەیبیشەوە، لەم ڕووەوە ئاسمانمان وا لێکرد بە زارێکی عەرەبیی ڕەوان بێتە قسە. گومانی تیا نییە کە ئەو زەمەنە زەمەنی موعجیزە و زۆر و زەوەندی بوو، مەبەستمە بڵێم زەمەنی هێز و پێشکەوتن بوو، زەمەنی داهێنان و پێشکەوتن بوو، زەمەنی ئاوەدانکردنەوەی زەوی و بڵاوبوونەوە بوو بە هەر چوارلای جیهاندا.

بەڵام هەموو شتێك ڕوویەکی تریشی هەیە: واتە ئایەتەکە پێچەوانە بووەوە و جادوویش بەسەر جادووبازدا هەڵگەڕایەوە. بەعەرەبکردنی جیهان لە سەرەتادا داهێنان و ئەفراندن بوو، دوای ئەوە بوو بە نەریتخوازی و دووبارەبوونەوە. ڕێگەی کرانەوەو ڕزگاری و دیمەنی ئامادەبوون و درەوشانەوە بوو، پاشان وای لێهاتبوو بە کەرەستەیەك بۆ داپلۆسین و داخران و دیمەنێك بۆ داکشان و داوەشین. بە کورتی بەعەرەبکردنی جیهان بەڵگەی هێز و پێگەیشتن و پێشکەوتن بوو، دواتر بوو بە بەڵگەی لاوازی و کەم و کورتی و بەرەو دواوەچوون. بەم شێوەیەش موعجیزە وەرچەرخا بۆ بێ توانایی، بەدەستهێنانی ماناو ئایدیاکانیش بوو بە مایەی چەقبەستنی فکر و وێرانبوونی مانا..

ئەمەش جێی سەرسامی نییە، مرۆڤ لە دەستپێکدا خۆی دروستکەر و بکەر بوو ئەوەندەی کە نائامادە بوو (غائب)ی بە گەواهیدەر (الشاهد) لێك دەدایەوە و کۆنی لە میانەی نوێدا دەخوێندەوە و خەیاڵ لێکراوی وەردەگۆڕا بۆ واقع.. عەقڵیش خۆی فەرمانڕەوا بوو نەك فەرمانپێکراو ئەوەندەی کە هەڵدەستا بە پێکهێنانی چەمکێکی نوێ بۆ خوا یان ئەوەندەی کە بەڕووی دەقدا هەڵدەگەڕا و دەیخستە ژێر ڕکێفی لۆژیك و ستراتیژی خۆیەوە. من ئەمە دەڵێم ناکۆك لەگەڵ ئەو باوەڕەی کە لە بارەی ئەو سەرەتایەوە هەمانە، ئەو سەرەتایەی کە بە بۆنەیەوە وەك ڕۆژ هەڵهاتین و تیشکمان دایە و بڵاوبووینەوە، چونکە لێکدانەوەی ئێمە بۆ ئەو سەرەتایە بەڵگەی ئەوەیە کە، بە زانینی ڕاست و ڕەوا، خۆمان نەناسین، بەڵگەی بێ ئاگاییشمانە لەو دروستکردنەی کە دروستمان کرد و ئەو دەسکەوتەی کە بەدیمان هێنا. بە قسەیەکی راشکاوانەتر: ئەو سەرەتایە مەزن بوو ئەوەندەی کە ئەو عەرەبە ئەعرابییەی کە هەمانبوو جیهانی خۆی دەخولقاند و مێژوو و شتەکانی خۆی دروستدەکرد (بەو پەیوەندییەشەوە کە لەگەڵ غەیبدا هەیبوو) ئەمەش بە داهێنانی نموونەیەکی کولتوریی ئەوتۆ کە کردەگی خۆی لە تێگەیشتن و لێکدانەوەدا و هەروەها دروستیی خۆی لە کارکردن و بەڕێوەبردندا، سەلماندبوو. هەر لەبەر ئەمە، دەرچوونی عەرەب لە گۆشەگیری و کەموکورتیی خۆیان و دەرکەوتنیان لەسەر شانۆی جیهانیدا، کردنەوەی سەردەمێکی نوێ بوو، مەبەستمان ئەوەیە دامەزراندنی نوێگەرییەکی نوێ بوو، نوێگەرییەك کە لە ئاخاوتندا دەرکەوت بە زمانێکی نوێ بۆ جیهان، هەروەها لە ڕەواخوازییەکی نوێدا کە فۆرمۆلەیەکی نوێیە بۆ مافەکانی مرۆڤ، لە ڕوانینێکی نوێش بۆ سەرهەڵدان و چارەنووس، بۆ هەق و بوون، بۆ تراندستاڵ و

کۆتادار (المتعالي و المتناهي) بۆ عەقڵ و جەستە، بۆ واقع و تکابۆکراو..

بەڵام هەڵبەت نموونەی کۆن ووزەی خۆی تەواو کرد. ئەو نموونەیە زەمەنێکە ئیلهامبەخشی بزووێنەر نییە یان مەرجەعی شیاو نییە یان پێوەری سەرکەوتن نییە. لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە تا ئێستا سەرکەوتوو نەبووین لە داهێنانی نموونەیەکی نوێ یان دامەزراندنی مەرجەعییەتێکی تازەدا. لەبەرئەوە، لەجیاتی ئەوەی موعجیزەی خۆمان بەدەست بهێنین و جیهانی خۆمان دروست بکەین، هێشتا هەر لە ئەفسانەکانی پێش خۆمانەوە شت وەردەگرین و پشت بەوە دەبەستین کە ڕابردووانمان دایانهێناوە و هێناویانەتە دی. سەرەڕای زۆر قسەکردنیشمان لەسەر نوێکردنەوە و ڕۆشنگەری یان لەسەر ئازادیخوازی و پەرەپێدان، کەچی لە کەم و کورتی عەقلیمانەوە بۆ فەزایەکی ڕۆشنگەرانە یان ڕۆشنایی بەخش نەهاتووینەتەدەرێ، واتە دەرنەچووین لە بازنە داخراوەکانی بنەڕەتخوازی و رزگاریشمان نەبووە لە دەسەڵاتی دەقەکان بە بەڵگەی ئەوەی ئێمە لەو شتەی کە بیری لێدەکەینەوە لەسەر کۆن تازە دەپێوین، یان گەواهیدەر بە نائامادەبوو (غائب) لێك دەدەینەوە، یا بێ توانایی بە تۆمەتبارکردنی خەڵکی تر پاساو دەدەین، یان ڕاستییەکان ڕەت دەکەینەوە بە وەرچەرخاندنیان بۆ خەیاڵ لێدان و وەهم کاریی. ئەمە مانای ئەوەیە ئێمە بیر ناکەینەوە لەوەی کە پێویستە بیری لێبکەینەوە، واتە بیرناکەینەوە لەوەی کە قەدەغەکراوە یان چەپێنراوە یان داپۆشراوە یان بێدەنگیی لێکراوە. بەڵکو هەندێکمان ئەوە لە بازنەی بیرکردنەوەی خۆیدا دوور دەخاتەوە کە لە بنەڕەتدا دوورخراوەتەوە، بەمەش پرۆسەی داپۆشین فراوانتر دەکات لە بارەی ئەو شتەی کە پێویستە بخرێتە بەر باس و ئاشکرا بکرێت.

لێرەوە پێویست وایە کە بەسەر خۆمان و بیرکردنەوەماندا هەڵبگەڕێینەوە، بۆ ئەوەی لە خەڵوەتگەی عەقیدەگەراییمان یان کەلەپوورخوازیمان یان بنەڕەتخوازیمان یان ناسیۆنالیستیمان بترازێین بە جۆرێك عاقڵی بکەین ئەو شتەی کە لە خۆماندا عاقڵیمان نەکردووە و، ئاشکرای بکەین ئەوەی کە لە بووناندا داپۆشراوە و، ناوبنێین لەوەی کە نابێ ناوی لێبنرێت، دەنا قسەکردن لەسەر شۆڕش یان پێشکەوتن یان ڕزگاری یان شوناس یان یەکبوون، قسەیەکی خورافییە یان گوزارشت کردنە لە دەمارگیریی یان گوتارێکە هیچی لە دەست نایە جگە لە داپۆشین یان کوێرکردن یان ساختەیی کردن.

پوختەی قسە ئەوەیە: بەعەرەبکردنی جیهان، کە هێشتا وێنە و نموونەکانی خەیاڵدانی مرۆڤی عەرەبیی ئاوەدان دەکاتەوە یان موتوربەی دەکات، ئەزموونێکی ڕۆشنگەرییانە و پەیڕەوکردنێکی عەقڵانییانە بوو و لە دۆزینەوە مەعریفییەکاندا بەدەرکەوتن. ئەو ئەزموونە بەدیهێنانی خود بوو لە ڕێگەی بەدیهێنانی هەق و ووردبوونەوە لە بوون یان شایستەییەکانی بوون.

هەرچی گوتاری عەرەبیی هاوچەرخە دەربارەی خود (الذات) و شوناس، ئەوە لە ووردبوونەوە و ئاشکراکردن و بەدی هێنان دوور ئەکەوێتەوە ئەوەندەی کە ئایدیۆلۆژیا هەژموونی بەسەردا دەکا یان لە

نەرژسییەت و خۆبەباشزانیندا دەیخنکێنێت..

### سەرچاوە

ئەم بابەتە یەکێکە لەو زنجیرە وتارانەی کە فەیلەسوفی لوبنانی (عەلی حەرب) لە کتێبی (اسئلة الحقیقة و رهانات الفکر)دا و لە لاپەڕەکانی 86 و 87 و 88دا نوسیوویەتی.

## هونەر بەر لەوەی دوو باڵ بدا بە مرۆڤ، زۆر جار هەر دوو لاقی دەشکێنێ

نامەی چارڵی چاپلین بۆ کچەکەی

لە فارسییەوە: ناسح شەریفیان



کچم جراڵدین:

لە تۆ دوورم بەڵام بۆ کاتێکیش وێنەی تۆ لە پێش چاوانم دوور ناکەوێتەوە. تۆ لە کوێی؟ لە پاریس لەسەر سەکۆی شانۆی بەشکۆی شانزەلیزە..؟ ئەوەی نازانم و بە چەشنێکە کە دەڵێی لەو بێدەنگی نیوە شەوەدا ئاهەنگی هەنگاوەکانت دەبیسم. بیستوومە دەوری ئەو کچە جوانەی حاکم دەبینیت کە دیلی خانی تاتارە. جراڵدین، لە دەورگێڕاندا ئەستێرەبەو بدرەوشێ بەڵام ئەگەر هاوار و چەپڵەڕێزانی بینەران و عەتری مەستی هێنەری ئەو گوڵانەی بۆیان ناردووی، دەرفەتی وشیاریان پێدای دانیشە و نامەکەم بخوێنەوە. من بابی تۆم. ئەورۆ نۆرەی تۆیە دەنگی چەپڵەڕێزانی بینەران جارجار بدباتە ئاسمانەکان. بۆ ئاسمانەکان بڕۆ بەڵام جار جارەش وەرەوە سەر زەوی و تەماشای ژیانی ئەوانە بکە کە بە زگی برسی، لە کاتێکا لاقەکانیان لە بێ ئەنوایی دەلەرزێ، هونەر دەنوێنن. من خۆم یەکێك لەوان بووم. جراڵدین کچم، تۆ ئەمن باش ناناسی. لە شەوانی زۆر دووردا، زۆرم قسە لەگەڵ تۆ کرد، بەڵام هیچ کات لە غەمەکانی خۆم نەدواوم. ئەویش چیرۆکێکی سەرنج راکێش و بیستنییە. چیرۆکی ئەو داوەڵە برسییە کە لە پەستترین شوێنەکانی لەندەن، گۆرانی دەڵێ و سەدەقە وەردەگرێ، چیرۆکی منە. من تامی برسێتیم چێشتووە، من ئێشی کەمایەسیم کێشاوە و لەوەیش زیاتر، ڕەنجی بچووك بوونەوەی ئەو داوەڵە گەریدەیە کە ئۆقیانووسێ لە غورور، لە دڵیدا شەپۆلان دەدا و قەرەپووڵی سەدەقەی ئەو ڕێبوارە غوروریشی ورد ناکا. بەو جۆرەش زیندووم و لە زیندووەکان بەر لەوەی بمرن نابێ قسە بکرێ. بە دوای نێوی تۆ نێوی منە "چاپلین" جراڵدین کچم دنیایەکی تۆی تێدا دەژی دنیای هونەر نوێنی و مۆسیقایە.

نیوە شەو، ئەو کات کە لە هۆڵی شکۆداری تەماشاخانەی شانزەلیزە دێیە دەرێ، تاریف کەرە دەوڵەمەندەکان لە بیر بەرەوە، لە ئەحواڵی ئەو شۆفیرە تاکسییەی کە تۆ دەگەیێنێتەوە ماڵێ بپرسە، لە ئەحواڵی ژنەکەشی پرسیار کە و ئەگەر دوو حاڵە و پووڵی بۆ کڕینی جل و بەرگی منداڵەکە نییە، هێندێك پووڵ بە دزیەوە لە گیرفانی خە! دەستوورم بە نوێنەری خۆم لە پاریس داوە تەنیا بابەتی ئەو جۆرە خەرجانە بێ چەند و چۆنێك پارەت پێبدا. بەڵام بۆ خەرجەکانی دیکەت دەبێ بیلان بنێری. کچم جراڵدین! وەخت و

بێ وەخت بە قەتاری ناو شار و ئۆتۆبووس لە ناو شار بگەڕێ! بێوەژنان و هەتیوان بناسە و ڕۆژێ جارێك بڵێ: من لەوانم. تۆ بە راستی یەکێك لەوانی، نە زیاتر. هونەر بەرلەوەی دووباڵ بدا بە مرۆڤ، زۆر جار هەردوو لاقی دەشکێنێ. کاتێ گەیشتێ ئەو پلەیە کە خۆت لە بینەرەکانت بە زیاتر بزانی، هەمان کات تەماشاخانە بەجێ بێڵە و بە تاکسی خۆت بگەیەنە گەڕەکەکانی خواروی پاریس. من ئەوێ باش دەناسم. لەوێ دەورگێڕانێ، وەك خۆت دەبینی کە لە سەدەکانی پێش تۆوە جوانتر لە تۆ دەور دەگێڕن، بەڵام لەوێ لە تیشکی تیژ و رووناکی تەماشاخانەی شانزەلیزە شوێنەوارێك نییە. کچم جرالّدین! چەکی سپی ئیمزا کراوم بۆ ناردووی هەرچەند پێت خۆش بێ لێی بنووسی و وەریگری و خەرجی کەی، بەڵام هەر کات ویستت دوو فرانك خەرج کەی بە خۆت بڵێ: سێهەمین فرانك هی من نییە. ئەوە ئی فەقیرێکی نەناسە کە ئەوشۆ پێویستی بە فرانکێکە. گەڕان و دۆزینەوەی ناوێ، ئەگەر بت هەوێ ئەو بێ سامانە نەناسانە لە هەموو جێیەك دەبینییەوە. ئەگەر لە پووڵ و دراو لەگەڵ تۆ دەدوێم، بۆ ئەوەیە لە هێزی فریودەر و جادووبازی پووڵ و دراو — ئەو رۆڵە بێگیانەی شەیتان — باش ئاگادارم.

من ماوەیەکی درێژ لە سیرك ژیاوم و هەمیشە و هەموو کات بۆ ئەو بەندبازانەی سەر تەنافی زۆر ناسك و پسۆك و لووس خوورپەم لە دڵدا بوو (بەڵام کچم راستێکەی بڵێم خەڵکی سەر زەوی پان و بەرین، زیاتر لە بەند بازەکانی سەر تەنافی ناسك و پسۆك و لووس دەکەونە خوارەوە).

کچم جرالّدین، باوکت لەگەڵ تۆ دەدوێ. رەنگە شەوێك بریقەی پڕ بایەخترین ئەڵماسی ئەو دونیایە تۆ فریودا، ئەو شەوە ئەو ئەڵماسە دەبێتە ئەو تەنافە ناسك و پسۆك و لووسەی ژێر پێی تۆ و کەوتنە خوارەوەی تۆ حەتمینەیە. رۆژێ کە جوانی روی کوڕە دەوڵەمەندێکی بێ ئەخلاق بتوانێ تۆ فریودا، ئەو رۆژەیە کە تەناف بازێکی ناشارەزا دەبی، هەموو کات تەناف بازانی ناشارەزا دەکەونە خوارەوە، هەر بۆیە گیرۆدەی زێڕ و زێو مەبە، گەورەترین ئەڵماسی ئەو دونیایە خۆرە، کە بەختەوەرانە لەسەر ئەستۆی هەموو کەس دەدرەوشێتەوە، بەڵام ئەگەر ڕۆژێك دڵت گیرۆدەی پیاوێکی روومەت تاوەسووت بوو، لەگەڵ ئەودا یەك دڵ بەو بەڕاستی خۆشت بوێ! یانی ئەوە بە ئەرکی سەرشانی خۆت لەو بابەتەدا بزانە. بە دایکتم ئەسپاردووە لەو بابەتەوە نامەیەك بۆ تۆ بنووسێ — ئەو لە من باشتر مانای ئەوین دەزانێ — ئەو بۆ تاریفی راستەقینەی ئەوین، کە مانای ئەو "یەك دڵ بوونە" لە من شیاوترە. کچم، هیچ کەس و هیچ شتێکی تر لەو دوونیایەدا نییە کە شیاوی ئەوە بێ کچێك نینۆکی لاقی خۆی بۆ رووت کا (رووتی نەخۆشی سەردەمی ئێمەیە) بە بڕوای من لەشی تۆ دەبێ هی کەسێك بێ کە ڕۆحی بۆ تۆ ڕووت کردۆتەوە. قسەی زۆرم بۆ تۆ پێیە بەڵام دەیخەمە کاتێکی تر و بەو دوایین پەیامەم، کۆتایی بە نامەکەم دێنم.

مرۆڤێ بە، دڵ پاك و یەك دڵ، چونکە برسی بوون، سووال کردن و بە فەقیری مردن، سەدان جار لە ژیانی بە پەستی و نامرۆڤایەتی پڕ بایەخترە.

## سەرچاوە

وەرزنامەی زانستی — کلتوری زەیتون.

## شیعری هاوچەرخی کوردی

بەرەنجامی چەند ئیستاتیکایەك

شەمسی لەنگەرودی
لە فارسییەوە: سەهەند

**( پەند )**

زۆر شت هەن، ژەنگ
هەڵدێنن و، بیرئەچنەوە و
دواییش ئەمرن
وەکوو تاج و
سەوڵەجان و
تەختی ژێر پێی پادشاکان!.
زۆر شتی تری دنیایش هەن
ناڕزێن و
بیرناچنەوە و
هەرگیز نامرن:
وەکوو شەپقە و،
پێڵاوەکەو،
گۆچانەکەی
"شارلی شاپڵن"!.

یەکەمین جار (لە ساڵی 1977 یا 1978 دا) کە وەرگێڕانی شیعرەکەی "چاپلن"م لە بڵاوکراوەیەکدا خوێندەوە ،بەڕادەیەك لە توانای شۆك و سادەیی وتازەیی و تەنزی کینایەئاساو هەستی مرۆیی‌و فڕینی خەیاڵی، دوچاری سەرسوڕمان بووم کە شتێك بوو لە گورزێکی ناگەهان دەچوو.

بەهیچ جۆرێك لەگەڵ پێوەرە ئیستاتیکییەکانی ئەو ڕۆژگارەو مندا وێکنەدەهاتەوە.ئەو ڕۆژگارە من سەرپێچیی وێنەیی و ئاڵۆزیی سادیستیانەم بە هاوتای یاخیبوون و مۆدێرنیزم دەزانیو، تەسەوورم نەدەکرد کە دەشکرێ ئاوەها بە جوانی و ڕاشکاوی‌و سادەو ڕاستەوخۆ (وەکو نووکی نەشتەرێك) بە ئاوڵەی جیهاندا ڕۆبچێت. شیعرەکە لام مایەوەو دواتریش بۆ چەند جارێکی دی ناوبەناو شیعرەکەم خوێندەوە. بەڵام نەك هەر لە بەهای چاپلنی کەم نەکردەوە لام، بەڵکو وردە وردە پەیم بەوە برد کە شیعر ئاڵۆزکردنی جیهان، ئاڵۆزکردنی بەڕواڵەت سادە (یا وەکو حافز دەڵێت سادەی فرەنەخش) نییە، بەڵکو بەهەستیکردنی سادەی جۆرێکە لە جیهان“ کە لە شیعری شاملو و فروغ و سوهرابدا و لە گۆشەنیگای جیاجیاوە ئەنجام دراوە.

پاشان کە "شێرکۆ بێکەس"ی شاعیری شیعری چاپلنم زیاتر ناسی بۆم دەرکەوت کە گەرچی هەموو شیعرەکانی (ئەوانەی بۆ فارسی تەرجەمە کراون)وەکو یەك قووڵ و جوان نین، بەڵام لەو شاعیرە گەورانەی کوردە کە پەنجەرەیەکی تازەیان بەڕووی شیعری جیهاندا کردۆتەوە. شێرکۆ بێکەس شاعیری کەشفکردنی چرکەساتەکانە، ئەو چرکەساتانەی کە ئەو خۆیشی عەفەوییانە لەدەستیان ئەدات.

بەدوای ناسینێکی قووڵترو باشتری شێرکۆدا دەچووم کە لەگەڵ ناوی ئەودا ناوی بەرزی لەتیف هەڵمەت و عەبدوڵڵا پەشێو و ڕەفیق سابیریشم ناسی.

لاپەڕەیەکی تری شیعری کوردی لەبەرچاومدا هەڵدرایەوە. کەواتە ئەمە یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی شیعری هاوچەرخی کورد کە سادەو مۆسیقائامێز و ئینسانییە. زەینێکی سادە ناتوانێت بنووسێت "ئێستا وا خەونی قوربانییەکان دێتە دی....." کە شێرکۆ بێکەس ئەتوانێت.ناتوانێ بنووسێت :" چ کەسێك وەکو شاعیر بەختەوەریی قەدەغە ئەفرۆشێت" کە لەتیف هەڵمەت دەتوانێت. هەروەها ناتوانێت تێڕوانینە تایبەتەکەی عەبدوڵڵا پەشێوی هەبێت سەبارەت بە "سەربازی ون"و بڵێت ئەگەر کەسێك هاتە وڵاتی من، پرسی کوانێ گۆڕی سەربازی ون؟ ئەڵێم

سەرتاپای خاکی کوردستان گۆڕی سەربازی ونە.

پێدەچێ شیعری هاوچەرخی کوردی زۆر لەژێر کاریگەریی شاعیرانی گەورەی عەرەبدا بووبێت.

شاعیرانێکی وەکو مەحمود دەروێش و محەمەد ماغوت و عەبدولوەهاب بەییاتی و سەمیح قاسم و .....

بەڵام دوای ئەوەی "گۆران" پشتی کردە شیعری ڕەسمیی عەروزی عەرەبی و ڕووی لە کێشی پەنجە کرد ، شیعری کوردی ڕەنگ و بۆی ژیان و کەلتووری کوردی بەخۆوە گرت و وای لێ هات کە لە شیعری عەرەبی جیابێتەوە.

عادەتەن شیعری ڕەسمی لە کتێبەوە سەرچاوە ئەگرێ. کانیاوی شیعری ڕەسمی دەسکەوتە ئیستاتیکییەکانی ناو کتێبە. وەلێ سەرچاوەی شیعری ناڕەسمی (شیعری خەڵک) ژیانی ڕۆژانە و ئیستاتیکاو حیکمەتی خەڵکە.

سەرچاوەی شیعری هاوچەرخی عەرەب شیعری خۆرئاوایە. شیعری هاوچەرخی عەرەبی بەرەنجامی شیعری ڕسمیی سوننەتیی عەرەب و شیعری خۆرئاوایە. شیعری هاوچەرخی کوردی بەرەنجامی شیعری هاوچەرخی عەرەب و ئیستاتیکای خەڵکە. شتێکی سروشتییشە کە پانتایی ژیان لە هی کتێب بەربڵاوترە.

بەڵام ئەم دوو لقەی شیعر بە ڕۆمانسیەتێك کۆتایی دێ کە دەرەنجامی ژیانی پرئازاری شاعیرەکانە. بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە شیعری کوردی بە حوکمی جۆری ژیانی خەڵکەکەی، لە سروشتەوە نزیکترەو سادەیی و ناسکیی زیاتر تێدایە. ڕۆمانسیەتێکی لەمجۆرەش لە شیعردا هەردەمێنێت مەگەر پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ژیانی خەڵك بگۆڕێت.

### سەرچاوە

لە ڕۆژنامەی (آشتی)ەوە، سال اول شمارە 2/ سەشنبە 26 اسفند 1382.

## کتێبی تازە
## مۆدێرنە

کرایب ئەیان

لە عەرەبییەوە: سەردەم

کرایب ئەیان، نووسەری ئەم کتێبە، پسپۆری مێژووی بیر و زانستی کۆمەڵناسیی نوێیە. لەم کتێبەدا نووسەر لە بابەتێکی زۆر گرنگ دەکۆڵێتەوە کە ماوەیەکی درێژە بیرمەندان و لێکۆڵەران پێوەی سەرقاڵن، ئەویش بابەتی مۆدێرنەیە. ئاشکرایە کە بیرۆکەی مۆدێرنە لە ڕۆژئاوادا لە سەدەی شانزەوە، واتە لە سەردەمی ڕێنیسانسەوە، لە ئارادا بووە و لە سەدەی حەڤدە لەسەر دەستی گالیلۆ و دیکارت بەردەوامی هەبووە. لە سەدەی هەژدەش بەهۆی فەیلەسووفەکانی ڕۆشنگەری، وەکو ڤۆلتێر و دیدرۆ و نووسەرە ئینسایکلوپیدییەکانەوە بەردەوام بووە. تازەگەریی فیکری و پیشەسازی و تەکنۆلۆجی بە درێژایی سەدەی نۆزدە و بیست بەردەوام بووە و لە ئاکامدا مۆدێرنە لە هەموو بوارەکاندا، لە فەلسەفە و بوارە کردەییەکان و تەکنۆلۆجیا و بوارە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان و تەنانەت هونەر و شیعریشدا سەرکەوتوو بووە. لە ئەنجامدا دنیای مۆدێرن بووەتە جێگری دنیای کۆن و سەدەکانی ناوەڕاست و کۆمەڵگایەکی پیشەسازی و تەکنۆلۆجی لەبری کۆمەڵگای

لادێی کشتوکاڵی دەرەبەگی دامەزرا و دەسەڵاتی فەلسەفە و ئەندازیاری و پزیشکی و زاناکانی دەروونزانی و دەرمانسازی جێگەی لاهووتی مەسیحی و دەسەڵاتی قەشەو کاهینەکانیان گرتەوە.

لەئەنجامدا دەوڵەتی یاسا و مافی مرۆڤ و یاسا نوێیەکان جێگەی دەوڵەتە ستەمکار و ڕێسا هەرەمەکییەکانی گرتەوە و عەقڵی زانستی زاڵبوو بەسەر ئەقڵی نادیاری لاهووتیدا کە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ لە سەدەکانی ناوەڕاستدا باڵادەست بوو.

کەواتە مۆدێرنە، لە پێناسەی گشتیدا، پشتبەستنە بە حوکمی ئەقڵ لە هەموو بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا، لە سیاسەت و ئابووری و کۆمەڵایەتی و تەنانەت ئاینیشدا، چونکە ئایین، لە سەردەمی مۆدێرنەدا، بووە بە ئەقڵانی و جیاوازە لەوەی کە بەدرێژایی سەدەکانی ناوەڕاست لە ئارادا بوو. کانت لە کتێبە ناسراوەکەیدا باس لەمە دەکات و ناوی دەنێت: ئایین لە سنووری ئەقڵدا.

بەم شێوەیە ئەقڵییەتی دەمارگیری و دادگاکانی پشکنین بە سەرکەوتنی مۆدێرنەی زانستی و فەلسەفی کۆتایی هات. کۆمەڵگا لەسەر بنەمایەکی ئەقڵانی دارێژراو رەفتاری مرۆڤی ئەوروپایی ڕۆژانە ئەم راستییە دەسەلمێنێت، بۆ نموونە مرۆڤی ئەوروپایی نۆرەبڕی ناکات ئەگەر لەبەردەم کۆگایەکی گشتیدا سەرەبگرێت، کاربەدەستانیش بەشێوەیەکی ئەقڵانی رەفتار دەکەن و بە چاوێکی یەکسان سەیری هاووڵاتیان دەکەن و ناهێڵن کاروباری خەڵکی دوابکەوێت، هەروەها کاری منداڵی بەرپرسەکان پێش کاری مەردومی ئاسایی ناخەن.

لە کۆمەڵگای مۆدێرنی پێشکەوتوودا خەڵك یەکسانن بەرامبەر یاسا و کارەکانیان بە بەرتیل و راسپاردن بەرێوە ناڕوات، وەکو زۆرجار لە جیهانی سێهەمدا روودەدات.

نووسەر بەردەوام دەبێت و دەڵێت: مۆدێرنە بە تەنها لە پاش داڕووخانی کۆمەڵگای کۆن، بە هەموو عورف و عادەتەکانییەوە، لە توانایدا هەبوو کە دابمەزرێت و بچەسپێت و کۆمەڵگایەکی نوێ دابمەزرێنێت، واتا پاش مردنی کۆمەڵگای کۆن و لەبەرچاوکەوتنی بەهاکانی.

## سەرچاوە

ڕۆژنامەی بیان الکتب 2004/5/17

## جان جاك ڕۆسۆ

جان جاك ڕۆسۆ/ پەیمانی کۆمەڵایەتی و گوتاری یەکەم و دووەم

نوسینی: سوزان دون

لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا

315 لاپەڕەی مام ناوەندی

لە بڵاوکراوەکانی زانکۆی ییل/ 2004




خانمە توێژەری ئەمریکی "سوزان دون" سەرپەرشتی دانانی ئەم کتێبەی کردووە کە

تێیدا باس لە یەکێك لە گرنگترین بیرمەندەکانی سەدەی مۆدێرنە دەکات کە "جان جاك ڕۆسۆ"یە، دانەر وێنەیەکی ورد لەسەر بیری ڕۆسۆ پێشکەش بە قوتابیانی خوێندنی بالاّ لە زانکۆکانی ئەمریکادا دەکات، ئاشکراشە ڕۆسۆ کاریگەرییەکی بەهێزی لەسەر شۆڕشی ئەمریکی و شۆڕشی فەرەنسی هەبووە.

دانەر بەشێوەیەکی سەرەکی جەخت لەسەر سێ کتێبی ڕۆسۆ دەکات کە بریتین لەمانە: گوتاری یەکەمی لەسەر زانست و هونەرەکان، گوتاری دووەمی لەسەر ئەسڵی زۆرداری و نایەکسانی لە نێوان مرۆڤەکاندا، پاشان کتێبی سێیەم کە تەواوکەری ئەوانە و لە هەموویان بەناوبانگترە: پەیوەندی کۆمەلاّیەتیە.

ئاشکرایە تیۆری جان جاك ڕۆسۆ لەسەر کۆمەڵگا و سیاسەت لەم سێ کتێبەوە گەلاّڵە بوون، بەلاّم تیۆری ڕۆسۆ دەربارەی پەروەردە ئەوا لە کتێبێکی دیکەدا گەلاّڵەبووە بەناوی "امیل".

لە گوتاری یەکەمدا ڕۆسۆ تەرکیز دەکاتە سەر مەسەلەی (فەزیلەت)یاخود دەستپاکی و کەسێتی ڕاست و دروست و بەگرنگترین سیفەتی مرۆڤی دادەنێ لە کۆمەڵگادا، مرۆڤی گەندەڵ هیچ بەرهەم ناهێنێت تەنها کۆمەڵگایەکی گەندەڵ نەبێ، پێچەوانەکەشی ڕاستە، کاتێ هاولاّتیان لە هەڵسوکەوتیاندا سەرڕاست و دەستپاك بن، ئەوا هەموو کۆمەڵگا دەستپاك و ڕاستگۆ دەبێ و کاروبارەکانی بە باشترین شێوە بەڕێوەدەچێ، ڕۆسۆ لەو بڕوایەدابوو کۆمەڵگاکەی گەندەڵ بووە و پەیوەندی دووڕوویی و درۆ و ڕیاکاریی و دووفاقی تێدا بلاّوبوەتەوە، لەبەر ئەو هۆیە ئەم گوتارەی نوسی تاکو ڕەخنەی لێبگرێ و ڕاستییەکان بخاتە بەرچاو.

لە واقیعدا ئەو کۆمەڵگایەی کە ئەم فەیلەسوف و نوسەرە گەورەیەی تێدا ژیاوە پاڵی بە مرۆڤەوە ناوە بەهەر شێوەیەك بووە دەوڵەمەند ببێت بەبێ لەبەرچاوگرتنی بنەماکانی سەرڕاستی یاخود فەزیلە ئاکارییەکان، ئەو کۆمەڵگایە ناچاری دەکردی ڕێگەی گەندەڵی و بەرتیل و فڕوفێڵ بگریتەبەر تاکو وەك هەموو خەڵك دەوڵەمەند ببێت. بەم شێوەیە بەهۆی گەندەڵی پەیوەندییە کۆمەلاّیەتییە باوەکانەوە سروشتی مرۆڤیش گەندەڵ بووە، مرۆڤ بووەتە کەسێکی دووفاق، شتێ دەڵێ و شتێکی دیکە جێبەجێ دەکات، چیتر نازانی ئەو کەسە کێیە کە لە بەردەمتدا ڕاوەستاوە: ئایا کەسێکی ڕاستگۆیە یاخود درۆزنە، ئایا ڕاستی دەڵێ یاخود دۆرت لەگەڵدا دەکات، هەر مرۆڤەی دەمامکێکی پۆشیوە تاکو خۆی بپارێزێت یاخود بەڕێگەی فڕوفێڵ و ساختەچییەتی و دوڕوویی بگاتە ئەوەی دەیەوێ و زمانێکی نادیار و تەمومژاوی بەکاردەهێنێت، زمانێك پێچەوانەی ئەوەی خەڵکی قسەی پێدەکەن.

هەر ئەمەش بوو ڕۆسۆی شێتگیر کرد و وایلێکرد لە پاریس ڕابکات و ڕووبکاتە سروشت و لادێکان، تاکو لە کەشوهەوای شارە گەورەکان و گەندەڵییەکەی دوورکەوێتەوە، ڕۆسۆ لەبەر ئەوەی نەیویست وەك زۆربەی ڕۆشنبیرانی سەردەمەکەی گەندەڵ بێت، بۆیە ئەوان بەدوایەوە بوون و دەیانچەوساندەوە و لە هەموو شوێنێکدا ژیانیان لێ تاڵ کردبوو.

پاشان ڕۆسۆ لەسەر وتنەکانی دەڕوات و دەڵێ: لەم کۆمەڵگا

گەندەڵ و گەندەڵ کەرەدا مرۆڤ بووەتە کەسێکی نامۆ لە خۆی و چیتر ناوێرێ وەك حەقیقەتی خۆی خۆی دەربخات و بووەتە کەسێکی فریودراو و دۆڕاو و ساختەچی، ئەم دژایەتیەش لەسەر سەروەری گەل و یەکسانی لە مافەکاندا لەنێوان هەموو هاولاتیەکاندا بەندە، سەروەری لە گەلەوە دێت و هەر بۆ ئەویش دەگەڕێتەوە، دەوڵەتیش پێویستە یاسایەك بەڕێوەی ببات بەسەر هەمواندا جێبەجێ بکرێت، دەوڵەمەند بێت یا هەژار، بەهێز بێت یاخود بێهێز، لەبەر ئەم هۆیەش بوو شۆڕشی فەرەنسی کاتێ دوای مردنی ڕۆسۆ بەرپابوو، ئەم کتێبەی ڕۆسۆیان(پەیمانی کۆمەڵایەتی) بەرز کردبۆوە بۆ بەرزترین ئاست، بەکاریانهێنا لە پێناو دروستکردنی دەستوری تازە و دواتر بەکاریانهێنا لەپێناوی نوسینی جاڕنامە بەناوبانگەکەی مافی مرۆڤ و هاولاتی.

لێرەوە بۆ ئەوەی لە نهێنی دروستبونی مۆدێرنەی فیکری و سیاسی کە دواتر لە ئەوروپادا پێکهات تێبگەین، پێویستە ئەم کتێبەی جان جاك ڕۆسۆ بخوێنینەوە، بێ هیچ گومانێك ڕۆسۆ باوکی ڕۆحی ڕژێمی دیموکراتی و مرۆڤانەی مۆدێرنەیە، هەروەها ئەو دوژمنی سەرسەختی ڕژێمی دەرەبەگایەتی و زۆرداری کۆمەڵایەتی و ستەمی سیاسیە.

## سەرچاوە

بیان الکتب/2004/3/28

# ڤۆڵتێر

ڤۆڵتێر

نوسینی: لویس جۆزێف

لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

92 لاپەڕەی مام ناوەندی

لە بڵاوکراوەکانی کیسنجر بوبلیشنگ کۆمبانی/ لەندەن نیۆیۆرك 2003

تویژەری ئەمریکی لویس جۆزێف لێرەدا نمایشێکی گشتی سەبارەت بە فەلسەفەی ڤۆڵتێر دەخاتەڕوو، ئاشکراشە ئەم بیرمەندە فەرەنسییە لە دنیادا دەنگی داوەتەوە و بە بیروڕا ڕۆشنگەریەکەی خەڵکی سەرقاڵ کردووە، بە درێژایی چل ساڵ لەگەڵ قەشە و پیاوانی ئاینی توندڕەودا لە جەنگدا بووە.

ڤۆڵتێر ساڵی 1694 لە پاریس لەدایك بووە و ساڵی 1778لە تەمەنی هەشتاوچوار ساڵیدا هەر لە پاریس کۆچی دوای دەکات، ساڵی 1734 دوای گەڕانەوەی لە لەندەن بە ماوەیەك کتێبە ناسراوەکەی بەناوی (نامە فەلسەفییەکان یاخود نامە ئینگلیزیەکان) بڵاودەکاتەوە کە تێیدا بە سەرسوڕمانێکی زۆرەوە سەبارەت بە نەریتی سیاسی ئینگلیز و یاسای ئەو وڵاتە پێشکەوتووە قسە دەکات، بەوەش دەیویست، گەر بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆش بێت، لەو دەمارگیریە دواکەوتووەی فەرمانڕەوایی فەرەنسا بدات.

ئەم نامانە ڕیسواییەکی گەورەیان لە ناوەندە ڕۆشنبیری و سیاسییەکانی پاریسدا نایەوە، دەسەڵاتداران فەرمانی سوتاندنی نامەکان و ڕاوەدونانی خاوەنەکەیان دەرکرد، ڤۆڵتێر بۆ

ئەوەی لە گرتوخانەی باستیل ڕزگاری بێت، بە نهێنی پاریسی بەجێهێشت و چووەلای یەکێك لە خانمە ئۆرستۆکراتیەکان کە سەرسام بوو بە فیکری ڤۆڵتێر، ئەویش گرتییە خۆی و پەناگایەکی ئارامی بۆدابین کرد، ڤۆڵتێر دە ساڵی ڕەبەق بە بەردەوامی لەو کۆشکەدا ژیا.

ڤۆڵتێر لەو ماوەیەدا خۆی تەرخانکرد بۆ توێژینەوە و گەڕان و قوڵبونەوە لە زانستی نیوتندا، بگرە هەندێ تاقیکردنەوەی فیزیایشی ئەنجامدا، دانەر دەڵێ فەلسەفە لای ڤۆڵتێر تێکەڵ بە ئەدەب بووە و بووەتە بەشێك لەو، لە واقیعیشدا ئەم نوسەرە گەورەیە تەنها لە بواری فەلسەفەدا داهێنانی ئەنجام نەداوە، بەڵکو لە بواری ئەدەب و ڕۆمان بەتایبەتی داهێنانی ئەنجامداوە.

ساڵی 1759 چیرۆکێکی فەلسەفی بەناونیشانی (کاندید)، واتە دڵساف، یاخود ساویلکە کە بەیەکێك لە شاکارە ئەدەبییەکانی دادەنرێ نوسی، لە ڕاستیدا ئەو گەنجەی ناوی "کاندید" بوو کەسێتیەکی ساویلکە بووە و "بانفلوس"ی مامۆستای هەرچییەکی پێ وتووە ئەو دەمودەست بڕوای پێکردووە، ئەم مامۆستایە تیۆرەیەکی ساکاری لەبارەی خۆشبینی لە ژیاندا پێ وتووە، پاش ئەوە کاندید بە چەند ئەزمونێکدا تێدەپەڕێ و، لە هەر هەمویاندا توشی نائومێدییەکی گەورە دەبێت، ئەودەم کاندید تێدەگات کە عەقیدەی مامۆستاکەی هەر هەمووی هەڵە بووە.

لە میانەی ئەم چیرۆکەوە ڤۆڵتێر ویستویەتی گاڵتە بە هەموو ئەو تێزە فەلسەفی یاخود میتافیزیکیانە بکات کە لەبەردەم ئەزمونەکاندا خۆیان ناگرن، جگە لەوە ڤۆڵتێر ویستویەتی لە میانەی ئەم چیرۆکەوە ڕەخنە لە دەمارگیری ئاینی بگرێ کە ئەودەم لە ئەوروپادا باوبووە، هەروەها ویستویەتی ڕەخنە لەو خورافات و شتە پوچانە بگرێ کە لە نێوەندی خەڵکانی نەخوێندەواردا باوبووە، لە واقیعدا چیرۆکی کاندید یاخود مرۆڤی سادەی ساویلکە، هیچ نییە جگە لە بەرگریکردن لە پراگماتییەتی ژیان، مۆرڤ وەك ئەوەی ڤۆڵتێر دەیڵێ، پێویستە پراگماتی، عەمەلی، نەرمونیان بێت تاکو بتوانێ بژی.

ساڵی 1763 کاتێ ڤۆڵتێر سەرگوزشتەی ئەو پیاوە پرۆتستانیە دەبیسێ کە لە شاری دۆلۆز و لەلایەن کاتۆلیکەکانەوە چەوسێنراوەتەوە، کتێبێك لەسەر لێکبووردن بڵاودەکاتەوە، زانراویشە ئەو پیاوە هەندێ تۆمەتی ساختە و ناڕەوایان بۆ هەڵبەستووە و پاشان دەستگیرکراوە و دوواجار لە ژێر ئازار و ئەشکەنجەدا دەمرێت، دواتر سەرگوزوشتەکەی بڵاودەبێتەوە تاکو دەگاتە گوێی ڤۆڵتێر.

ئیدی ڤۆڵتێر لە خەوارینەکان یاخود لە کاهینە توندڕەوەکان کەللەیی دەبێت و داوادەکات ئەو خەڵکانەی تاوانە قێزەونەکەیان ئەنجامداوە دادگایی بکرێن، لەوەشدا سەرکەوتو بوو کە توانی لە یادکردنەوەی ئەو پیاوەدا حەقی خۆی بۆ بگەڕێنێتەوە کە بە غەدر کوژرابوو، وەك قوربانی دادگای پشکنینی سەر بە کڵێسا و قوربانی دەمارگیری ئاینی مەزهەبی کوێرانە کە ئەودەم لە فەرەنسادا بڵاوبووەوە. ئاشکراشە کاتۆلیکە

ئوسوڵییەکان کوڕانی کەمینە پرۆتستانەکانیان دەچەوساندەوە کە بە جۆرێکی جیاواز لەوان لە بیروباوەڕی مەسیحی گەیشتبوون، شوێنەواری ئەم چیرۆکە ئازار بەخشە بوو وایکرد ڤۆڵتێر کتیبێك لەسەر لێکبوردن بنوسێ و تێیدا داوای لە فەرەنسییەکان کرد بە هەموو تایفە و مەزهەبەکانیانەوە دەمارگیر نەبن لە ئایندا و جیاوازی لە بیروڕا و مەزهەبدا پەسەند بکەن، چونکە ڕەحمەتی یەزدان گەورەیە و بەشی هەموان دەکات.

ساڵی دواتر، واتە ساڵی 1764، ڤۆڵتێر کتێبە بەناوبانگەکەی لەژێر ناونیشانی (فەرهەنگی فەلسەفی گیرفان) بڵاوکردەوە کە تێیدا سوکایەتی بە میتافیزیکا، دەمارگیری، لاهوتی کڵێسای کۆن و تایفەگەری دەکات، کە ئەودەم بە شێوەیەکی گشتی عەقڵی خەڵکەکەی کۆنترۆڵ کردبوو، هەروەها تێیدا پرنسیبە سیاسیە گەورەکانی سەبارەت بە یاساکان و چۆنیەتی ڕێکخستنی دەوڵەت و شێوەی حکومەت.. هتد خستبووە ڕوو.

بەکورتییەکەی ئەمە هەندێ لەو بیروڕایانەیە کە لە کتێبەکەدا هاتووە.

### سەرچاوە

بیان الکتب

## ڕۆمانە نەمرەکان، ناپاکی لە سایەی ساماندا

بییر و جان

لە عەرەبییەوە: ساکار ڕەووف

گیدی موباسان بە یەکێك لە پێشەنگەکانی چیرۆکی کورت لە جیهاندا دەژمێردرێ، ڕۆمانەکانی سەرەڕای کورتیان، بوونەتە سەرچاوەیەك بۆ نووسینی کلاسیکی.

بییر و جان چوارەمین ڕۆمانی موباسانە دوای (ژیانی هاوڕێ دلۆڤانەکە، مون ئوریول) کە لە چیرۆکێکی کورت دەچێت و لە هاوینی ساڵی 1879 دا نووسراوە. ڕۆمانەکە لە گۆڤاری (گۆڤاری نوێ)دا بەیەکجار بڵاوبووەتەوە. لە پاشدا وەك ڕۆمانێکی سەربەخۆ لە خانەی بڵاوکردنەوەی ئولندروف بڵاوبۆوە. ئەم ڕۆمانە مۆرکێکی سایکۆلۆژی پێوە دیارە و هەستێکی وا دەداتە خوێنەر کە چیرۆکێکی سادەیە و لەبارەی دوو برا (بییر و جان)ی دکتۆر و پارێزەر ئەدوێ.

گیدی موباسان لە پێنجی ئەگستۆسی ساڵی 1850 لە شاری دییبی باکوری فەرەنسا لەدایك بووە. دایك و باوکی لە ساڵی 1836دا لە یەکتر جیادەبنەوە، هەر بۆیە ژیانێکی پەشێو و ئاڵۆز بەسەردەبا و لەو قوتابخانەی دێرەی تیایدا دەخوێنێت دەردەکرێت، ئەویش بەهۆی نووسینی شتی ناجۆر لەسەر مامۆستاکانی. لە دواییدا بۆ خوێندنی مافناسیی بەرەو پاریس دەچێت و دوای ئەویش لە ساڵی 1870دا ئەچێتە ریزی سوپاوە و تێکەڵ بەو سەربازانە دەبێت کە پەرۆشی جەنگن لە دژی روسیا. لە پاشدا وەك فەرمانبەرێك لە بەڕێوەبردنی وڵاتە کۆلۆنیاکراوەکاندا دەست بەکار دەکات. ئەو ژیانە دەبێتە

ئیلهامبەخشێك بۆ نووسینی کۆمەڵە چیرۆکێك بە ناوی (رۆژانی یەك شەممەی بورژوایەك لە پاریس) و نووسینی کۆمەڵە شانۆگەریەك کە بەناوبانگترینیان (ناپاکی کۆنتە رون، لەسەر پەڕەی گوڵ، ماڵی تورکی)یە، لە ماوەی مانەوەیدا لە پاریس فلوبیر و گونکورو زولا دەناسێت.

لە کۆتایی ساڵی 1879دا واز لە کارکردن لە بەڕێوەبردنی کۆلۆنیاکان دەهێنێ تا لە وەزارەتی پەروەردە کاربکات کە بەهۆی بێزاری و رۆتین ئەم کارە جێدەهێڵێ. ژیانی لە نێوان ساڵەکانی (1880–1890) بووە دەنگدانەوەی بەرهەمەکانی کە گەیشتە شەش رۆمان و شانزە بەرگی چیرۆك و سێ کتێب لەسەر گەشت و کۆمەڵێك وتاری تر. لە کۆتایی ساڵی 1890دا تووشی نەخۆشیەك دەبێ کە دەبێتە هۆی زمان گیری، ئەمە سەرباری گەورەبوونی پەردەی چاو و تووشبوونی بە خەڵەفانێکی بە ئازار. لە 6ی یولیوی ساڵی 1893دا کۆچی دوایی دەکات و لە گۆڕستانی مونبارناس لە پاریس دەنێژرێ ئەمە لە کاتێکدا نمایشی شانۆگەری (خۆشەویستی خێزانی) کە دوا بەرهەمی نووسەرە دەستی پێکردبوو.

رۆمانی (بییر و جان) چیرۆکی دووبرایە کە (بییر و جان)ەو کوڕی رولانی زەرەنگەری دەوڵەمەندن کە لە باکوری فەرەنسا دەژی. بییر زانستی پزیشکی خوێندووە و پسپۆڕە تێیدا، برا بچووکەکەشی بەشی پارێزەری تەواو کردووە. ئەم خێزانە بەختەوەربوون، پێکهاتبوو لە رولان و ژنەکەی و هەردوو کوڕەکەیان (بییر و جان) کە زۆر جار گەشتی دەریاییان دەکرد بە هاوڕێیەتی روزمیلی بێوەژن کە ئافرەتێکی قەشەنگ و گەنج بوو، وا دەرئەکەوت ببووە جێی سەرنج و بایەخی ئەو دوو لاوە خولیادارە بۆچوونە ناو ژیانێکی کردەیی سەرکەوتوو پاش دەرچوونیان لە زانکۆ. بییر و جان تازە لە زانکۆ دەرچووبون و هەریەکەیان بەدوای شوێنێکدا دەگەڕا بۆ کردنەوەی کلینیکی پزیشکی یان نووسینگەیەك بۆ راوێژکاری یاسایی. رووداوی رۆمانەکە لەوێدا بەرەو لووتکە دەچێت کە دادنووس هەواڵی مەرگی لیون مارشالی هاورێی نزیکی رولان لە پاریس بەخێزانەکە رادەگەیەنێ، کە لە وەسیەتنامەکەیدا هەموو سەروەت و سامانی خۆی دەبەخشێتە جان رولانی کوڕ.

خێزانەکە هەست بە خۆشیەکی گەورە دەکەن بۆ ئەو سامانە گەورەیەی بۆ کوڕەکەیان جێماوە، باوکەکە پاساوی ئەمە بۆ ئەو خۆشەویستیە گەورەیەی هاوڕێکەی بۆ جانی کوڕی ئەهێنایەوە، لە کاتێکدا فرمێسك لە چاوەکانی خاتوو رولان قەتیس مابوو، سەرسوڕمانیش بەسەر دەموچاوی بییرەوە دیاربوو، خۆشیەکی بێپایانیش رووی باوکەکەی داگیر ئەکرد.

رووداوەکان زۆر بەخێرایی تێدەپەڕن، جان بەدوای شوێنێکدا دەگەڕا بۆ کردنەوەی نووسینگەیەکی یاسایی لە کاتێکدا برا گەورەکەی بیری لە کردنەوەی کلینکێك دەکردەوە بەڵام پارەی تەواوی نەبوو بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە. هەر بۆیە پیلانەکەی خۆی بۆ کردنەوەی چارەسەرگەکە و قەرزکردنی بڕێك پارە لە برا دەوڵەمەندەکەی، لەلای ژنە گارسۆنێك لە قاوەخانەیەکدا باس دەکات.

بەڵام بەدگومانی ژنەکە سەبارەت بەم میراتیە چاوی بییر بۆ ئەو راستییە دەکاتەوە کە بۆچی لیون مارشال ئەم سامانەی بۆ جان ی برای جێهێشتووە نەك

ئەم، هەرچەندە ئەم بەتەمەن گەورەترە و هەر لە منداڵییەوە دەیناسێ.

ئەمە بیری بۆلای خاتوو رولانی دایکی و لیون مارشالی هاوڕێی خانەوادەکە دەباتەوە تا بۆی ئاشکرا دەبێت کە دایکە چاك و بەخشندەکەی تەسلیم بە دەستبازیەکانی ئەو هاوڕێیە بووە و لە ئاکامدا منداڵێکی موزەردی لێکەوتۆتەوە کە هەمان شێوەی لیون مارشالی هەیە. لێرەوە گەشتی پڕ ئازاری بییر دەست پێدەکات لە دۆزینەوەی هەموو وردەکارییەکان و درکاندنی ئەم نهێنیە لە ساتێکی هەڵچووندا بۆ برا بچووکەکەی. لە سەرەتادا جان هەموو جۆرە شیکردنەوەیەك رەت دەکاتەوە بەڵام بە رووبەڕووبونەوە لەگەڵ دایکیدا، کەچیتر بەرگەی روانینە سوتێنەر و پڕ تاوانبارکردنەکەی کوڕە گەورەکەی ناگرێ، دایکەکە بە ناچاری لای جان دان بەوەدا دەنێت کە لیون مارشال باوکیەتی.

هەموو ئەمانە بەبێ ئاگاداری رولانی زەرەنگەر رووئەدا، لەکەش و هەوایەکی خێزانی ئاڵۆزدا بە ئیرەیی پێبردنی بییر بۆ جان کە لە پڕێکدا دەوڵەمەند ئەبێت، لێکئەدرێتەوە.

بییر کە چیتر بە یەکێك لە ئەندامانی خێزانە خەڵەتاوەکە دانانرێت، بڕیار ئەدات وەك پزیشکێك لەسەر یەکێك لەو پاپۆڕانەی بەرەو وڵاتە یەکگرتووەکان ئەچێت لە چەند گەشتێکدا کە هەموو ساڵەکە دەخایەنێت، کاربکات. کە دایکەکە توانای هاوسەنگی نامێنێت جگە لە ڕشتنی فرمێسکی پەشیمانی و شەرم لەسەر ئەو کارەی کە کردوویەتی و خۆدزینەوە لە ڕووبەڕوبوونەوە لەگەڵ بییری کوڕی، هەر بۆیە ملکەچی حەزەکەی ئەو دەبێت بۆ کۆچ کردن وەك چارەسەرێکی نهێنی بۆ ئەو کارەساتەی کە نابێت رولانی باوك لێی بەئاگابێت، چونکە لە خێزانەکەدا ئەو تەنها کەسە درکی بە راستیەکە نەکردبێت.

لەو کابینەیەدا کە دکتۆر لە پاپۆڕەکەدا گرتوویەتی، پرۆسەی ماڵئاوایی لە نێوان جان و بییر، هەروەها بییر و دایکی بەشێوەیەکی ناخۆش و بەپەلە بەڕێوە دەچێ، لە کاتێکدا بەشێوەیەکی خۆش و پڕ لە هەراو زەنا دەبێت لە نێوان رولان و کوڕە گەورەکەیدا.

بەم شێوەیە رووداوی ناو رۆمانەکە بە دەرچوونی کوڕە گەورەکە لە ژیانی خێزانەکە و مانەوەی دایکە ناپاك و کوڕە زۆڵەکەو مێردە خەڵەتاوەکە، کۆتایی پێدێت. بەمەش موباسان دەیەوێ بڵێ کە راستیەکان هەمیشە قوربانین و زەقترین نموونەشی هەڵاتنی بییرە کە نوێنەری چاکەیەو مانەوەی (دایکی و براکەی)یەتی کە نوێنەری خراپەن، لە باوەشی رولاندا وەك خێزانێکی بەختەوەر و کۆك بگرە دەوڵەمەندیش!

موباسان هەر لە سەرەتای رۆمانەکەدا بیرۆکەی خۆی روون دەکاتەوە کاتێك رولانی باوك بە بەلەمەکەی هەموو کەسەکانی خۆی (ژنەکەی و دوو کوڕەکەی و بێوەژنە گەنجەکە کە روزمیلی)ە دەبات بۆ گەشتێکی راوکردن "ئەو چاوی لە ئاوەکە بڕیوە" و جارناجارێك تێدەکۆشی بۆ بەرزکردنەوەی (دەزووی قولاپەکە کە لە قوڵایی دەریاکەدابوو) لە راستیدا تەواوی کتێبەکە دۆزەکردنی روکەشە بۆ هەموو ئەو شتانەی لە ناخی دایکەکەدا رووئەدات. لێرەدا راوکردن بە مانای ئاوڕدانەوەیە لە گوناهێکی دایکانە کە دەبێتە هۆی وروژاندنی "ئەو ئیرەییە پەنگخواردووەی بە نەبینراوی پەرەدەسێنێ لە نێوان هەردوو

براکەدا "بیر و جان کە دوو کەسایەتی سەرەکی ناو ڕۆمانەکەن یەکتریان خۆش دەوێت، وەلێ بەیەك ناگەن، بیر ئیرەیی بە براکەی دەبا کە پێنج ساڵ لە خۆی بچووکترە بێئەوەی بزانێ هۆی ئەمە چییە.

دوو ژنەکە لە دەریاکەدا چێژ لە گەشتەکەیان دەبینن، ئەو خۆشیەی هیچ هەستێك بە گوناه تێکی نادات، بەڵام روزمیلی لە وەڵامێکدا بۆ هاواری خاتوو رولان کە دەڵێ "خودایە! ئەم دەریایە چەند جوانە" دەڵێ "بەڵێ بەڵام هەندێ جار دەبێتە هۆی ئازار" لێرەدا دەستبەجێ دەرخستنی دووفاقی دەریایە — چاکە و خراپە.

بەهەرحاڵ گەشتکردن بە بەلەم تیشك خستنە سەر لاسەنگی شتێکە! دوو ژنەکە بە هاوڕێیەتی سێ پیاو، پیاوێکی زیادە، پیاوێك کە پێویستە —ئەگەر بوترێت— فڕێ بدرێتە دەریاکەوە، گومانیش لەوەدانیە کە دەبێت ئەو پیاوە بیر بێت، هەروایش بوو.

## سەرچاوە

بیان الکتب – 8ی سێبتەمبەر – ژمارە 279 – 2003.